# جواهر سنن النسائي

بەكوردی



ئامادەكردنی
سیروان كاكە أحمد

وەرگێرانی
ستافی بیت

  




پڕۆژەی پیت

بۆ وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە

# جواهر سنن النسائي

## بەکوردی

ئامادەکردنی: سیروان کاکە أحمد

وەرگێڕانی: ستافی پیت

هەڵەچن و ڕێنووس: بڕیار هێرۆیی

دیزاینی ناوەوە: بڕیار هێرۆیی

دیزاینی بەرگ: إخلاص دیزاین

چاپی یەکەم: ١٤٤٥ك - ٢٠٢٤ز

٤١٣ لاپەڕە

٢٤ × ١٧ سم

بابەت: ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی (٢٩٦)ی ساڵی (٢٠٢٤)ی پێ دراوە








جواهر كتب الستة بەكوردی ٣

# جواهر سنن النسائي

## بەكوردی






ئامادەکردنی
**سیروان کاکە أحمد**

وەرگێڕانی
**ستافی پیت**


پێشکەش بێت
بەهەرکەسێك
هەوڵدەدات هاوەڵی
پێغەمبەر ﷺ بێت
لەبەهەشت




# سیفەتەکانی و شکۆ و گەورەیی ﷺ

ئەگەر هەر یەکێک لە ئێمە بەهۆی سیفەتێک یاخود دوو سیفەت و ڕەوشتی جوان ڕێز و پێگەیەک لە دڵی خەڵک پەیدا بکات، ئەو یەک دوو سیفەتە ڕێزداری بکات، ئایا بۆچوونت چۆن دەبێت بەرانبەر ڕێز و پێگە و گەورەیی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە هەرچی سیفەتی شکۆ و مەزنی و گەورەیی هەیە، لە زاتی ئەودا کۆ بۆتەوە، وەک:



پلەوپایەی پەیام و پەیامبەری، خوللەت و مەحەببەت، پاڵفتەیی، شەوڕۆیی، مەقامی قورب، شەفاعەت، وەسیلە و فەزیلە، مەقامی مەحموود، بوڕاق، بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان، ڕەوانەکرانی بۆ تەواوی مرۆڤایەتی، بەرنوێژیکردنی بۆ پێغەمبەران، شایەتی بۆ درانی لەلایەن پێغەمبەران و ئوممەتانیان، گەورەی هەموو وەچەی ئادەم، هەڵگری ئاڵای حەمد، ڕەوانەکرانی بەڕەحمەت بۆ هەموو جیهانییان، ڕازیکرانی لە قیامەت لەلایەن خواوە، حەوزی کەوسەر، نیعمەت و بەخشش بۆ تەواوکرانی[١]، چاوپۆشی لێکران و لێخۆشبوونی لەوەی پێشتر کردوویەتی و ئەوەیشی لە داهاتوودا دەیکات[٢]، سینە فراوانکرانی[٣]، ناو بەرزکرانەوە و شۆرەت پەیداکرانی، پشتیوانی لێکرانی بە فریشتەکان، حیکمەت و شەریعەت و فاتیحە و قورئان پێدرانی، صەڵاوات لەسەر درانی لەلایەن خوا و فریشتەکان، سوێندخواردن بە تەمەنی موبارەکی،

١- ئاماژەیە بۆ ئایەتی: {وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ} یوسف: ٦.

٢- ئاماژەیە بۆ ئایەتی: {لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ} الفتح: ٢.

٣- ئاماژەیە بۆ سوورەتی (إنشراح).

وەڵامدرانەوەی داواکانی، قسەکردنی لەگەڵ بێگیان و گیانداران، هەڵقوڵینی ئاو لە نێوان کەلێنی پەنجەکانی، مانگ بۆ شەق کرانی، سەرخرانی بەترس خرانە نێو دڵی دوژمنانی، سێبەر بۆ کرانی لەلایەن هەورەکانەوە، تەسبیحاتکردنی چەو و وردەبەرد لەنێو لەپی دەستە موبارەکەکانی، پاراستنی لە زیانپێگەیاندنی لەلایەن خەڵکەوە ... شکۆ و مەزنی و گەورەییەکەی لە ئاستێکە هیچ کەسێک ناتوانێت وەک ئەوەی شایستەیە ئاماژەیان پێ بکا و یەک لەدوای یەک باسیان بکات. بەدەر لەو خوایە تاکوو تەنهایەی پێی بەخشیوە و فەزڵی لەگەڵ کردووە، هیچ مرۆڤێک ناتوانێت پەی بە خەسڵەتە مەزنەکانی ببات و بەئاسانی درکیان بکات.





# چەند ڕێنماییەکی پێویست بۆ خوێنەری خۆشەویست

خوێنەری بەڕێز:

١. کاتێك فەرموودەکانی نێو ئەم پەرتووکە دەخوێنیتەوە بەخێرایی بەسەریدا گوزەر مەکە و بچیە سەر خوێندنەوەی فەرموودەیەکی دیکە، وە بیر لە مانای فەرموودەکان بکەوە و لە کاتی تێنەگەیشتن یان ناڕوونییەك بگەڕێوە بۆ سەرچاوەکانی ڕوونکردنەوەی فەرموودە، چونکە فەرموودە هەیە مانای ناڕوونە لە شوێنی دیکە ڕوون کراوەتەوە، فەرموودە هەیە بەکورت و پوختی هاتووە لە شوێنێکی دیکە تەفصیلی پێ دراوە، کە ئەم کتێبەت خوێندەوە بەجوانی لەو قسانە تێدەگەیت.

٢. پاشان بزانە فەرموودەکان بەزۆری وەك شیفا و چارەسەر وان بۆ نەخۆش یان بۆ هەر کەسێك پێویستی بەو دەرمان و چارەسەرانە هەیە، بێگومان چارەسەریش دەبێت کەسێکی پسپۆڕ لەو بوارەدا بۆ کەسی پێویست دیاری بکات، ئەگەرنا بەکارهێنانی فەرموودەکان بەبێ ئاگاداربوون لە زانستە شەرعییەکان، یان بەبێ پرس و ڕاوبۆچوونی کەسانی شارەزا، لەوانەیە خاوەنەکەی تووشی هەڵە بکات و سەرەنجام تووشی پەشیمانی ببێتەوە لە هەندێك کردار و گوفتار کە ئەنجامی داون بەهۆی هەڵە تێگەیشتن لە فەرموودەکان.

٣. تکایە بە هیچ جۆرێك فەتوا و بۆچوونی خۆت لەسەر ڕواڵەتی فەرموودەکان دەرمەبڕە، چونکە دڵنیات دەکەینەوە، بەبێ هەبوونی بنچینەکی تۆکمە لە زانستی شەرعی و گەڕانەوە بۆ زانایانی فەرموودە تووشی هەڵەی گەورە دەبیت.

لەگەڵ ڕێزدا

ستافی پیت

# پێشەکی

بێگومان سوننەت وەك سەرچاوەی دووەمی شەریعەتی ئیسلام زۆر جێگای بایەخ و گرینگیپێدانی موسوڵمانە، گەیشتن بە سەرچاوەکانی سوننەتیش کە لە سەرچاوە سەرەکییەکانی کتێبەکانی فەرموودە بەرجەستەیە، کارێکی ئاسان نییە، لە سۆنگەی هەستکردن بە بەرپرسیارییەتی و گرتنبەری ڕێگایەکی ئاسان بۆئەوەی موسوڵمانان لە هەر شوێنێکی دونیا بتوانن بەسانایی دەستیان بگات بە فەرموودەکانی خۆشەویستمان ﷺ و سوودی لێ وەربگرن و لە ژیانی ڕۆژانەیان کاری پێ بکەن، هەڵسام بە خوێندنەوە و کورتکردنەوەی هەر شەش کتێبی شەش زانا ناودارەکانی فەرموودە، بەڕێزان و پێشەوایانمان:

پێشەوا بوخاری و پێشەوا موسلیم و پێشەوا ئەبو داود و پێشەوا تیرمیزی و پێشەوا نەسائی و پێشەوا ئیبن ماجە (ڕەحمەتی خوای میهرەبانیان لەسەر بێت).

لەسەرخۆم کردە مەرج جگە لە فەرموودەی (صحیح) نەهێنم و تەنانەت خۆم پاراست لە فەرموودەی (حسن)یش، کە بێگومان لەلای زانایان کاری پێ دەکرێت (مقبولە)، بەڵام خۆپاراستنم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە نەکەومە نێو کێشە و ڕاجیایی زانایان لەسەر حوکمی زانایانی فەرموودەناس بۆ پلەی فەرموودەکە.

پاشان ناوم لێ نا (جواهر)، واتە: گەوهەرەکان، بۆ ئەوەی بواری ڕەخنە کەمتر بێتەوە لە بەندە و لە کارەکەی، ئێمە بانگەشەی ئەوە ناکەین خوێندنەوەی هەر یەکێك لەو کتێبانە جێگرەوەی کتێبە بنەڕەتییەکە بێت، بەڵام دەتوانین بڵێین زۆرترین فەرموودەی (صحیح)ـی ناو ئەو کتێبانە دەرهێنراون بە شێوەیەك ئاسان بێت بۆ خوێندنەوە و لەبەرکردن و ئاسانکردنی دەستاودەست پێکردنی کتێبەکان لەنێو خەڵکدا.

ئەوەی توانراوە هەوڵ دراوە و کراوە، ئەوەی نەکراوە داواکارم بە پشتیوانی خوا لە چاپەکانی داهاتوو بە پێشنیاری دڵسۆزانەی موسوڵمانان بتوانین پڕۆژەکە باشتر و جوانتر بکەین و بەرەو پێشتری ببەین، کارێك بکەین شایستە بێت بە بێژە و پیت و وشە و ڕستانێك کە تێکهەڵکێشی هەناسەکانی ئەم زاتە پاکە موبارەکەن ﷺ.

لە کۆتاییدا دەمەوێت لە ناخی دڵمەوە سوپاس و پێزانینی خۆم ئاڕاستەی ستافی پڕۆژەی (پیت) بکەم بۆ ئەو هەوڵ و کۆششە بەردەوامەیان لە خزمەتکردن و سەرخستنی ئەم پڕۆژە موبارەکە و لە ناخەوە سوپاسی ئەو (محسن) و چاکەکار و سەربازە ونانەش دەکەم هاوکارمان بوون بۆ بەچاپگەیاندنی ئەم کتێبە ناوازانە و خوا بەباشترین شێوە پاداشتی هەمووومان بداتەوە و هەر خۆی وەرگری کردەوە چاکەکانە و پاداشتیش دەداتەوە، چونکە دڵنیاین کردەوەی باشی چاکەکاران زایە ناکات.

سیروان کاکە أحمد

هەولێر

٢٠٢٤\٢\٢ ز

## بەرنامەی کارکردنمان لەم پڕۆژەیە:

١. بۆ دەرهێنانی دەقی فەرموودەکان و ناونیشانەکان پشتمان بەستووە بە باشترین ئەو چاپ و نوسخانەی لەبەر دەست بوون.

٢. لە هەر شەش کتێب دەستکاری (کتاب) نەکراوە نە بە دەستکاریکردن و نە بە لابردن (حذف)، هەر پێشەوایەك لە نووسراوەکەی چەند (کتاب)ی وەك عینوان هێناوە دامانناوەتەوە وەك خۆی.

٣. سەرجەم فەرمووده (ضعیف) و (حسن)ەکانمان لابردوون، سەرباری لابردنی کۆی فەرموودە دووبارەکانی نێو کتێبەکان.

٤. هەر فەرموودەیەك (سبب ورود)ی لەگەڵ بووبێت هێناومانە، ئەمەش لەپێناو باشتر تێگەیشتن لە فەرموودەکە و زووتر گەیشتن بە مەبەستی گوترانەکەی یان ئەنجامدرانەکەی، جا فەرموودەکە (مرسل) بووبێت، یان (موقوف) بووبێت، یان (مرفوع).

٥. بۆ وەرگێڕانی کوردییەکە سوودمان بینیوە لە کۆی کتێبەکانی پڕۆژەی پیت، بەڵام بەهۆی دەستکاریکردنی زۆری وەرگێڕانەکەوە نەمانتوانی ناوی هیچ وەرگێڕێك بنووسین، بۆیە لێرەوە زۆر سوپاس و پێزانینیان ئاڕاستە دەکەین و ئەوانیش خاوەنی ئەم پاداشتە نەبڕاوەن (إن شاء الله).

٦. لە دەقی عەرەبیدا هەر فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ بە ڕەنگی سوور نووسراوە و خراوەتە نێو دوو جووت کەوانەی بچووکەوە - « » -، بەهەمان شێوە لە واتا کوردییەکەشیدا خراوەتە نێو دوو جووت کەوانەوە و هەر بە ڕەنگی ڕەش نووسراوە.

٧. لەنێو وەرگێڕانە کوردییەکەدا لە هەر شوێنێك پێویست بە ڕوونکردنەوەی کورتی وەرگێڕ بووبێت، لەنێو دوو کەوانەی - ( ) - ڕەشدا ڕوونکردنەوە و شەرح نووسراوە.

٨. لە هەندێك شوێن ڕوونکردنەوەی زیاتر پێویست بووە نووسراوە (تێبینی:) و لە خوارەوە ڕوونکردنەوەکەی نووسراوە.



# پوختەی ژیانی ئیمام نەسائی ﵀

**ناسنامە:**

ئیمام نەسائی ﵀، ئەو زاتە مەزنەیە کە خۆرە بێهاوتاکەی سەردەمی خۆی بووە، لە سەدەی خۆیدا یەکێک بووە لە بەرزترین شاخ و فراوانترین دەریای زانستی فەرموودە، هەر چەندە ناتوانین لەم مەقامەدا هەقی تەواوی ئەم کەڵەپیاوە ناوازەی سوارچاکی بواری فەرموودەناسی بدەین، چونکە بۆ ئەم بابەتە پێویستمان بە نووسینی پەرتووکێکی تایبەتە لەو بارەوە، بەڵام لێرەدا مشتێک لە گەوهەری ئۆقیانووسەکەی دەخەینە بەر دیدەی خوێنەرانی خۆشەویست، بە هیوای ئەوەی بتوانین نزیک ببینەوە لە ناسینی ئەم کەسایەتی و خزمەتکارە دڵسۆزەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ.

ناوی ئەو پیاوە گەورەیە ئەحمەدی کوڕی شوعەیبی کوڕی عەلی کوڕی سینانی کوڕی بەحری کوڕی دینارە.

لە ساڵی (٢١٥ هـ) بەرانبەر بە (٨٢٨ م) لە شاری نەسا لەدایک بووە، کە لە کۆندا شارێک بووە لە خوڕاسان، بەڵام لە ئێستادا دەکەوێتە وڵاتی تورکمانستان.

**هەوڵ و گەڕانی بەدوای زانستدا:**

ئیمام نەسائی ﵀ زۆر شەیدا و عەوداڵی زانست بووە، هەر لە تەمەنێکی زۆر بچووکەوە گەشتی زانستیی ئەنجام داوە بۆ فێربوون و بەدەستهێنانی زانست و زانیاری، ئەوەتا لە تەمەنی پازدە (١٥) ساڵی چۆتە لای زانای پایەبەرز قوتەیبە و ساڵێک و دوو مانگ لای ماوەتەوە، جا بۆ فراوانکردنی ئاسۆی زانستەکەی چۆتە لای زانایانی خوڕاسان، حیجاز، میسر، عێراق، جەزیرە و شام، دواجار لە میسر

ماوەتەوە، تا خوای پەروەردگار کردی بە تاکی بێهاوتا و بوو بە قیبلەی حافیزانی فەرموودە و فێرخوازان، بۆیە لەوسەری دونیا زانایان و فێرخوازان دەهاتن و چۆکیان لە بەردەمی دادەدا تاوەکوو قومێک لە زانستی ئەم کەڵەپیاوە بنۆشن و وەک ئاوی کەوسەر تینوویێتییان بشکێنێت.

**مامـۆسـتاکانی:**

ئەو زانا و مامۆستایانەی ئیمام نەسائی ﷀ فەرموودەی لێ وەرگرتوون یەکجار زۆرن، ئیمام زەهەبی ناوی حەفتا لە زانا و مامۆستاکانی هێناوە، بەڵام ئێمە تەنها ناوی چەند زانایەکی هەرە بەناوبانگ لە بواری فەرموودەناسی دەهێنین، وەک:

١- قوتەیبەی کوڕی سەعید، کە هاوکات مامۆستای ئیمام بوخاری بووە.

٢- هەندێک لە زانایان دەفەرموون موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری، واتە: (ئیمام بوخاری)ش مامۆستای بووە و پێی گەیشتووە، هەندێکیش نکوولی لەوە دەکەن.

٣- ئەبو داود سولەیمانی کوڕی ئەشعەسی سجستانی (ئیمام ئەبو داود).

٤- ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی.

٥- ئەحمەدی کوڕی نەصری مەڕوزی.

٦- ئیبڕاهیمی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبڕاهیم.

٧- ئیبڕاهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی صالیح.

**قوتـابییەکانـی:**

ئەوانەیشی کە زانستیان لێ وەرگرتووە خەڵکێکی زۆرن، ئیمام سەخاوی شەست و پێنج کەسی باس کردوون، بەڵام ئێمە بەناوبانگترینیان ناو دەهێنین کە ئەمانەن:

١- ئەبو قاسیم سولەیمانی کوڕی ئەحمەد، ئیمامی طەبەڕانی، خاوەنی هەر سێ کتێبە

مەزنەکەی فەرمووده: (المعجم الكبير، المعجم الأوسط، المعجم الصغير).

٢- ئەبو جەعفەری تەحاوی حەنەفی.

٣- ئەبو عەلی حوسەینی کوڕی موحەممەدی نەیسابووری.

٤- ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی نەیسابووری.

٥- موحەممەدی کوڕی موعاویەی کوڕی ئەحمەدی ئەندەلووسی.

٦- ئەبو بیشری دولابی، خاوەنی کتێبی (الكنى).

٧- حەمزەی کوڕی موحەممەدی کینانی.

٨- ئەبو جەعفەر ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی نەحاسی نەحوی.

٩- ئەبو بەکر موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەددادی شافیعی.

١٠- عەبدولکەریمی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانی نەسائی.

١١- حەسەنی کوڕی خضری ئوسیوتی.

١٢- ئەبو بەکر ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی سنی.

١٣- حەسەنی کوڕی ڕەشیق.

١٤- موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەییویەی نەیسابووری.

١٥- موحەممەدی کوڕی موسای مەئموونی.

١٦- ئەبو سەعیدی کوڕی یونوس، خاوەنی کتێبی (تاريخ مصر).

١٧- ئیبن حیببان، خاوەنی کتێبی (صحيح ابن حبّان).

١٨- ئەبو ئەحمەد عەبدوڵڵای کوڕی عەدی جورجانی، خاوەنی پەرتووکی (الكامل في الضعفاء).

١٩- ئەبو جەعفەر موحەممەدی کوڕی عەمر، خاوەنی پەرتووکی (الضعفاء الكبير).

٢٠- ئەبو عەوانە یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی ئیسفیرایینی، خاوەنی پەرتووکی (المستخرج

علی مسلم).

ئەمانە و خەڵکانێکی دیکەی یەکجار زۆر خوای باڵادەست نیعمەتی ئەوەی لەگەڵ کردوون کە ببن بە قوتابی ئەو خۆرە مەزنە و سوود و بەهرە لە ڕووناکییەکەی وەربگرن، بەهۆیەوە ببن بە مانگ و ئەستێرەی ئاسمانی ئیسلامەتی و خزمەت بکەن.

**تــایبەتمەندی و سیفەتەکانــی:**

١- وەک پێغەمبەر داوود ڕۆژێک نا ڕۆژێک بە ڕۆژوو دەبوو، ئەمەش چاکترین ڕۆژووگرتنە، وەک پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، ئەوەش تەنها بە پیاوە زۆر مەزنەکان دەکرێت، هەروەها زۆر بەوەڕع و لەخواترس بووە.

٢- موجاهیدێکی چاونەترس و بەغیرەت بووە، هەروەها زۆر شارەزا بووە لە هونەرەکانی جەنگدا.

٣- ڕووخسارێکی زۆر زۆر جوانی هەبووە، پیاوێکی تا بڵێی بەشەهامەت و باڵابەرز و کەشخە و جوان بووە، هەتا بە پیریش زۆر جوان بووە، پیری و مووی سپی زۆر جوان لێ وەشاوەتەوە، جوانیی ڕوخسار و باڵا و ئاکار و زانستی بەیەکەوە تێدا کۆ بۆتەوە.

**پلەو پێگەی ئیمام نەسائی ﷺ لەلای زانایان:**

١- حافیز ئەبو حوسەین موحەممەدی کوڕی موزەففەر دەڵێت: زانایان و مامۆستایانمان لە میصر دانیان ناوە بە نەسائی لە پێشکەوتن لە زانست و پێشەوایەتی و بەردەوامی لەسەر حەجکردن و جیهادکردن.

٢- ئیمام زەهەبی لە (سیر أعلام النبلاء)دا دەڵێت: ئیمام نەسائی شارەزاتر بووە لە ئیمام موسلیم و ئەبو داود و تیرمیزی لە فەرموودە و عیلەلەکانی و ڕیجالەکانی، هاوتای بوخارییە لەم بابەتانەدا.

٣- موحەددیسی گەورە مەئموونی میصری دەڵێت: دەرچووین بۆ تەرتوس لەگەڵ ئیمام

نەسائی، جا کۆمەڵێک لە گەورە زانایانی فەرمووده کۆ بوونەوە، وەک: عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی موڕەببەع و ئەبو ئازان و کیلەجە، جا لە نێوانی خۆیان پرس و ڕاوێژیان کرد کە ئایا کێ فەرموودەیان بۆ پاڵفتە و بژاردە بکات؟ جا گشتیان بە کۆدەنگ کۆک بوون لەسەر ئەوەی ئیمام نەسائی هەڵسێت بەم کارە، ئەوانیش گشتیان فەرموودەیان نووسیەوە لەسەر هەڵبژاردن و پاڵفتەکردنی ئیمام نەسائی.

٤- ئیمام حاکیم دەڵێت: قسەی ئیمام نەسائی لەسەر فیقهی فەرمووده زۆر زۆرە، هەر کەسێک سەیری سونەنەکەی بکات سەری سووڕ دەمێنێت لە جوانیی قسەکانی.

٥- ئیمام زەهەبی دەڵێت: ڕاستە کە گوتراوە: ئیمام نەسائی مەرجەکانی وەرگرتنی فەرموودەی توندترن لە بوخاری و موسلیم.

٦- ئیمامی داڕەقوتنی دەڵێت: ئەبو بەکری کوڕی حەددادی شافیعی فەرموودەی زۆری دەگێڕایەوە و لە غەیری ئیمام نەسائیشی نەدەگێڕایەوە، دەیگوت: ڕازیم ئیمام نەسائی ببێتە حوججە لە نێوان من و خوادا (واتە: تەنها دڵی بە زانستەکەی ئەو ئاوی خواردۆتەوە).

٧- ئیبن عەدی دەڵێت: گوێم لە مەنصووری فەقیهـ و ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی سەلامەی تەحاوی بوو دەیانگوت: ئیمام نەسائی ئیمامێکی مەزنە لە ئیمامەکانی موسوڵمانان.

٨- حافیز ئەبو عەبدوڕڕەحمانی نەیسابووری دەڵێت: نەسائی ئیمامێکی مەزنە لە زانستی فەرموودەدا نکووڵی لەوە ناکرێت.

٩- ئەبو حەسەنی داڕەقوتنی دەڵێت: نەسائی پێشخراوی سەردەمی خۆیەتی بەسەر هەموو ئەوانەی باس دەکرێن لە زانایان لە بواری فەرموودەدا.

١٠- ئیمام سیووتی دەڵێت: کتێبە سونەنەکەی ئیمام نەسائی لەدوای صەحیحی بوخاری و موسلیم دێت، چونکە کەمترین فەرموودەی لاوازی تێدایە.

جا ئەوەندە کیفایەتە بۆ ئەم کەڵەپیاوە کە لەقەبی مەزن مەزنی بۆ دانراوە، وەک: (الحافظ الثبت، شیخ الإسلام).



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَصَلَّى اللهُ عَلَى سَيِّدنَا مُحَمَّد وآلِهِ وَصَحْبهِ وَمُحِبّيهِ

# كِتَابُ الطَّهَارَةِ

## پەرتووكی پاكوخاوێنی



### تَأْوِيلُ قَوْلِهِ ﷻ: {إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ} المائدة: ٦

مانای فەرمایشتی خوا ﷻ:
{إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ}

١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ، فَلَا يَغْمِسْ يَدَهُ فِي وَضُوئِهِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلَاثًا، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەكێك لە ئێوە لە خەو هەڵسا با دەستی نەخاتە نێو ئاوی دەستنوێژەكەی، هەتا سێ جار دەستی دەشوات، چونكە بێگومان هیچ یەكێك لە ئێوە نازانێت دەستی بەر چی كەوتووە».

## بَابُ السِّوَاكِ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ

### باسی سیواکردن لە کاتی هەڵسان لە شەودا

٢. عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ.

حوزەیفە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك هەڵسابایە بۆ شەونوێژ سیواکی لە دەمی وەردەدا.

## بَابُ التَّرْغِيبِ فِي السِّوَاكِ

### باسی هاندان بۆ سیواککردن

٣. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ».

عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «سیواک پاککەرەوەی دەمە و هۆکاری ڕەزامەندیی پەروەردگارە».

## ذِكْرُ الْفِطْرَةِ الِاخْتِتَانُ

### باسکردنی سروشتییەتی خەتەنەکردن

٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْفِطْرَةُ خَمْسٌ: الِاخْتِتَانُ، وَالِاسْتِحْدَادُ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمُ الْأَظْفَارِ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «فیترەت پێنج شتن: خەتەنەکردن و بەرتاشین و کورتکردنەوەی سمێڵ و نینۆککردن و هەڵکێشانی مووی بنباڵ».

## إِحْفَاءُ الشَّارِبِ وَإِعْفَاءُ اللِّحَى

### کورتکردنەوەی سمێڵ و هێشتنەوەی ڕیش

٥. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَحْفُوا الشَّوَارِبَ، وَأَعْفُوا اللِّحَى».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «سمێڵتان کورت بکەنەوە و ڕیشتان بهێڵنەوە».

## الْقَوْلُ عِنْدَ دُخُولِ الْخَلَاءِ

### ئەو زیکرەی دەگوترێ لە کاتی چوونە سەرئاو



٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك (دەیویست) بچێتە سەرئاو دەیفەرموو: «خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە شەیتانە نێرینەکان و شەیتانە مێیینەکان».

## النَّهْيُ عَنْ مَسِّ الذَّكَرِ بِالْيَمِينِ عِنْدَ الْحَاجَةِ

### ڕێگەگرتن لە گرتنی ئەندامی نێرینە بە دەستی ڕاست لە کاتی سەرئاوکردن

٧. عَنْ قَتَادَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْخَلَاءَ فَلَا يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ».

ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان چووە سەرئاو، با بە دەستی ڕاستی ئەندامی نێرینەی نەگرێت».

## التَّنَزُّهُ عَنِ الْبَوْلِ

## خۆپاکڕاگرتن لە میز پێکەوتن

٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى قَبْرَيْنِ فَقَالَ: «إِنَّهُمَا يُعَذَّبَانِ وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ: أَمَّا هَذَا فَكَانَ لَا يَسْتَنْزِهُ مِنْ بَوْلِهِ، وَأَمَّا هَذَا فَإِنَّهُ كَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ». ثُمَّ دَعَا بِعَسِيبٍ رَطْبٍ، فَشَقَّهُ بِاثْنَيْنِ فَغَرَسَ عَلَى هَذَا وَاحِدًا، وَعَلَى هَذَا وَاحِدًا، ثُمَّ قَالَ: «لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا».

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بەلای دوو گۆڕدا فەرمووی: «ئەو دوو (مردوو)ە سزا دەدرێن، لەبەر گوناهێکی گەورەش نییە کە سزا دەدرێن: بەڵکوو ئەوەیان خۆی پاک نەدەکردەوە لە میزەکەی، هەرچی ئەمەشیانە قسەی (خراپی) دەهێنا و دەبرد (لەنێو خەڵک بۆ نانەوەی ئاشووب)». پاشان داوای لقە دارخورمایەکی تەڕی کرد، کەرتی کرد و کردیە دوو پارچە، یەکیانی لەسەر گۆڕێکیان چاند و ئەوی دیکەشی لەسەر گۆڕەکەی دیکە چاند، پاشان فەرمووی: «ئومێد وایە سزایان لەسەر سووک بکرێت تا وشک دەبنەوە».

## النَّهْيُ عَنِ الِاسْتِنْجَاءِ بِالْيَمِينِ

## قەدەغەی خۆپاککردنەوە بە دەستی ڕاست

٩. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَنَفَّسْ فِي

إِنَائِهِ، وَإِذَا أَتَى الْخَلَاءَ فَلَا يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَلَا يَتَمَسَّحْ بِيَمِينِهِ».

ئەبو قەتادە ﷣ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێك یەکێکتان ئاوی خواردەوە با هەناسە نەدات لەنێو قاپەکەی، ئەگەر چوو بۆ سەرئاو با بە دەستی ڕاستی ئەندامی نێرینەی نەگرێت، با بە دەستی ڕاستیشی خۆی پاك نەکاتەوە».

## بَابُ التَّوْقِيتِ فِي الْمَاءِ

باسی دیاریکردنی ڕێژەی ئاو (ی پاك بۆ بەکارهێنان)

١٠. عَن ابْنِ عُمَرَ ﷠ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمَاءِ وَمَا يَنُوبُهُ مِنَ الدَّوَابِّ وَالسِّبَاعِ؟ فَقَالَ: «إِذَا كَانَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ لَمْ يَحْمِلِ الْخَبَثَ».

ئیبن عومەر ﷠ دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەو ئاوەی ئاژەڵ و دڕندە دادەبەزنە نێوی؟ ئەویش فەرمووی: «ئەگەر ئاو گەیشتە ڕێژەی قوللەتەین ئەوە پیسی هەڵناگرێت».



## تَرْكُ التَّوْقِيتِ فِي الْمَاءِ

دیارینەکردنی ڕێژەی ئاوی بەکارهێنان بۆ پاککردنەوە

١١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَامَ أَعْرَابِيٌّ فَبَالَ فِي الْمَسْجِدِ فَتَنَاوَلَهُ النَّاسُ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَعُوهُ وَأَهْرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ دَلْوًا مِنْ مَاءٍ؛ فَإِنَّمَا بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ، وَلَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: دەشتەکییەک هەڵسا میزی کردە نێو (حەوشەی) مزگەوت،

خەڵکەکەش کردیانە هاتوهاوار لێی، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموون: «وازی لێ بێنن (تا میزەکەی تەواو دەکات)، پاشان دۆڵکەیەک ئاو بە شوێنی میزەکەدا بکەن، چونکە ئێوە نێردراون ئاسانکار بن، نەنێردراون قورسکار بن».

## بَابُ مَاءِ الْبَحْرِ

### باسی ئاوی دەریا

١٢. عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا نَرْكَبُ الْبَحْرَ، وَنَحْمِلُ مَعَنَا الْقَلِيلَ مِنَ الْمَاءِ، فَإِنْ تَوَضَّأْنَا بِهِ عَطِشْنَا أَفَنَتَوَضَّأُ مِنْ مَاءِ الْبَحْرِ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە (سواری کەشتی دەبین) دەچینە نێو دەریا، کەمێك ئاو لەگەڵ خۆماندا هەڵدەگرین، ئەگەر دەستنوێژی پێ بشۆین تینوومان دەبێت، ئایا بە ئاوی دەریا دەستنوێژ بشۆین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئاوی دەریا پاکە، مردارەوەبووی نێویشی حەڵاڵە».

## بَابُ الْوُضُوءِ بِالثَّلْجِ

### باسی دەستنوێژ شوشتن بە بەفر

١٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اسْتَفْتَحَ الصَّلَاةَ سَكَتَ هُنَيْهَةً. فَقُلْتُ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا تَقُولُ فِي سُكُوتِكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ؟ قَالَ أَقُولُ: «اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ

نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالثَّلْجِ وَالْمَاءِ وَالْبَرَدِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دەستی دەکرد بە نوێژ بۆ ماوەیەکی کەم بێدەنگ دەبوو، گوتم: باوک و دایکم بەقوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی بێدەنگبوونت لە نێوان (اللَّهُ أَكْبَر)ی قورئان خوێندندا چی دەفەرمووی؟ فەرمووی: دەڵێم: «خوایە نێوانی من و هەڵەکانم دوور بخەرەوە وەکوو چۆن نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوات دوور خستۆتەوە، خوایە پاکم بکەرەوە لە هەڵەکانم وەکوو چۆن پۆشاکی سپی پاک دەکرێتەوە لە پیسی، خوایە بمشۆرە لە هەڵەکانم بە بەفر و ئاو و تەرزە».

## تَعفِير الإِنَاءِ الَّذِي ولغَ فِيهَ الكَلبُ بِالتُّرَاب

### باسی پاککردنەوەی قاپ بە خۆڵ ئەگەر سەگ زمانی تێخست



١٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْمُغَفَّلِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلَابِ، وَرَخَّصَ فِي كَلْبِ الصَّيْدِ وَالْغَنَمِ وَقَالَ: «إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي الْإِنَاءِ فَاغْسِلُوهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ، وَعَفِّرُوهُ الثَّامِنَةَ بِالتُّرَابِ».

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە کوشتنی سەگەکان، مۆڵەتیشی دا بە (هێشتنەوەی) سەگی ڕاوکردن و مەڕوماڵات، پاشان فەرمووی: «ئەگەر سەگ لە قاپێکدا خواردیەوە حەوت جار بیشۆن، هەشتەمین جار بە خۆڵ پاکی بکەنەوە».

تێبینی:

ئیمامی حەڕەمەین دەڵێت: فەرمانکردن بە کوشتنی سەگ نەسخ کراوەتەوە، لە

فەرموودەی تەواودا هاتووە پێغەمبەر ﷺ کوشتنی قەدەغە کردووە شەریعەتیش لەسەر ئەمە چەسپاوە، سەرەتا فەرمانی کرد بە کوشتنی دواتر قەدەغەی کرد.

## بَابُ سُؤْرِ الْحَائِضِ

### باسی (حوکمی) پاشماوەی دەمی ئافرەتی حەیزدار

١٥. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كُنْتُ أَتَعَرَّقُ الْعَرْقَ فَيَضَعُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاهُ حَيْثُ وَضَعْتُ وَأَنَا حَائِضٌ، وَكُنْتُ أَشْرَبُ مِنَ الْإِنَاءِ فَيَضَعُ فَاهُ حَيْثُ وَضَعْتُ وَأَنَا حَائِضٌ.

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: من ئێسقانم دەکڕاندەوە کە گۆشتی کەمی پێوە مابوو، پێغەمبەری خواش ﷺ دەمی دەخستە ئەو شوێنەی کە من لێم دەکڕاندەوە لە کاتێکدا حەیزدار بووم، هەروەها من لە پەرداخ ئاوم دەخواردەوە، پێغەمبەریش ﷺ دەمی دەخستە ئەو شوێنە و دەیخواردەوە، لە کاتێکدا حەیزدار بووم.



## بَابُ النِّيَةِ فِي الْوُضُوءِ

### نیەتهێنان بۆ دەستنوێژ گرتن

١٦. عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ، وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ».

عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان هەموو کردارەکان بەگوێرەی نیازی دڵە، هەر کەس بەپێی نیازی دڵی خۆی پاداشت وەردەگرێت، هەر کەس کۆچکردنەکەی بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی بێت ئەوە

کۆچەکەی بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەیەتی، هەر کەسێکیش کۆچکردنەکەی بۆ مەبەستێکی دونیایی بێت کە دەستی بکەوێت، یان بۆ ئافرەتێک مارەی بکات، ئەوە کۆچەکەی بۆ ئەو مەبەستە بووە کە کۆچی بۆ کردووە».

## الْوُضُوءُ مِنَ الْإِنَاءِ

### دەستنوێژ شوشتن لەنێو قاپ و تەشتدا

١٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمْ يَجِدُوا مَاءً، فَأُتِيَ بِتَوْرٍ فَأَدْخَلَ يَدَهُ، فَلَقَدْ رَأَيْتُ الْمَاءَ يَتَفَجَّرُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ وَيَقُولُ: «حَيَّ عَلَى الطَّهُورِ وَالْبَرَكَةُ مِنَ اللَّهِ ﷻ». قَالَ الْأَعْمَشُ: فَحَدَّثَنِي سَالِمُ بْنُ أَبِي الْجَعْدِ قَالَ: قُلْتُ لِجَابِرٍ: كَمْ كُنْتُمْ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: أَلْفًا وَخَمْسَمِائَةٍ.



عەبدوڵلا ﵁ دەڵێت: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووین، ئاویان دەست نەکەوت، تەشتێکیان هێنایە خزمەتی ئاوی تێدا بوو، دەستی خستە نێو تەشتەکەوە، بینیم ئاو هەڵدەقوڵا لە نێوان پەنجەکانیەوە و دەیفەرموو: «پەلە بکەن وەرن بۆ دەستنوێژ شوشتن بەرەکەت لە خواوەیە ﷻ». جا ئەعمەش (یەکێکە لە ڕاوییەکان) دەڵێت: سالیمی کوڕی ئەبو جەعد بۆی باس کردم گوتی: بە جابیرم گوت: ئەو کاتە چەند کەس بوون؟ گوتی: هەزار و پێنج سەد کەس.

## الْمَضْمَضَةُ وَالِاسْتِنْشَاقُ

### ئاووەردانە دەم و لووت

١٨. عَنْ حُمْرَانَ بْنِ أَبَانَ ﵀ قَالَ: رَأَيْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﵁ تَوَضَّأَ، فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ

ثَلَاثًا فَغَسَلَهُمَا، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، ثُمَّ غَسَلَ يَدَيْهِ الْيُمْنَى إِلَى الْمِرْفَقِ ثَلَاثًا، ثُمَّ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ غَسَلَ قَدَمَهُ الْيُمْنَى ثَلَاثًا ثُمَّ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي، ثُمَّ قَالَ: «مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَا يُحَدِّثُ نَفْسَهُ فِيهِمَا بِشَيْءٍ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ».

حومڕانی کوڕی ئەبان ﵀ دەڵێت: عوسمانی کوڕی عەفانم ﵁ بینی دەستنوێژی دەشوشت، سێ جار بە قاپەکە ئاوی بە دەستیدا کرد و شوشتی، پاشان ئاوی لە دەم و لووتی وەردا، پاشان سێ جار ڕوخساری شوشت، پاشان سێ جار دەستی ڕاستی شوشت تا ئانیشکەکانی، پاشان دەستی چەپیشی بە هەمان شێوە شوشت، پاشان مەسحی سەری کرد، دوایی سێ جار قاچی ڕاستی شوشت، ئینجا قاچی چەپیشی بە هەمان شێوە شوشت، وەکوو دەستەکانی، دوایی گوتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەستنوێژی شوشت وەکوو ئەم دەستنوێژەی من، پاشان فەرمووی: «هەر کەس وەک ئەم دەستنوێژەی من دەستنوێژ بشوات، پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات، خەیاڵ نەکات تیایدا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێت».



## بَابُ إِيجَابِ غَسْلِ الرِّجْلَيْنِ

## باسی پێویستبوونی شوشتنی پێیەکان

١٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَوْمًا يَتَوَضَّئُونَ، فَرَأَى أَعْقَابَهُمْ تَلُوحُ فَقَالَ: «وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکانێکی بینی دەستنوێژیان دەشوشت، بینیی پشتەپێیان وشکە و تەڕ نەبووە، فەرمووی: «سزا و

لەناوچوون لە ئاگر بۆ ئەو کەسانەی کەمتەرخەمی دەکەن لە شوشتنی پاژنەی پێیان، دەستنوێژ بەتەواوی بشۆن».

## الْأَمْرِ بِتَخْلِيلِ الْأَصَابِعِ

## فەرمانکردن بە دەست خستنە نێو پەنجەکان

٢٠. عَنْ عَاصِمِ بْنِ لَقِيطٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَوَضَّأْتَ فَأَسْبِغِ الْوُضُوءَ وَخَلِّلْ بَيْنَ الْأَصَابِعِ».

عاصیمی کوڕی لەقیت لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەگەر دەستنوێژت شوشت بەچاکی بیشۆ، نێوان و کەلێنی پەنجەکانیشت پاک بکەوە».



## التَّوْقِيتِ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ لِلْمُقِيمِ

## کاتدانان بۆ مەسحکردن لەسەر خوفەکان بۆ کەسی نیشتەجێ

٢١. عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂ عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ فَقَالَتْ: ائْتِ عَلِيًّا؛ فَإِنَّهُ أَعْلَمُ بِذَلِكَ مِنِّي، فَأَتَيْتُ عَلِيًّا فَسَأَلْتُهُ عَنِ الْمَسْحِ، فَقَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُنَا أَنْ يَمْسَحَ الْمُقِيمُ يَوْمًا وَلَيْلَةً، وَالْمُسَافِرُ ثَلَاثًا.

شورەیحی کوڕی هانیئ دەڵێت: پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂ دەربارەی مەسحکردن لەسەر خوفەکان؟ ئەویش گوتی: برۆ بۆ لای عەلی، چونکە ئەو لەم بوارەدا لە من شارەزاترە، منیش چووم بۆ لای عەلی ﵁ پرسیارم لێ کرد دەربارەی مەسحکردن، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ دەکردین ئەوەی دانیشتووە (لە ماڵ و شاری

خۆیەتی) شەو و ڕۆژێک مەسح بکات، ئەوەشی گەشتیارە سێ شەو و ڕۆژ (مەسح بکات).

## ثَوَابُ مَنْ تَوَضَّأَ كَمَا أُمِرَ

### پاداشتی ئەو کەسەی دەستنوێژ دەشوات بەو شێوەیەی کە فەرمانی پێ کراوە

٢٢. عَنْ أَبِي أَيُّوبَ رضي الله عنه سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ تَوَضَّأَ كَمَا أُمِرَ، وَصَلَّى كَمَا أُمِرَ، غُفِرَ لَهُ مَا قَدَّمَ مِنْ عَمَلٍ».

ئەبو ئەییووب رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «هەر کەسێك دەستنوێژ بشوات بەو شێوەیەی کە فەرمانی پێ کراوە، نوێژیش بکات بەو شێوەیەی فەرمانی پێ کراوە، لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبووردرێت».



## الْقَوْلُ بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنَ الْوُضُوءِ

### خوێندنی زیکری دوای تەواوبوون لە دەستنوێژ

٢٣. عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ قَالَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فُتِّحَتْ لَهُ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ».

عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك دەستنوێژ بشوات بەچاکترین شێوە، پاشان بڵێ: شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، شایەتی دەدەم موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە، هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لە هەر کامێکیان بیەوێت دەچێتە نێویەوە».

## بَابُ مَا يَنْقُضُ الْوُضُوءَ وَمَا لَا يَنْقُضُ الْوُضُوءَ مِنَ الْمَذْيِ

### باسی ئەوەی دەستنوێژ دەشکێنێت و ئەوەش کە دەستنوێژ ناشکێنێت لە مەزی

٢٤. عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ: كُنْتُ رَجُلًا مَذَّاءً، -وَكَانَتِ ابْنَةُ النَّبِيِّ ﷺ تَحْتِي- فَاسْتَحْيَيْتُ أَنْ أَسْأَلَهُ، فَقُلْتُ لِرَجُلٍ جَالِسٍ إِلَى جَنْبِي: سَلْهُ. فَسَأَلَهُ فَقَالَ: «فِيهِ الْوُضُوءُ».

ئەبو عەبدورڕەحمان دەڵێت: عەلی ﷺ گوتی: پیاوێک بووم مەزیم زۆر بوو -کچەکەی پێغەمبەریش ﷺ خێزانم بوو-، بۆیە شەرمم دەکرد پرسیاری لێ بکەم، بە پیاوێکم گوت لە تەنیشتم دانیشتبوو: پرسیاری لێ بکە، ئەویش پرسیاری لێ کرد، فەرمووی: «پێویستە دەستنوێژ بشواتەوە».



## بَابُ النُّعَاسِ

### باسی (حوکمی) وەنەوزە و خەوهاتن

٢٥. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا نَعَسَ الرَّجُلُ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ فَلْيَنْصَرِفْ، لَعَلَّهُ يَدْعُو عَلَى نَفْسِهِ وَهُوَ لَا يَدْرِي».

عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر پیاوێک خەوەنووچکەی هەبوو لەنێو نوێژدا، ئەوە با زوو نوێژەکەی تەواو بکات، لەوانەیە دوعای خراپ لە خۆی بکات و نەشزانێت».

## غُسْلُ الْكَافِرِ إِذَا أَسْلَمَ

### خۆشۆردنی بێبڕوا كاتێك موسوڵمان دەبێت

٢٦. عَنْ قَيْسِ بْنِ عَاصِمٍ ﵁: أَنَّهُ أَسْلَمَ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَغْتَسِلَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ.

قەیسی كوڕی عاصیم ﵁ دەگێڕێتەوە: كاتێك بووە موسوڵمان، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ كرد خۆی بشوات بە ئاو و سیدر.

## الْغُسْلَ مِنْ مُوَارَاةِ الْمُشْرِكِ

### ئەو كەسەی مردوو دەشارێتەوە دەبێت خۆی بشوات



٢٧. عَنْ عَلِيٍّ ﵁: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أَبَا طَالِبٍ مَاتَ. فَقَالَ: «اذْهَبْ فَوَارِهِ»، قَالَ: إِنَّهُ مَاتَ مُشْرِكًا، قَالَ: «اذْهَبْ فَوَارِهِ»، فَلَمَّا وَارَيْتُهُ رَجَعْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ لِي: «اغْتَسِلْ».

عەلی ﵁ دەگێڕێتەوە: چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەبو تالیب مرد، فەرمووی: «بڕۆ بیشارەوە»، (پێشەوا عەلی) گوتی: ئەو بەهاوبەشدانەری مردووە، فەرمووی: «بڕۆ بیشارەوە»، كاتێك شاردمەوە گەڕامەوە بۆ خزمەتی، پێمی فەرموو: «خۆت بشۆرە».

## بَابُ وُجُوبِ الْغُسْلِ إِذَا الْتَقَى الْخِتَانَانِ

### باسی پێویستبوونی خۆشوشتن كاتێك دوو خەتەنەكراوەكە پێك دەگەن

٢٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الْأَرْبَعِ، ثُمَّ

اجْتَهَدَ فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر (پیاو) لە نێوان هەر چوار پەلی (خێزانی) دانیشت بۆ جووتبوون و خۆی ماندوو کرد، ئەوە خۆشوشتن پێویست دەبێت».

## غَسْلِ الْمَرْأَةِ تَرَى فِي مَنَامِهَا مَا يَرَى الرَّجُلُ

### ئەگەر ئافرەت لە خەودا ئەوەی بینی کە پیاو دەیبینێت پێویستە خۆی بشوات

٢٩. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ ﵂ سَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمَرْأَةِ تَرَى فِي مَنَامِهَا مَا يَرَى الرَّجُلُ قَالَ: «إِذَا أَنْزَلَتِ الْمَاءَ فَلْتَغْتَسِلْ».



ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: ئوم سولەیم ﵂ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ئافرەتێک لە خەودا ئەوە دەبینێت کە پیاو لە خەودا دەیبینێت، فەرمووی: «ئەگەر ئاوی هاتەوە خۆی دەشۆرێت».

تێبینی:

بۆ ئەوەی خۆشوشتن پێویست بێت، مەرجە ئەم خەونە شوێنەواری دیار بێت، واتە: کەسەکە تەڕ بووبێت، نەك تەنها خەونێك بێت و هیچ شوێنەواری نەبێت.

## بَابُ الْفَصْلِ بَيْنَ مَاءِ الرَّجُلِ وَمَاءِ الْمَرْأَةِ

### باسی جیاکردنەوەی ئاوی پیاو و ئاوی ئافرەت

٣٠. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَاءُ الرَّجُلِ غَلِيظٌ أَبْيَضُ، وَمَاءُ الْمَرْأَةِ

رَقِيقٌ أَصْفَرُ، فَأَيُّهُمَا سَبَقَ كَانَ الشَّبَهُ».

ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئاوی پیاو ئەستوور و سپییە، ئاوی ئافرەت تەنك و زەردە، جا هەر كامیان پێش كەوت منداڵەكە لەویان دەچێت».

## ذِكْرُ الِاغْتِسَالِ مِنَ الْحَيْضِ

### باسی خۆشوشتن دوای تەواوبوون لە حەیز

٣١. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: اسْتُحِيضَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ جَحْشٍ سَبْعَ سِنِينَ، فَاشْتَكَتْ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَذِهِ لَيْسَتْ بِالْحَيْضَةِ وَلَكِنْ هَذَا عِرْقٌ فَاغْتَسِلِي، ثُمَّ صَلِّي».

عائیشە ﵂ دەڵێت: ئوم حەبیبەی كچی جەحش ﵂ حەوت ساڵ خوێنی نەخۆشی هەبوو، پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد؟ ئەویش فەرمووی: «ئەمە حەیز نییە، بەڵكوو دەمارێكە جا بۆیە خۆت بشۆرە، پاشان نوێژ بكە».

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ اغْتِسَالِ الْجُنُبِ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ

### باسی ڕێگەنەدان بە خۆشوشتنی لەشگران لە ئاوی وەستاودا

٣٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَغْتَسِلُ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ وَهُوَ جُنُبٌ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەكێكتان لەشگران بوو، با خۆی نەشوات لە ئاوێكی وەستاودا».

## بَابُ ذِكْرِ تَرْكِ الْمَرْأَةِ نَقْضَ ضَفْرِ رَأْسِهَا عِنْدَ اغْتِسَالِهَا مِنَ الْجَنَابَةِ

### باسی ئەوە کە ئافرەت کەزی قژی نەکاتەوە بۆ خۆشوشتن لە کاتی لەشگرانی

٣٣. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي أَفَأَنْقُضُهَا عِنْدَ غَسْلِهَا مِنَ الْجَنَابَةِ؟ قَالَ: «إِنَّمَا يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِي عَلَى رَأْسِكِ ثَلَاثَ حَثَيَاتٍ مِنْ مَاءٍ، ثُمَّ تُفِيضِينَ عَلَى جَسَدِكِ».

ئوم سەلەمەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من ئافرەتێکم قژم دەهۆنمەوە، ئایا لە کاتی خۆشوشتن بۆ لەشگرانی بیکەمەوە؟ فەرمووی: «(نەخێر) ئەوەندەت بەسە سێ چنگە ئاو بە سەرتدا بکەیت، پاشان ئاو بکەیت بەسەر هەموو جەستەتدا».



## ذِكْرُ وُضُوءِ الْجُنُبِ قَبْلَ الْغُسْلِ

### باسی دەستنوێژ شوشتنی لەشگران پێش ئەوەی خۆی بشوات

٣٤. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ بَدَأَ فَغَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ يُدْخِلُ أَصَابِعَهُ الْمَاءَ فَيُخَلِّلُ بِهَا أُصُولَ شَعْرِهِ، ثُمَّ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ غُرَفٍ، ثُمَّ يُفِيضُ الْمَاءَ عَلَى جَسَدِهِ كُلِّهِ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك خۆی بشوشتبایە بەهۆی لەشگرانی، سەرەتا دەستەکانی دەشوشت، پاشان دەستنوێژی دەشوشت وەک چۆن دەستنوێژ دەشوات بۆ نوێژ، پاشان پەنجەکانی دەخستە نێو ئاوەکە و دەستی دەخستە نێو پرچی تا تەڕ دەبوو، پاشان سێ چەنگ ئاوی دەکرد بە سەریدا، پاشان ئاوی دەکرد بە لاشەیدا.

## بَابُ وُضُوءِ الْجُنُبِ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ

### باسی دەستنوێژ شوشتنی لەشگران کاتێك دەیەوێت بخەوێت

**٣٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷄ: أَنَّ عُمَرَ ﷛ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَنَامُ أَحَدُنَا وَهُوَ جُنُبٌ؟ قَالَ: «إِذَا تَوَضَّأَ».**

**عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷄ دەگێڕێتەوە: عومەر ﷛ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا یەکێک لە ئێمە بخەوێت لە کاتێکدا کە لەشگرانە؟ فەرمووی: «ئەگەر دەستنوێژی شوشت».**

تێبینی:

**دروستە مرۆڤ بخەوێت بە لەشگرانییەوە، بەڵام دەستنوێژ بشوات باشترە و سوننەتێکی گەورەی جێبەجێ کردووە.**



## بَابٌ فِي الْجُنُبِ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعُودَ

### باسی ئەوە کە لەشگران ئەگەر ویستی دووبارە جووت بێت

**٣٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷛ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَعُودَ تَوَضَّأَ».**

**ئەبو سەعید ﷛ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان ویستی دووبارە جووت بێت (لەگەڵ خێزانی)، با دەستنوێژ بشوات».**

## بَابُ مُمَاسَّةِ الْجُنُبِ وَمُجَالَسَتِهِ

### باسی دەستلێدان لە لەشگران و دانیشتن لەگەڵیدا

٣٧. عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا لَقِيَ الرَّجُلَ مِنْ أَصْحَابِهِ مَاسَحَهُ وَدَعَا لَهُ، قَالَ: فَرَأَيْتُهُ يَوْمًا بُكْرَةً فَحِدْتُ عَنْهُ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ حِينَ ارْتَفَعَ النَّهَارُ فَقَالَ: «إِنِّي رَأَيْتُكَ فَحِدْتَ عَنِّي»، فَقُلْتُ: إِنِّي كُنْتُ جُنُبًا فَخَشِيتُ أَنْ تَمَسَّنِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْمُسْلِمَ لَا يَنْجُسُ».

حوزەیفە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك بگەشتایە بە یەکێک لە هاوەڵەکانی دەستی پێدا دەهێنا و دوعای بۆ دەکرد، دەڵێت: ڕۆژێک بینیم ڕووم وەرگێڕا بۆ لایەکی دیکە، پاشان کاتی خۆرئاوا هاتم بۆ خزمەتی، فەرمووی: «تۆم بینی ڕووت لێ وەرگێڕام؟!»، منیش گوتم: لەشگران بووم، لەوە ترسام دەستم لێ بدەیت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بێگومان موسوڵمان پیس نابێت».



## بَابُ تَأْوِيلِ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ} البقرة: ٢٢٢

### باسی مانای فەرمایشی خوا ﷻ: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ}

٣٨. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَتِ الْيَهُودُ إِذَا حَاضَتِ الْمَرْأَةُ مِنْهُمْ لَمْ يُؤَاكِلُوهُنَّ وَلَمْ يُشَارِبُوهُنَّ وَلَمْ يُجَامِعُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ، فَسَأَلُوا نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى} البقرة: ٢٢٢، فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُؤَاكِلُوهُنَّ وَيُشَارِبُوهُنَّ وَيُجَامِعُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ، وَأَنْ يَصْنَعُوا بِهِنَّ كُلَّ شَيْءٍ مَا خَلَا الْجِمَاعَ.

ئەنەس ﷺ دەڵێت: جوولەکەکان هەر ئافرەتێک تووشی حەیز دەبوون خواردن و خواردنەوەیان لەگەڵ نەدەخواردن و دەستبازییان لەگەڵ نەدەکردن، لە ماڵەکانیاندا

دانەدەنیشتن لەگەڵیان، پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد سەبارەت بەوە، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى}، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردن لەگەڵیاندا بخۆن و بخۆنەوە و دەستبازی بکەن و لە ماڵیشدا کۆ ببنەوە لەگەڵیاندا، هەموو شتێکیان لەگەڵ بکەن جگە لە جووتبوون.

## بَابُ بَوْلِ الْجَارِيَةِ

### باسی شوشتنی میزی کچ

٣٩. عَنْ أَبِي السَّمْحِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يُغْسَلُ مِنْ بَوْلِ الْجَارِيَةِ وَيُرَشُّ مِنْ بَوْلِ الْغُلَامِ».

ئەبو سەمح ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «میزی کچێکی منداڵ دەشۆردرێت، میزی کوڕیش تەنها ئاوپرژێن دەکرێت (مەبەستی منداڵی شیرەخۆرەیە)».

## بَابُ تَيَمُّمِ الْجُنُبِ

### باسی تەیەممومکردنی لەشگران

٤٠. عَنْ شَقِيقٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ وَأَبِي مُوسَى، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: أَوَلَمْ تَسْمَعْ قَوْلَ عَمَّارٍ لِعُمَرَ ﷺ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَاجَةٍ فَأَجْنَبْتُ فَلَمْ أَجِدِ الْمَاءَ فَتَمَرَّغْتُ بِالصَّعِيدِ، ثُمَّ أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَقُولَ هَكَذَا»، وَضَرَبَ بِيَدَيْهِ عَلَى الْأَرْضِ ضَرْبَةً فَمَسَحَ كَفَّيْهِ ثُمَّ نَفَضَهُمَا، ثُمَّ ضَرَبَ بِشِمَالِهِ عَلَى يَمِينِهِ وَبِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ عَلَى كَفَّيْهِ وَوَجْهِهِ.

شەقیق دەڵێت: من دانیشتبووم لەگەڵ عەبدوڵڵا و ئەبو مووسا، ئەبو مووسا گوتی: ئایا قسەکەی عەممارت نەبیستووە کە بە عومەری ﵁ گوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ پێویستییەک، لەشگران بووم ئاوم دەست نەکەوت، خۆم گەوزاند لە خۆڵدا، پاشان هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆم باس کرد، فەرمووی: «تەنها ئەوەندەت بەس بوو کە بە دەستەکانت ئاوا بکەیت». پاشان هەردوو دەستی دا بە زەویدا، یەکجار مەسحی هەردوو لەپی دەستی کرد، پاشان دایانی بەیەکدا، پاشان دەستی چەپی هێنا بەسەر دەستی ڕاستیدا، دەستی ڕاستیشی بەسەر چەپیدا، ڕووی هەردوو دەستی و دەموچاوی.

## بَابُ الصَّلَوَاتِ بِتَيَمُّمٍ وَاحِدٍ

باسی ئەنجامدامی هەموو نوێژەکان بە یەک تەیەمموم



٤١. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الصَّعِيدُ الطَّيِّبُ وَضُوءُ الْمُسْلِمِ، وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ عَشْرَ سِنِينَ».

ئەبو زەڕ ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خۆڵی پاکوخاوێن ئاوی دەستنوێژی موسوڵمانە، ئەگەر بۆ ماوەی دەساڵیش ئاوی دەست نەکەوێت».



# كِتَابُ الْمِيَاهِ

## پەرتووكی ئاوەكان



قَالَ اللَّهُ ﷻ: {وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا} الفرقان: ٤٨، وَقَالَ ﷻ: {وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لِيُطَهِّرَكُمْ بِهِ} الأنفال: ١١، وَقَالَ تَعَالَى: {فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا} النساء: ٤٣.

خوا ﷻ فەرموویەتی: {وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا}، واتە: ئێمە لە ئاسمانەوە ئاوێكی پاك و سازگارمان دابەزاندووە. هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: {وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لِيُطَهِّرَكُمْ بِهِ}، واتە: خوا لە ئاسمانەوە ئاوتان بۆ دادەبەزێنێت بۆ ئەوەی خۆتانی پێ پاك بكەنەوە. خوای گەورە فەرمووشیەتی: {فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا}، واتە: ئەگەر ئاوتان دەست نەكەوت ئەوە تەیەممومم بكەن بە خۆڵێكی پاك.

٤٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ بَعْضَ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ اغْتَسَلَتْ مِنَ الْجَنَابَةِ فَتَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ بِفَضْلِهَا فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: «إِنَّ الْمَاءَ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: یەكێك لە خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ خۆی شوشت بەهۆی لەشگرانی، پێغەمبەریش ﷺ دەستنوێژی شوشت لەو ئاوەی كە مابوویەوە،

پاشان فەرمووی: «بێگومان بە شتێکی کەم ئاو پیس نابێت».

## بَابُ سُؤْرِ الْهِرَّةِ

### باسی پاشماوەی پشیلە

٤٣. عَنْ كَبْشَةَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ دَخَلَ عَلَيْهَا -ثُمَّ ذَكَرَ كَلِمَةً مَعْنَاهَا- فَسَكَبْتُ لَهُ وَضُوءًا، فَجَاءَتْ هِرَّةٌ فَشَرِبَتْ مِنْهُ، فَأَصْغَى لَهَا الْإِنَاءَ حَتَّى شَرِبَتْ. قَالَتْ كَبْشَةُ: فَرَآنِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ فَقَالَ: أَتَعْجَبِينَ يَا ابْنَةَ أَخِي؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ، إِنَّمَا هِيَ مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ وَالطَّوَّافَاتِ».



کەبشەی کچی کەعبی کوڕی مالیک دەگێڕێتەوە: ئەبو قەتادە رضي الله عنه هات بۆ لای -پاشان باسی وشەیەکی کرد ماناکەی بەم شێوەیە بوو-، ئاوی دەستنوێژم بۆ ئامادە کرد، پشیلەیەک هات لێی خواردەوە، ئەویش قاپەکەی بۆ لار کردەوە تا پشیلەکە لێی خواردەوە. کەبشە دەڵێت: بینیی من وا تەماشای دەکەم، بۆیە گوتی: ئایا سەرت سووڕماوە ئەی برازاکەم؟ گوتم بەڵی، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پشیلە پیس نییە، بەڵکوو ئەو پشیلانە لەو گیاندارانەن لەنێو ماڵەکانتان دێن و دەڕۆن و دەسووڕێنەوە».

## بَابُ الْقَدْرِ الَّذِي يَكْتَفِي بِهِ الْإِنْسَانُ مِنَ الْمَاءِ لِلْوُضُوءِ وَالْغُسْلِ

### باسی ئەندازەی ئەو ئاوەی کە بەسە بۆ دەستنوێژ و خۆشوشتنی مرۆڤ

٤٤. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَتَوَضَّأُ بِمُدٍّ وَيَغْتَسِلُ بِنَحْوِ الصَّاعِ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی دەگرت بە (مُـد)ێک (کە دەکاتە چواریەکی صاعێک)، خۆی دەشوشت بە صاعێک (کە دەکاتە سێ لیتر ئاو).



# كِتَابُ الْحَيْضِ وَالِاسْتِحَاضَةِ

# پەرتووکی حەیز و نەخۆشی حەیز

## بَابُ بَدْءِ الْحَيْضِ، وَهَلْ يُسَمَّى الْحَيْضُ نِفَاسًا؟

### باسی دەستپێکردنی حەیز، ئایا بە حەیز دەگوترێت زەیسان؟



٤٥. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَا نُرَى إِلَّا الْحَجَّ، فَلَمَّا كُنَّا بِسَرِفَ حِضْتُ، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا أَبْكِي، فَقَالَ: «مَا لَكِ أَنَفِسْتِ؟»، قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: «هَذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ ﷻ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ، فَاقْضِي مَا يَقْضِي الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بە مەبەستی حەجکردن، کاتێك گەیشتینە (سَرِف) (شوێنێک بوو لە نزیک مەککە) کەوتمە حەیزەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام دەگریام، فەرمووی: «چیتە کەوتوویتەتە حەیزەوە؟»، گوتم: بەڵێ، فەرمووی: «ئەمە کارێکە خوا ﷻ نووسیویەتی لەسەر کچەکانی ئادەم، ئەوەی کەسی حاجی دەیکات تۆش بیکە، بەڵام تەوافی بەیت مەکە».

## الْمَرْأَةُ يَكُونُ لَهَا أَيَّامٌ مَعْلُومَةٌ تَحِيضُهَا كُلَّ شَهْرٍ

### ئافرەت لە هەموو مانگێکدا چەند ڕۆژێکی هەیە تیایدا دەکەوێتە حەیز

٤٦. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: إِنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ ﵂ سَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الدَّمِ؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: رَأَيْتُ مِرْكَنَهَا مَلْآنَ دَمًا، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «امْكُثِي قَدْرَ مَا كَانَتْ تَحْبِسُكِ حَيْضَتُكِ، ثُمَّ اغْتَسِلِي».

عائیشە ﵂ دەڵێت: ئوم حەبیبە ﵂ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی خوێنی حەیز؟ عائیشە ﵂ دەڵێت: تەشتەکەیم بینی پڕ بوو لە خوێن، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: «چاوەڕوان بکە بەئەندازەی ئەوەی حەیزەکەت دەوەستێتەوە، پاشان خۆت بشۆرە».



## جَمْعُ الْمُسْتَحَاضَةِ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ وَغُسْلِهَا إِذَا جَمَعَتْ

### ئەو ئافرەتەی خوێنی نەخۆشی هەیە دوو نوێژ کۆ دەکاتەوە و خۆی دەشوات

٤٧. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ امْرَأَةً مُسْتَحَاضَةً عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ قِيلَ لَهَا: إِنَّهُ عِرْقٌ عَانِدٌ، وَأُمِرَتْ أَنْ تُؤَخِّرَ الظُّهْرَ وَتُعَجِّلَ الْعَصْرَ وَتَغْتَسِلَ لَهُمَا غُسْلاً وَاحِدًا، وَتُؤَخِّرَ الْمَغْرِبَ وَتُعَجِّلَ الْعِشَاءَ وَتَغْتَسِلَ لَهُمَا غُسْلاً وَاحِدًا، وَتَغْتَسِلَ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ غُسْلاً وَاحِدًا.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک لە ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ خوێنی نەخۆشیی هەبوو، پێی گوترا: ئەوە دەمارێکە خوێنی ناوەستێت، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمانی پێ کرد نوێژی نیوەڕۆ دوا بخات و عەسریش پێش بخات، بۆ هەردوو نوێژەکە یەک جار خۆی بشوات، نوێژی ئێوارە دوا بخات و نوێژی عیشا پێش بخات، بۆ هەردوو نوێژەکە یەک جار خۆی بشوات، بۆ نوێژی بەیانیش جارێک خۆی بشوات.

## بَابُ سُقُوطِ الصَّلَاةِ عَنِ الْحَائِضِ

### باسی ئەوەی کە ئافرەت کەوتە حەیزەوە نوێژ ناکات

٤٨. عَنْ مُعَاذَةَ الْعَدَوِيَّةِ قَالَتْ: سَأَلَتِ امْرَأَةٌ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَتَقْضِي الْحَائِضُ الصَّلَاةَ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ قَدْ كُنَّا نَحِيضُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَلَا نَقْضِي وَلَا نُؤْمَرُ بِقَضَاءٍ.

موعازەی عەدەوییە دەڵێت: ئافرەتێک پرسیاری لە عائیشە رضي الله عنها کرد ئایا حەیزدار نوێژەکانی دووبارە دەکاتەوە؟ گوتی: ئایا تۆ حەڕووریەیت؟ (حروری: ئەو شوێنە بوو کە خەواریجەکانی لێ بوو، ئەوان پێیان وا بوو ئافرەت لە حەیزیشدا بێت دەبێت نوێژ بکات)، ئێمە لەلای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەکەوتینە حەیزەوە نە نوێژمان قەزا دەکردەوە، نە فەرمانمان پێ دەکرا بە قەزاکردنەوەی.



## بَابُ شُهُودِ الْحُيَّضِ الْعِيدَيْنِ وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ

### باسی ئامادەبوونی حەیزدار لە جەژنەکان و پاڕانەوەی موسوڵمانان

٤٩. عَنْ حَفْصَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ رضي الله عنها لَا تَذْكُرُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم إِلَّا قَالَتْ: بِأَبَا. فَقُلْتُ: أَسَمِعْتِ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ كَذَا وَكَذَا؟ قَالَتْ: نَعَمْ. بِأَبَا قَالَ: «لِتَخْرُجِ الْعَوَاتِقُ وَذَوَاتُ الْخُدُورِ وَالْحُيَّضُ فَيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، وَتَعْتَزِلِ الْحُيَّضُ الْمُصَلَّى».

حەفصە رضي الله عنها دەڵێت: دایکی عەتییە رضي الله عنها هەر کاتێک باسی پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم بکردایە ئیللا دەیگوت: باوکم بەقوربانی بێت. منیش گوتم: ئایا بیستووتە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئاوا و ئاوا بفەرمووێت؟ گوتی: بەڵێ. باوکم بەقوربانی بێت، فەرمووی: «با

ئەو کچانە دەربچن کە تازەپێگەیشتوون، ئەوانەش کە خۆیان داپۆشیوە و ئەوانەش لە حەیزدان ئامادەی خێر و جەژنەکان بین لەگەڵ پاڕانەوەی موسوڵمانان (وەکوو نوێژەبارانە)، با ئەوانەی لە حەیزدان دوور بکەونەوە لە شوێنی نوێژکردن».



# كِتَابُ الْغُسْلِ وَالتَّيَمُّمِ

## پەرتووکی خۆشوشتن و تەیەممومکردن

### بَابُ الِاغْتِسَالِ قَبْلَ النَّوْمِ

### باسی خۆشوشتن پێش خەوتن



٥٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ رحمه الله قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رضي الله عنها كَيْفَ كَانَ نَوْمُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْجَنَابَةِ؟ أَيَغْتَسِلُ قَبْلَ أَنْ يَنَامَ أَوْ يَنَامُ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ؟ قَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ قَدْ كَانَ يَفْعَلُ، رُبَّمَا اغْتَسَلَ فَنَامَ وَرُبَّمَا تَوَضَّأَ فَنَامَ.

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەیس رحمه الله دەڵێت: پرسیارم کرد لە عائیشە رضي الله عنها: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی لەشگرانی چۆن دەخەوت؟ ئایا خۆی دەشوشت پێش ئەوەی بخەوێت، یاخود دەخەوت پێش ئەوەی خۆی بشوات؟ گوتی: هەموو ئەوانەی دەکرد، جاری وا بوو خۆی دەشوشت و دەخەوت، هەندێك جاریش دەستنوێژی دەشوشت و دەخەوت.

## بَابُ الِاغْتِسَالِ أَوَّلَ اللَّيْلِ

### باسی خۆشوشتن لە سەرەتای شەو

٥١. عَنْ غُضَيْفِ بْنِ الْحَارِثِ ﵀ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ فَسَأَلْتُهَا فَقُلْتُ: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَغْتَسِلُ مِنْ أَوَّلِ اللَّيْلِ أَوْ مِنْ آخِرِهِ؟ قَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ كَانَ رُبَّمَا اغْتَسَلَ مِنْ أَوَّلِهِ وَرُبَّمَا اغْتَسَلَ مِنْ آخِرِهِ، قُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الْأَمْرِ سَعَةً.

غوزەیفی کوڕی حاریس ﵀ دەڵێت: چوومە خزمەت (دایکە) عائیشە ﵂ پرسیارم لێ کرد: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتای شەو خۆی دەشوشت، یاخود لە کۆتاییەکەی؟ گوتی: هەردووکیان، هەندێ جار سەرەتای شەو خۆی دەشوشت، هەندێ جار کۆتایی شەو. (غوزەیف دەڵێ) گوتم: سوپاس بۆ خوا لە کارەکەیدا فراوانیی داناوە.



## بَابُ تَرْكِ الْوُضُوءِ بَعْدَ الْغُسْلِ

### باسی دەستنوێژ نەشوشتنەوە دوای خۆشوشتن

٥٢. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَتَوَضَّأُ بَعْدَ الْغُسْلِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای خۆشوشتن دەستنوێژی نەدەشوشت.

## بَابُ التَّيَمُّمِ بِالصَّعِيدِ

### باسی تەیەمموم کردن بە خۆڵ

٥٣. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِي الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا فَأَيْنَمَا أَدْرَكَ الرَّجُلَ مِنْ أُمَّتِي الصَّلَاةُ يُصَلِّي، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ وَلَمْ يُعْطَ نَبِيٌّ قَبْلِي، وَبُعِثْتُ

إِلَى النَّاسِ كَافَّةً، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پێنج شتم پێ دراون پێش من بە هیچ کەس نەدراون: بە ترس خستنە دڵی دوژمنەوە سەرکەوتنم پێ دراوە بەدرێژایی یەک مانگ، هەموو زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت و بەپاک دانراوە، لە هەر کوێ یەکێک لە ئوممەتەکەم کاتی نوێژکردنی هات نوێژی خۆی دەکات، تکا و شەفاعەتیشم پێ بەخشراوە کە بە هیچ پێغەمبەرێکی پێش من نەبەخشراوە، نێردراوم بۆ لای خەڵکی بەگشتی، جاران پێغەمبەرێک بەتایبەت دەنێردرا بۆ لای گەلەکەی».

## بَابُ التَّيَمُّمِ لِمَنْ يَجِدُ الْمَاءَ بَعْدَ الصَّلَاةِ

### باسی تەیەمموم کردن بۆ ئەو کەسەی دوای نوێژ ئاوی دەست دەکەوێت



٥٤. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ: أَنَّ رَجُلَيْنِ تَيَمَّمَا وَصَلَّيَا، ثُمَّ وَجَدَا مَاءً فِي الْوَقْتِ، فَتَوَضَّأَ أَحَدُهُمَا وَعَادَ لِصَلَاتِهِ مَا كَانَ فِي الْوَقْتِ وَلَمْ يَعُدِ الْآخَرُ، فَسَأَلَا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ لِلَّذِي لَمْ يَعُدْ: «أَصَبْتَ السُّنَّةَ وَأَجْزَأَتْكَ صَلَاتُكَ»، وَقَالَ لِلْآخَرِ: «أَمَّا أَنْتَ فَلَكَ مِثْلُ سَهْمِ جَمْعٍ».

ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: دوو پیاو بە تەیەمموم نوێژیان کرد، پاشان لە هەمان کاتدا ئاویان دەست کەوت، یەکێکیان دەستنوێژی شوشت و نوێژەکەی کردەوە، ئەوی دیکەیان نوێژەکەی دووبارە نەکردەوە، هەردووکیان لەوبارەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، بەوەیانی فەرموو کە دووبارەی نەکردەوە: «سوننەتت پێکاوە و نوێژەکەت دروستە»، بەوی دیکەشی فەرموو: «تۆش پاداشتی هەردوو نوێژەکەت بۆ هەیە».

# كِتَابُ الصَّلاةِ

## پەرتووکی نوێژ

### بَابُ كَيْفَ فُرِضَتِ الصَّلَاةُ

### باسی چۆنیەتی فەرزکرانی نوێژ



٥٥. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: أَوَّلَ مَا فُرِضَتِ الصَّلَاةُ رَكْعَتَيْنِ فَأُقِرَّتْ صَلَاةُ السَّفَرِ وَأُتِمَّتْ صَلَاةُ الْحَضَرِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: یەکەم جار نوێژ فەرز کرا دوو ڕکات بوو، جا بۆ نوێژی گەشت جێگیر کرا، نوێژی نیشتەجێ زیاد کرا.

تێبینی:

نوێژی گەشت: واتە: کەسێك لە گەشت و سەفەرە و لە دەرەوەی ماڵ و شاری خۆیەتی، نوێژ کورت دەکاتەوە.

نوێژی نیشتەجێ: واتە: کەسێك کە لە ماڵ و شوێنی خۆیەتی، نوێژەکان وەك خۆی دەکات و کورتیان ناکاتەوە.

٥٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵁ قَالَ: فُرِضَتِ الصَّلَاةُ عَلَى لِسَانِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا، وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً.

ئیبن عەبباس ﵁ دەڵێت: لەسەر زاری پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکات نوێژ لە نیشتەجێبوون فەڕز کرا، لە گەشتیشدا دوو ڕکات، لە کاتی ترسیشدا یەک ڕکات.

## بَابُ الْبَيْعَةِ عَلَى الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ

## باسی پەیماندان لەسەر ئەنجامدانی پێنج نوێژەکان

٥٧. عَنْ أَبِي مُسْلِمٍ الْخَوْلَانِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي الْحَبِيبُ الْأَمِينُ عَوْفُ بْنُ مَالِكٍ الْأَشْجَعِيُّ ﵁ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: «أَلَا تُبَايِعُونَ رَسُولَ اللهِ ﷺ؟»، -فَرَدَّدَهَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ-، فَقَدَّمْنَا أَيْدِيَنَا فَبَايَعْنَاهُ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، قَدْ بَايَعْنَاكَ فَعَلَامَ؟ قَالَ: «عَلَى أَنْ تَعْبُدُوا اللهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَالصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ»، وَأَسَرَّ كَلِمَةً خَفِيَّةً: «أَنْ لَا تَسْأَلُوا النَّاسَ شَيْئًا».

ئەبو موسلیمی خەولانی دەڵێت: هەواڵی پێ دام خۆشەویست و ئەمیندار عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی ﵁ گوتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین فەرمووی: «ئایا پەیمان نادەن بە پێغەمبەری خوا؟»، -سێ جار ئەم ڕستەیەی دووبارە کردەوە-، دەستمان درێژ کرد پەیمانمان پێ دا، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، پەیمانمان پێ دای لەسەر چی؟ فەرمووی: «لەسەر ئەوەی خوا بپەرستن و هاوبەشی بۆ دانەنێن، ئەنجامدانی هەر پێنج نوێژەکان»، ڕستەیەکی بە دەنگی نزم فەرموو (کە بریتی بوو لەوەی فەرمووی): «داوای هیچ لە خەڵکی مەکەن. (جگە لە فێربوونی ئایین و زانست)».

## فَضْلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ

### پێگە و گەورەیی پێنج نوێژەکان

٥٨.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ مِنْهُ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ هَلْ يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شَيْءٌ؟»، قَالُوا: لَا يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شَيْءٌ، قَالَ: «فَكَذَلِكَ مَثَلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ يَمْحُو اللَّهُ بِهِنَّ الْخَطَايَا».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەواڵم بدەنێ ئەگەر ڕووبارێک بەبەردەم ماڵی یەکێک لە ئێوەدا بێت، هەموو ڕۆژێک پێنج جار خۆی پێ بشوات، ئایا چڵکی پێوە دەمێنێت؟»، گوتیان: هیچ چڵکێکی پێوە نامێنێت، فەرمووی: «هەروەها ئەویش وەکوو پێنج نوێژەکان وایە، خوا گوناهەکانی پێ دەسڕێتەوە».



## بَابُ الْحُكْمِ فِي تَارِكِ الصَّلَاةِ

### باسی حوکمی کەسی نوێژنەکەر

٥٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْعَهْدَ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمِ الصَّلَاةُ، فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ».

عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان ئەو پەیمان و بەڵێنەی لە نێوان ئێمە و ئەواندا هەیە نوێژە، هەر کەس وازی لێ بێنێت ئەوە بێبڕوایی کردووە (واتە: کردەوەیەکی وەك بێبڕوایانی کردووە)».

تێبینی:

زانایان ڕاجیاوازن دەربارەی بەبڕوادانانی نوێژنەکەر، زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەگەر نوێژنەکردنەکەی بەهۆی تەمبەڵی بێت و لە ناخی دڵەوە بڕوای بێت فەڕزە لەسەری، بە ئەنجامنەدانی گوناهبارە، ئەوە بە بێبڕوا لەقەڵەم نادرێت.

## بَابُ الْمُحَاسَبَةِ عَلَى الصَّلَاةِ

## باسی (ئەوەی یەکەم) لێپرسینەوە لەسەر نوێژە

٦٠. عَنْ حُرَيْثِ بْنِ قَبِيصَةَ قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُمَّ يَسِّرْ لِي جَلِيسًا صَالِحًا، فَجَلَسْتُ إِلَى أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: فَقُلْتُ إِنِّي دَعَوْتُ اللَّهَ ﷻ أَنْ يُيَسِّرَ لِي جَلِيسًا صَالِحًا، فَحَدِّثْنِي بِحَدِيثٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَنْفَعَنِي بِهِ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ بِصَلَاتِهِ، فَإِنْ صَلَحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَأَنْجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ».

حوڕەیسی کوڕی قەبیصە دەڵێت: هاتم بۆ مەدینە گوتم: خوایە کەسێکی چاک بکەیتە هاوەدەمم، دواتر لەلای ئەبو هوڕەیڕە ﵁ دانیشتم، گوتم: من داوام لە خوا کرد هاودەمێکی باشم بۆ ئاسان بکات، فەرموودەیەکم بۆ باس بکە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستووتە، بەڵکوو خوا بەهۆیەوە سوودم پێ بگەیەنێت، گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «یەکەم شت (لە قیامەت) بەندە پرسیاری لێ دەکرێت نوێژە (وەك مافی خوا)، ئەگەر نوێژەکەی تەواو بوو، ئەوە سەرفراز و سەرکەوتوو بووە، ئەگەر نوێژەکەی خراپ بوو، ئەوە زەرەرمەند و بەدبەخت بووە».

## بَابُ فَضْلِ صَلَاةِ الْجَمَاعَةِ

## باسی پێگە و گەورەیی نوێژی بەکۆمەڵ

٦١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «تَفْضُلُ صَلَاةُ الْجَمْعِ عَلَى صَلَاةِ أَحَدِكُمْ وَحْدَهُ بِخَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا، وَيَجْتَمِعُ مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ»، وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: {وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا} الإسراء: ٧٨.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نوێژی بەکۆمەڵ فەزڵ و چاکەی لە نوێژی کەسێکتان بەتەنها زیاترە بە بیست و پێنج هێندە، فریشتەکانی شەو و ڕۆژ لە نوێژی بەیانیدا کۆ دەبنەوە»، ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە (کە دەفەرمووێ): {وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا}، واتە: قورئان خوێندنی (نوێژی) بەیانی، بەدڵنیاییەوە قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی ئامادەبوونی تێدایە (لەلایەن فریشتەکانەوە).

## بَابُ الْحَالِ الَّتِي يَجُوزُ فِيهَا اسْتِقْبَالُ غَيْرِ الْقِبْلَةِ

## باسی ئەو حاڵەتەی کە دروستە بۆ نوێژ ڕوو نەکرێتە قیبلە

٦٢. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسَبِّحُ عَلَى الرَّاحِلَةِ قِبَلَ أَيِّ وَجْهٍ تَتَوَجَّهُ، وَيُوتِرُ عَلَيْهَا غَيْرَ أَنَّهُ لَا يُصَلِّي عَلَيْهَا الْمَكْتُوبَةَ.

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر وشترەکەی دەکرد ڕووی لە هەر شوێنێک بووایە، ویتریشی لەسەری دەکرد، بەڵام نوێژی فەڕزی لەسەری نەدەکرد.

٦٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي عَلَى دَابَّتِهِ وَهُوَ مُقْبِلٌ مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ، وَفِيهِ أُنْزِلَتْ: {فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ} البقرة: ١١٥.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر سوارییەکەی دەکرد لە کاتێکدا پشتی لە مەککە بووە و ڕووی لە مەدینە بوو، لەو بارەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: {فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ}، واتە: ڕوو لە کوێ بکەن ئەوە ڕەزامەندی خوا لەوێیە.



# كِتَابُ الْمَوَاقِيتِ

## پەرتووكی كاتەكانی نوێژ

٦٤.عَنْ أَبَا مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «نَزَلَ جِبْرِيلُ فَأَمَّنِي فَصَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ»، يَحْسُبُ بِأَصَابِعِهِ خَمْسَ صَلَوَاتٍ.



ئەبو مەسعوود ﵁ دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «جیبریل دابەزی پێشنوێژیی بۆ كردم، منیش نوێژم لەگەڵدا كرد، پاشان نوێژم لەگەڵدا كرد، پاشان نوێژم لەگەڵدا كرد، پاشان نوێژم لەگەڵدا كرد، پاشان نوێژم لەگەڵدا كرد»، بە دەستەكانی پێنج جار ژماردی.

### مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَتَيْنِ مِنَ الْعَصْرِ

### ئەو كەسەی بە دوو ڕكاتی نوێژی عەسر ڕادەگات

٦٥.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَدْرَكَ أَحَدُكُمْ أَوَّلَ سَجْدَةٍ مِنْ صَلَاةِ الْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَلْيُتِمَّ صَلَاتَهُ، وَإِذَا أَدْرَكَ أَوَّلَ سَجْدَةٍ مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَلْيُتِمَّ صَلَاتَهُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «ئەگەر یەکێکتان گەیشتە یەکەم سوجدە لە نوێژی عەسر پێش ئەوەی خۆر ئاوا ببێت، ئەوە با نوێژەکەی تەواو بکات، ئەگەر گەیشتە یەکەم سوجدە لە نوێژی بەیانی پێش ئەوەی خۆر بێتەدەر، ئەوە با نوێژەکەی تەواو بکات».

## تَأْخِيرُ الْمَغْرِبِ

### دواخستنی نوێژی ئێوارە

٦٦. عَنْ أَبِي بَصْرَةَ الْغِفَارِيِّ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْعَصْرَ بِالْمُخَمَّصِ قَالَ: «إِنَّ هَذِهِ الصَّلَاةَ عُرِضَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَضَيَّعُوهَا، وَمَنْ حَافَظَ عَلَيْهَا كَانَ لَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ، وَلَا صَلَاةَ بَعْدَهَا حَتَّى يَطْلُعَ الشَّاهِدُ»، وَالشَّاهِدُ: النَّجْمُ.



ئەبو بەصرەی غیفاری رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسری بۆ کردین لە شوێنێک بە ناوی موخەممەص، فەرمووی: «بەڕاستی ئەم نوێژە فەرز کرا لەسەر (ئوممەتانی) پێش ئێوە، بەڵام پشتگوێیان خست و چواندیان، هەر کەسێك بیانپارێزێت دوو جار پاداشتی بۆ هەیە، لەدوای ئەوەش نوێژ نییە تا ئەستێرە دەردەکەون». (الشَّاهِد)، واتە: ئەستێرە.

## مَا يُسْتَحَبُّ مِنْ تَأْخِيرِ الْعِشَاءِ

### پەسندییەتی دواخستنی نوێژی عیشا

٦٧. عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُؤَخِّرُ الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ.

جابیری کوڕی سەمورە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای دوا دەخست

## آخِرُ وَقْتِ الْعِشَاءِ

### کۆتا کاتی نوێژی عیشا

٦٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: مَكَثْنَا ذَاتَ لَيْلَةٍ نَنْتَظِرُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِعِشَاءِ الْآخِرَةِ، فَخَرَجَ عَلَيْنَا حِينَ ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ أَوْ بَعْدَهُ فَقَالَ حِينَ خَرَجَ: «إِنَّكُمْ تَنْتَظِرُونَ صَلَاةً مَا يَنْتَظِرُهَا أَهْلُ دِينٍ غَيْرُكُمْ، وَلَوْلَا أَنْ يَثْقُلَ عَلَى أُمَّتِي لَصَلَّيْتُ بِهِمْ هَذِهِ السَّاعَةَ»، ثُمَّ أَمَرَ الْمُؤَذِّنَ فَأَقَامَ ثُمَّ صَلَّى.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: شەوێک ماینەوە چاوەڕوانمان کرد پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشامان بۆ بکات، لە کاتێکدا سێیەکی شەو تێپەڕیبوو، یان دوای سێیەکی شەو، جا هاتە دەرەوە بۆ لامان، فەرمووی: «ئێوە چاوەڕوانی نوێژێک دەکەن، شوێنکەوتووی هیچ ئایینێک چاوەڕوانی ناکات جگە لە ئێوە، ئەگەر قورس نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم، لەم کاتەدا نوێژم دەکرد»، پاشان فەرمانی کرد بە بانگدەر بانگی دا، پاشان نوێژی عیشای کرد.



## الْإِسْفَارُ

### نوێژی بەیانی لە کاتی ڕووناکبوونەوەی دونیا

٦٩. عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا أَسْفَرْتُمْ بِالْفَجْرِ فَإِنَّهُ أَعْظَمُ بِالْأَجْرِ».

مەحمودی کوڕی لەبید ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەرچەندە نوێژی بەیانیتان بە ڕووناکی کردبێت، ئەوە بێگومان پاداشتتان مەزنترە».

تێبینی:

لە زمانی عەرەبیدا وشەی: (أسْفَر) بە مانای (تَبَيَّن وانْكَشف) دێت، ڕوون بوویەوە و ئاشكرا بوو، بەپێی سیاق لێرەش دەردەكەوێ كە باسی كاتی ئەنجامدانی نوێژی بەیانییە لەو كاتەی دونیا ڕووناک دەبێتەوە.

## السَّاعاتُ الَّتِي نُهِيَ عَنِ الصَّلَاةِ فِيهَا

## ئەو كاتانەی ڕێگە نەدراوە نوێژیان تێدا بكرێت

٧٠. عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ الْجُهَنِيَّ ﵁ يَقُولُ: ثَلَاثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ أَوْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ، وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ.



عوقبەی كوڕی عامیری جوهەنی ﵁ دەڵێت: سێ كات هەیە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردووە لێیان نوێژی تێدا بكەین، یان مردووەكانمانی تێدا بنێژین: كاتێك خۆر دەردەچێت تا تەواو بەرز دەبێتەوە، كاتێك كەسێک هەڵدەستێت بۆ نوێژی نیوەڕۆ تا (خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان) دەترازێت و لادەدات، كاتێكیش خۆر لار دەبێتەوە بۆ ئاوابوون بەتەواوی دیار نامێنێ.

## الرخصة في الصلاة بعد العصر

## ڕێگەدان بە ئەنجامدانی نوێژی سوننەت لەدوای عەسر

٧١. عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﵁: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﵂ عَنِ السَّجْدَتَيْنِ اللَّتَيْنِ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّيهِمَا بَعْدَ الْعَصْرِ. فَقَالَتْ: إِنَّهُ كَانَ يُصَلِّيهِمَا قَبْلَ الْعَصْرِ، ثُمَّ إِنَّهُ شُغِلَ عَنْهُمَا

أَوْ نَسِيَهُمَا فَصَلَّاهُمَا بَعْدَ الْعَصْرِ، وَكَانَ إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَثْبَتَهَا.

ئەبو سەلەمە ﵁ دەگێڕێتەوە: پرسیاری کردووە لە عائیشە ﵂ دەربارەی ئەو دوو ڕکاتە (سوننەتە)ی کە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای نوێژی عەسر دەیکرد، گوتی: پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتی پێش نوێژی عەسر دەکرد، پاشان جارێک سەرقاڵ کرا، یان بیری چوویەوە دوای نوێژی عەسر کردیەوە، جا ئەگەر هەر نوێژێکی بکردایە لەسەری بەردەوام دەبوو.

## إِبَاحَةُ الصَّلَاةِ فِي السَّاعَاتِ كُلِّهَا بِمَكَّةَ

## ئەنجامدانی نوێژ لە مەککە لە هەموو کاتێکدا ڕەوایە



٧٢. عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، لَا تَمْنَعُوا أَحَدًا طَافَ بِهَذَا الْبَيْتِ وَصَلَّى أَيَّةَ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ».

جوبەیری کوڕی موتعیم ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەی نەوەکانی عەبدولمەناف، ڕێگری هیچ کەسێک مەکەن کە تەوافی کەعبە بکات، لە هەر کاتێک بیەوێت نوێژی تێدا بکات لە شەو بێت یاخود ڕۆژ».

## الْوَقْتُ الَّذِي يَجْمَعُ فِيهِ الْمُسَافِرُ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ

## ئەو کاتەی گەشتیار نوێژی نیوەڕۆ و عەسری تێدا کۆ دەکاتەوە

٧٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الظُّهْرَ إِلَى وَقْتِ الْعَصْرِ، ثُمَّ نَزَلَ فَجَمَعَ بَيْنَهُمَا، فَإِنْ زَاغَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَرْتَحِلَ صَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ رَكِبَ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر دەرچووبایە پێش ئەوەی خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لایدابایە، نوێژی نیوەڕۆی دوا دەخست بۆ لای نوێژی عەسر، پاشان دادەبەزی و هەردوو نوێژەکەی پێکەوە کۆ دەکردەوە، جا ئەگەر خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لایدابووایە پێش ئەوەی دەرچووبایە، نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، پاشان دەکەوتە ڕێ.

## الْحَالُ الَّتِي يُجْمَعُ فِيهَا بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ

### ئەو حاڵەتەی کە دوو نوێژیان تێدا کۆ دەکرێتەوە

٧٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا جَدَّ بِهِ السَّيْرُ جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك پەلەی ڕۆیشتنی بووایە نوێژی ئێوارە و عیشای کۆ دەکردەوە.

## الْجَمْعُ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ فِي الْحَضَرِ

### کۆکردنەوەی نێوان دوو نوێژ لە شوێنی نیشتەجێبوون

٧٥. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا مِنْ غَيْرِ خَوْفٍ وَلَا سَفَرٍ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە ئەنجام دا، ئێوارە و عیشاشی پێکەوە ئەنجام دا، بەبێ ئەوەی ترس هەبێت، بەبێ ئەوەی لە گەشت بێت.

## فَضْلُ الصَّلَاةِ لِمَوَاقِيتِهَا

### پێگەو گەورەیی نوێژ لە کاتی خۆیدا

٧٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ ﷻ؟ قَالَ: «إِقَامُ الصَّلَاةِ لِوَقْتِهَا، وَبِرُّ الْوَالِدَيْنِ، وَالْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ».

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ چ کردەوەیەک لە لای خوا ﷻ زۆر خۆشەویستە؟ فەرمووی: «ئەنجامدانی نوێژ لە کاتی خۆیدا، چاکبوون لەگەڵ دایک و باوک، تێکۆشان لەپێناو خوادا ﷻ».



## فِيمَنْ نَامَ عَنِ الصَّلَاةِ

### دەربارەی ئەو کەسەی دەخەوێت و بەئاگا نایەتەوە بۆ نوێژ

٧٧. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَرْقُدُ عَنِ الصَّلَاةِ أَوْ يَغْفُلُ عَنْهَا قَالَ: « كَفَّارَتُهَا أَنْ يُصَلِّيَهَا إِذَا ذَكَرَهَا».

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی کەسێکەوە دەخەوێت و بەئاگا نایەتەوە بۆ نوێژ، یان لێی بێئاگا دەبێت؟ فەرمووی: «کەفارەتی ئەوەیە ئەگەر بیری هاتەوە نوێژەکەی بکات».

## إِعَادَةُ مَنْ نَامَ عَنِ الصَّلَاةِ لِوَقْتِهَا مِنَ الْغَدِ

## قەزاکردنەوەی نوێژ لە هەمان کات لە ڕۆژی دواتر، بۆ ئەو کەسەی خەوتووە و خەبەری نەبۆتەوە

٧٨. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا نَامُوا عَنِ الصَّلَاةِ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَلْيُصَلِّهَا أَحَدُكُمْ مِنَ الْغَدِ لِوَقْتِهَا».

ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ (هاوەڵانی لە گەشتێک بوون) کە (شەو داهات) خەوتن، خەبەریان نەبوویەوە بۆ نوێژی بەیانی تا خۆر هەڵهات، فەرمووی: «با هەر یەکێکتان (کە نوێژی بەیانی لەدەست چووە) لە بەیانییەکەی دیکە ئەنجامی بدات لە کاتی خۆیدا».



## كَيْفَ يُقْضَى الْفَائِتُ مِنَ الصَّلَاةِ؟

## ئەو کەسەی نوێژی چووە چۆن نوێژەکەی قەزا دەکاتەوە؟

٧٩. عَنْ بُرَيْدِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ فَأَسْرَيْنَا لَيْلَةً، فَلَمَّا كَانَ فِي وَجْهِ الصُّبْحِ، نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَنَامَ وَنَامَ النَّاسُ، فَلَمْ يَسْتَيْقِظْ إِلَّا بِالشَّمْسِ قَدْ طَلَعَتْ عَلَيْنَا، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمُؤَذِّنَ، فَأَذَّنَ، ثُمَّ صَلَّى الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، ثُمَّ حَدَّثَنَا بِمَا هُوَ كَائِنٌ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ.

بوڕەیدەی کوڕی ئەبو مەڕیەم لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە گەشتێکدا، شەوێک شەوڕۆییمان کرد، کاتێك نزیکی بەرەبەیان بووینەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی خەوی لێکەوت، خەڵکەکەش خەویان لێکەوت، بەخەبەر نەهاتین هەتا کاتێك خۆر هەڵهاتبوو، (پێغەمبەری خوا

ﷺ كە بەخەبەر هات) فەرمانی بە بانگدەر کرد (بانگ بدات) ئەویش بانگی دا، پاشان دوو ڕکات (سوننەت)ی پێش نوێژی بەیانی کرد، ئینجا فەرمانی کرد قامەت بکرێت، دوایی نوێژی بۆ خەڵک کرد، پاشان فەرمایشتی فەرموو دەربارەی ئەوەی ڕوو دەدات هەتا ئەو ڕۆژەی قیامەت هەڵدەستێت.



# كِتَابُ الْأَذَانِ

# پەرتووكی بانگدان

## بَدْءُ الْأَذَانِ



## دەستپێكی بانگدان

٨٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: كَانَ الْمُسْلِمُونَ حِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ يَجْتَمِعُونَ فَيَتَحَيَّنُونَ الصَّلَاةَ وَلَيْسَ يُنَادِي بِهَا أَحَدٌ، فَتَكَلَّمُوا يَوْمًا فِي ذَلِكَ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: اتَّخِذُوا نَاقُوسًا مِثْلَ نَاقُوسِ النَّصَارَى وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ قَرْنًا مِثْلَ قَرْنِ الْيَهُودِ فَقَالَ: عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَوَلَا تَبْعَثُونَ رَجُلًا يُنَادِي بِالصَّلَاةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا بِلَالُ قُمْ فَنَادِ بِالصَّلَاةِ».

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: كاتێك موسوڵمانان هاتن بۆ مەدینە كۆ دەبوونەوە و چاوەڕێی نوێژیان دەكرد، هیچ كەسێك نەبوو بانگ بۆ نوێژ بدات، ڕۆژێكیان باسی ئەوەیان كرد، هەندێكیان گوتیان: با وەكوو گاورەكان زەنگێک بەكار بهێنین، هەندێكی دیكەیان گوتیان: بەڵكوو كەڕەنایەک وەكوو كەڕەنای جوولەكان، عومەر رضي الله عنه گوتی: ئەی بۆ كەسێک نانێرن بانگ بدات بۆ نوێژ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ

فەرمووی: «ئەی بیلال هەڵسە و بانگ بدە بۆ نوێژ».

## تَثْنِيَةُ الْأَذَانِ

### بانگدان دوو جار دوو جار

٨١. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِلَالاً أَنْ يَشْفَعَ الْأَذَانَ، وَأَنْ يُوتِرَ الْإِقَامَةَ.

ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە بیلال بە جووت جووت بانگ بدات، بە تاک تاکیش قامەت بکات.



## كَيْفَ الْأَذَانُ

### چۆنیەتی بانگدان

٨٢. عَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ ﵁ قَالَ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْأَذَانَ فَقَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ».

ئەبو مەحزورە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری بانگدانی کردم، فەرمووی: «اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه، حَيَّ عَلَى الصَّلَاة، حَيَّ عَلَى الصَّلَاة، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ».

## كَيْفَ يَصْنَعُ الْمُؤَذِّنُ فِي أَذَانِهِ؟

### بانگدەر لە کاتی بانگدان چی دەکات؟

٨٣. عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ ﵁ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَخَرَجَ بِلَالٌ فَأَذَّنَ فَجَعَلَ يَقُولُ فِي أَذَانِهِ هَكَذَا: يَنْحَرِفُ يَمِينًا وَشِمَالاً.

ئەبو جوحەیفە ﵁ دەڵێت: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، بیلال دەرچوو بانگی دا لە کاتی بانگداندا: بە لای ڕاست و چەپدا خۆی دەسووڕاندەوە.

## رَفْعُ الصَّوْتِ بِالْأَذَانِ

### بەرزکردنەوەی دەنگ لە کاتی بانگدان



٨٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ سَمِعَهُ مِنْ فَمِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْمُؤَذِّنُ يُغْفَرُ لَهُ بِمَدِّ صَوْتِهِ وَيَشْهَدُ لَهُ كُلُّ رَطْبٍ وَيَابِسٍ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: ئەو لە زاری پێغەمبەرەوە ﷺ بیستوویەتی کە دەیفەرموو: «بانگدەر داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکرێت بەدرێژایی دەنگی، وە هەموو تەڕ و وشکێک شایەتی بۆ دەدەن».

## التَّثْوِيبُ فِي أَذَانِ الْفَجْرِ

### گوتنی (التثويب) لە بانگی بەیانیدا

٨٥. عَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ ﵁ قَالَ: كُنْتُ أُؤَذِّنُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَكُنْتُ أَقُولُ فِي أَذَانِ

الْفَجْرِ الْأَوَّلِ: حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ.

ئەبو مەحزورە ﵁ دەڵێت: من بانگم دەدا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، لە بانگی یەکەمی بەیانیدا دەمگوت: (حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ).

تێبینی:

(التَّثْويب): بریتییە لە وتنی ڕستەی: (الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ) لە بانگی یەکەمی بەیانیدا.



## الْأَذَانُ لِمَنْ جَمَعَ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ بَعْدَ ذَهَابِ وَقْتِ الْأُولَى مِنْهُمَا

## بانگدان بۆ کەسێک دوو نوێژی کۆ کردبێتەوە لەدوای نەمانی کاتی یەکەمی ئەو دوو نوێژە

٨٦. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: دَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى انْتَهَى إِلَى الْمُزْدَلِفَةِ فَصَلَّى بِهَا الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاء بِأَذَانٍ وَإِقَامَتَيْنِ، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئًا.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە (لە عەرەفە) تا گەیشتە موزدەلیفە، نوێژی ئێوارە و عیشای لەوێ کرد بە یەک بانگ و دوو قامەت، لە نێوانیاندا هیچ نوێژێکی دیکەی نەکرد.

تێبینی:

(دَفَع): واتە: گەڕایەوە، یان دابەزی.

## الْإِقَامَةُ لِمَنْ نَسِيَ رَكْعَةً مِنْ صَلَاةٍ

### قامەتکردن بۆ کەسێک کە ڕکاتێکی لە نوێژ لەبیر چووبێت

٨٧. عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ حُدَيْجٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى يَوْمًا فَسَلَّمَ وَقَدْ بَقِيَتْ مِنَ الصَّلَاةِ رَكْعَةٌ، فَأَدْرَكَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: نَسِيتَ مِنَ الصَّلَاةِ رَكْعَةً فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ وَأَمَرَ بِلَالًا فَأَقَامَ الصَّلَاةَ، فَصَلَّى لِلنَّاسِ رَكْعَةً، فَأَخْبَرْتُ بِذَلِكَ النَّاسَ، فَقَالُوا لِي: أَتَعْرِفُ الرَّجُلَ؟ قُلْتُ: لَا، إِلَّا أَنْ أَرَاهُ، فَمَرَّ بِي، فَقُلْتُ: هَذَا هُوَ، قَالُوا: هَذَا طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ.

موعاویەی کوڕی حودەیج ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک نوێژی کرد، کە سەلامی دایەوە، یەک ڕکات لە نوێژەکە مابوو، پیاوێک پێی گەیشت گوتی: یەک ڕکاتت لە نوێژەکە بیر چوو، (پێغەمبەریش ﷺ) چووە مزگەوت و فەرمانی بە بیلال کرد قامەتی نوێژی بۆ کرد، یەک ڕکات نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، ئەو هەواڵەم بە خەڵکی گەیاند، پێیان گوتم: ئایا ئەو پیاوە دەناسیت؟ گوتم: نەخێر، مەگەر بیبینم، دواتر تێپەڕی بەلامدا، گوتم: ئەو پیاوە خۆیەتی، گوتیان: ئەوە تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵایە.



## الْأَذَانُ لِمَنْ يُصَلِّي وَحْدَهُ

### بانگدان بۆ ئەو کەسەی بەتەنها نوێژ دەکات

٨٨. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «يَعْجَبُ رَبُّكَ مِنْ رَاعِي غَنَمٍ فِي رَأْسِ شَظِيَّةِ الْجَبَلِ يُؤَذِّنُ بِالصَّلَاةِ وَيُصَلِّي، فَيَقُولُ اللَّهُ ﷻ: انْظُرُوا إِلَى عَبْدِي هَذَا يُؤَذِّنُ وَيُقِيمُ الصَّلَاةَ يَخَافُ مِنِّي، قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي وَأَدْخَلْتُهُ الْجَنَّةَ».

عوقبەی کوڕی عامیر ﵁ دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو:

«پەروەردگارت زۆری پێخۆشە کاتێك شوانی مەڕومالآت لە تەپۆڵکەیەکی سەر شاخێک بانگ دەدات بۆ نوێژکردن و نوێژ دەکات، خوای زاڵی پایەدار دەفەرمووێت: تەماشای ئەم بەندەیەم بکەن بانگ دەدات و نوێژ بەجێ دەهێنێت و لە من دەترسێت، بێگومان ئەوە منیش لەو بەندەیەم خۆش بووم و خستمە نێو بەهەشتەوە».

## اتِّخَاذُ الْمُؤَذِّنِ الَّذي لَا يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْرًا

### دانانی بانگدەرێک کرێ لەبری بانگەکەی وەرنەگرێت

٨٩. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ ﵁ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اجْعَلْنِي إِمَامَ قَوْمِي، فَقَالَ: «أَنْتَ إِمَامُهُمْ، وَاقْتَدِ بِأَضْعَفِهِمْ، وَاتَّخِذْ مُؤَذِّنًا لَا يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْرًا».



عوسمانی کوڕی ئەبو عاص ﵁ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بمکە بە ئیمامی خەڵکەکەم، فەرمووی: «تۆ ئیمامیانی، بەپێی لاوازترینیان نوێژیان بۆ بکە، (نوێژەکە سووک و ئاسان بکە)، بانگدەرێک دابنێ با لەبری بانگدانەکەی کرێ وەرنەگرێت».

## الْقَوْلُ مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ

### بانگدەر چی گوت وەک ئەو دووبارە دەکرێتەوە

٩٠. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر گوێتان لە بانگ بوو، بانگدەر چی گوت، وەکوو ئەو دووبارە بیڵێنەوە».

## الدُّعَاءُ عِنْدَ الْأَذَانِ

### پاڕانەوە لە کاتی بانگدان

٩١. عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رضي الله عنه عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَبِالْإِسْلَامِ دِيناً، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ».

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك کاتێك گوێی لە بانگ دەبێت بڵێت: (وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبّاً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً)، واتە: منیش شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوای تاک و تەنها هیچ هاوبەشی نییە، موحەممەدیش بەندە و پێغەمبەری خوایە، ڕازی بووم بەوەی خوا پەروەردگارم بێت، موحەممەدیش پێغەمبەرم بێت، ئیسلامیش ئایینم بێت، لە گوناهەکانی دەبووردرێت».



٩٢. عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ. آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ الْمَقَامَ الْمَحْمُودَ الَّذِي وَعَدْتَهُ إِلَّا حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

جابیر رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس گوێی لە بانگ بێت (کە تەواو بوو) بڵێت: (اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِه الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّداً الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ الْمَقَامَ الْمَحْمُودَ الَّذِي وَعَدْتَهُ)، واتە: ئەی پەروەردگاری خاوەن ئەم بانگەوازە تەواوە و ئەم نوێژە ڕاگیراوە کە دەکرێت، وەسیلە و فەزیلە ببەخشە بە موحەممەد ﷺ، بیگەیەنەرە ئەو شوێنە سوپاسگوزارییە کە پەیانت پێ داوە، حەتمەن ئەوە شەفاعەتی منی بۆ حەڵاڵ دەبێت».

## الصَّلَاةُ بَيْنَ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ

### نوێژی سوننەت لە نێوان بانگ و قامەتدا

٩٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ. بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ. بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ لِمَنْ شَاءَ».

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە نێوان دوو بانگدا نوێژێکی (سوننەت) هەیە، لە نێوان دوو بانگدا نوێژێکی (سوننەت) هەیە، لە نێوان دوو بانگدا نوێژێکی (سوننەت) هەیە بۆ ئەو کەسەی بیەوێت (نوێژ ئەنجام بدات)».



## إِقَامَةُ الْمُؤَذِّنِ عِنْدَ خُرُوجِ الْإِمَامِ

### قامەتکردنی بانگدەر لە کاتی دەرچوونی پێشنوێژ یان ئیمام

٩٤. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَلَا تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي خَرَجْتُ».

ئەبو قەتادە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەگەر قامەت بۆ نوێژ کرا هەڵمەستن هەتا من دەبینن کە دەرچووم لە ماڵ (و دێمە نێو مزگەوت)».



# كِتَابُ الْمَسَاجِدِ

## پەرتووكی مزگەوتەكان

### الْمُبَاهَاةُ فِي الْمَسَاجِدِ

### شانازی و خۆهەڵكیشان بە دروستكردنی مزگەوت



٩٥. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ: أَنْ يَتَبَاهَى النَّاسُ فِي الْمَسَاجِدِ».

ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی ڕۆژی دوایی ئەوەیە: خەڵك شانازی دەكەن بەسەر یەكدی بە دروستكردنی مزگەوتەكان».

### ذِكْرُ أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ أَوَّلاً؟

### باسی ئەوەی كام مزگەوت یەكەم جار دروست كرا؟

٩٦. عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: كُنْتُ أَقْرَأُ عَلَى أَبِي الْقُرْآنَ فِي السِّكَّةِ، فَإِذَا قَرَأْتُ السَّجْدَةَ سَجَدَ،

فَقُلْتُ: يَا أَبَتِ، أَتَسْجُدُ فِي الطَّرِيقِ؟ فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ ﵁ يَقُولُ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ أَوَّلًا؟ قَالَ: «الْمَسْجِدُ الْحَرَامُ»، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «الْمَسْجِدُ الْأَقْصَى»، قُلْتُ: وَكَمْ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: «أَرْبَعُونَ عَامًا، وَالْأَرْضُ لَكَ مَسْجِدٌ فَحَيْثُمَا أَدْرَكْتَ الصَّلَاةَ فَصَلِّ».

ئیبڕاهیم دەڵێت: من قورئانم بۆ باوکم دەخوێندەوە لە (السِّكَّة) ئەگەر ئایەتی سوجدەم بخوێندایە سوجدەی دەبرد، گوتم: ئەی باوکە، ئایا لە ڕێگاش سوجدە دەبەی؟ گوتی: من گوێم لە ئەبو زەڕ ﵁ بوو دەیگوت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ: کام مزگەوت یەکەم جار دروست کرا؟ فەرمووی: «مزگەوتی حەڕام»، گوتم: پاشان کامە؟ فەرمووی: «مزگەوتی ئەقصا»، گوتم: نێوانیان چەند بوو (لە دروستکردندا)؟ فەرمووی: «چل ساڵ، زەویش بۆ تۆ مزگەوتە لە هەر شوێنێک کاتی نوێژ هات نوێژەکەت بکە».



## فَضْلُ مَسْجِدِ قُبَاءَ وَالصَّلَاةِ فِيهِ

## پێگە و گەورەیی مزگەوتی قوباء و نوێژکردن تێیدا

٩٧. عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ خَرَجَ حَتَّى يَأْتِيَ هَذَا الْمَسْجِدَ (مَسْجِدَ قُبَاءَ) فَصَلَّى فِيهِ كَانَ لَهُ عَدْلَ عُمْرَةٍ».

سەهلی کوڕی حونەیف ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەوەی دەربچێت تا دەگاتە ئەم مزگەوتە (مزگەوتی قوباء) نوێژی تێدا بکات، ئەوە وەک ئەوە وایە عومرەیەکی کردبێت».

## مَا تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَيْهِ مِنَ الْمَسَاجِدِ

### بارگەوبنە پێچانەوە بە مەبەستی گەشتکردن بۆ مزگەوتەکان

٩٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ: مَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَسْجِدِي هَذَا وَمَسْجِدِ الْأَقْصَى».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بارگەوبنە ناپێچرێتەوە (بە مەبەستی گەشتکردن بۆ هیچ مزگەوتێک و دەستکەوتنی پاداشتی زۆر) جگە لە سێ مزگەوت: مزگەوتی حەرام، ئەم مزگەوتەی من، مزگەوتی ئەقصا».

## النَّهْيُ عَنِ اتِّخَاذِ الْقُبُورِ مَسَاجِدَ

### قەدەغەکردنی ئەوەی کە گۆڕەکان بکرێن بە مزگەوت

٩٩. عَن عَائِشَةَ وَابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَا: لَمَّا نُزِلَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَطَفِقَ يَطْرَحُ خَمِيصَةً لَهُ عَلَى وَجْهِهِ، فَإِذَا اغْتَمَّ كَشَفَهَا عَنْ وَجْهِهِ قَالَ وَهُوَ كَذَلِكَ:«لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ».

عائیشەو ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێن: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش دەکەوت، قوماشێکی خەتداری بەسەر ڕوخساریدا دەدا، هەر کاتێکیش نارەحەت بووایە دەموچاوی دەردەخست، بەو حاڵەوەش بوو، فەرمووی: «نەفرینی خوا لە جوولەکە و گاورەکان گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کرد بە مزگەوت».

## الْفَضْلُ فِي إِتْيَانِ الْمَسَاجِدِ

## پێگە و گەورەیی چوونە مزگەوتان

١٠٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «حِينَ يَخْرُجُ الرَّجُلُ مِنْ بَيْتِهِ إِلَى مَسْجِدِهِ، فَرِجْلٌ تُكْتَبُ حَسَنَةً وَرِجْلٌ تَمْحُو سَيِّئَةً».

ئەبو هورەیرە رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «کاتێك پیاوێک دەردەچێت لە ماڵ بۆ مزگەوت، بە هەر هەنگاوێکی چاکەی بۆ دەنووسرێت، وە بە هەر هەنگاوێکی دیکەی گوناهی لێ دەسڕدرێتەوە».

## النَّهْيُ عَنْ مَنْعِ النِّسَاءِ عَنْ إِتْيَانِ الْمَسَاجِدِ



## قەدەغەکردن لە ڕێگریکردن لە چوونی ئافرەتان بۆ مزگەوتەکان

١٠١. عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِذَا اسْتَأْذَنَتِ امْرَأَةُ أَحَدِكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَلَا يَمْنَعْهَا».

سالیم لە باوکیەوە رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «ئەگەر خێزانی هەر یەکێکتان داوای مۆڵەتی کرد بۆ مزگەوت، با ڕێگری نەکات (مۆڵەتی پێ بدات)».

## إِدْخَالُ الصِّبْيَانِ الْمَسَاجِدَ

## هێنانی منداڵان بۆ مزگەوت

١٠٢. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَقُولُ: بَيْنَا نَحْنُ جُلُوسٌ فِي الْمَسْجِدِ، إِذْ خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ

اللَّهِ ﷺ يَحْمِلُ أُمَامَةَ بِنْتَ أَبِي الْعَاصِ بْنِ الرَّبِيعِ وَأُمُّهَا زَيْنَبُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهِيَ صَبِيَّةٌ، يَحْمِلُهَا فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهِيَ عَلَى عَاتِقِهِ يَضَعُهَا إِذَا رَكَعَ، وَيُعِيدُهَا إِذَا قَامَ حَتَّى قَضَى صَلَاتَهُ يَفْعَلُ ذَلِكَ بِهَا.

ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێت: لە کاتێکدا ئێمە دانیشتبووین لە مزگەوتدا، لەناکاو پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە ئومامەی کچی ئەبو عاصی کوڕی ڕەبیعەی لە باوەشدا بوو، دایکیشی زەینەبی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، ئومامە کچێکی بچووک بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵیدەگرت و نوێژی دەکرد ئەو لەسەر شانی بوو، ئەگەر چووبایە ڕکووع دایدەنا، ئەگەر هەڵسابایەوە دەیخستەوە سەر شانی، تا نوێژەکەی تەواو کرد بەو شێوەیەی دەکرد.

## الْقَوْلُ عِنْدَ دُخُولِ الْمَسْجِدِ وَعِنْدَ الْخُرُوجِ مِنْهُ



### نزای چوونە نێو مزگەوت و هاتنە دەرەوە لێی

١٠٣. عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا حُمَيْدٍ وَأَبَا أُسَيْدٍ ﷺ يَقُولَانِ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ».

عەبدولمەلیکی کوڕی سەعید دەڵێت: گوێم لێ بوو ئەبو حومەید و ئەبو ئوسەید ﷺ دەیانگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەگەر یەکێک لە ئێوە چووە نێو مزگەوتەوە با بڵێ: خوایە دەرگاکانی بەزەیی خۆتم بۆ بکەوە، ئەگەر دەرچوو (لە مزگەوت) با بڵێ: خوایە من داوای فەزڵ و چاکەی تۆ دەکەم».

## الْأَمْرُ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْجُلُوسِ فِيهِ

### فەرمان بە نوێژکردن پێش دانیشتن لە مزگەوت

١٠٤. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ».

ئەبو قەتادە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێک لە ئێوە چووە نێو مزگەوتەوە با دوو ڕکات نوێژ بکات، پێش ئەوەی دابنیشێت».

# كِتَابُ الْقِبْلَةِ

## پەرتووكی ڕووگە

### بَابُ اسْتِقْبَالِ الْقِبْلَةِ

باسی ڕووكردنە ڕووگە



١٠٥. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁ قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ، فَصَلَّى نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا، ثُمَّ وُجِّهَ إِلَى الْكَعْبَةِ. فَمَرَّ رَجُلٌ قَدْ كَانَ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى قَوْمٍ مِنَ الْأَنْصَارِ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ وُجِّهَ إِلَى الْكَعْبَةِ، فَانْحَرَفُوا إِلَى الْكَعْبَةِ.

بەڕائی كوڕی عازیب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە نوێژی كرد ڕووەو بەیتولمەقدیس (قودس) بۆ ماوەی شازدە مانگ، پاشان ڕووی كردە كەعبە، پیاوێک كە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی كردبوو ڕووەو كەعبە، تێپەڕی بە لای خەڵكێک لە ئەنصارەكان (نوێژیان دەكرد)، گوتی: خوا دەكەم بە شایەد پێغەمبەر ﷺ ڕووی پێ وەرچەرخێنرا بۆ كەعبە (بۆ نوێژكردن) ئەوانیش ڕاستەوخۆ ڕوویان وەرگێڕا و ڕوویان كردە كەعبە.

## الْأَمْرُ بِالدُّنُوِّ مِنَ السُّتْرَةِ

### فەرمانکردن بە نزیکبوونەوە لە بەربەست، یان سوترە

١٠٦. عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى سُتْرَةٍ فَلْيَدْنُ مِنْهَا لَا يَقْطَعَ الشَّيْطَانُ عَلَيْهِ صَلَاتَهُ».

سەهلی کوڕی ئەبو حەسمە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر کەسێک لە ئێوە نوێژی کرد لەلای بەربەستێک با نزیک بێتەوە لێی، تا شەیتان نوێژەکەی پێ نەبڕێت. (نەوەک شەیتان خوتخوتەی بۆ دروست بکات و نوێژەکەی لێ تێک بدات)».



## التَّشْدِيدُ فِي الْمُرُورِ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي وَبَيْنَ سُتْرَتِهِ

### هەڕەشەکردن لە تێپەڕبوون بە بەردەمی نوێژ خوێن و سوترەکەی

١٠٧. عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ: أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ أَرْسَلَهُ إِلَى أَبِي جُهَيْمٍ رضي الله عنه يَسْأَلُهُ: مَاذَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: فِي الْمَارِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي، فَقَالَ أَبُو جُهَيْمٍ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ».

بوسری کوڕی سەعید دەگێڕێتەوە: زەیدی کوڕی خالید ناردی بۆ لای ئەبو جوهەیم رضي الله عنه پرسیاری لێ بکات: چی بیستووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی بە بەردەمی نوێژ خوێندا تێدەپەڕێت، ئەبو جوهەیم گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەگەر ئەو کەسەی بە بەردەمی نوێژ خوێندا تێدەپەڕێت بیزانیایە چەندە گوناهی لەسەرە، ئەوە چل (ڕۆژ یان مانگ یان ساڵ) بوەستایە چاکتر بوو بۆی

لەوەی بە بەردەمیدا تێپەڕ ببێت».

## الرُّخْصَةُ فِي الصَّلَاةِ خَلْفَ النَّائِمِ

### ڕێگەدان بە نوێژکردن لەپشت کەسی خەوتووەوە

١٠٨. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ وَأَنَا رَاقِدَةٌ مُعْتَرِضَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ عَلَى فِرَاشِهِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يُوتِرَ أَيْقَظَنِي فَأَوْتَرْتُ.

عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ شەونوێژی دەکرد، منیش ڕاکشابووم لەسەر جێگاکەی و بووبوومە بەربەست لە نێوان ئەو و قیبلەدا، هەر کاتێک بیویستایە نوێژی ویتر بکات هەڵیدەستاندم، جا منیش ویترم دەکرد.



## النَّهْيُ عَنِ الصَّلَاةِ إِلَى الْقَبْرِ

### قەدەغەی نوێژکردن لە بەردەم گۆڕ

١٠٩. عَنْ أَبِي مَرْثَدٍ الْغَنَوِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُصَلُّوا إِلَى الْقُبُورِ وَلَا تَجْلِسُوا عَلَيْهَا».

ئەبو مەرسەدی غەنەوی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لەبەردەم گۆڕەکاندا نوێژ مەکەن و لەسەریشیان دامەنیشن».

## الْمُصَلِّي يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْإِمَامِ سُتْرَةٌ

## لە نێوانی نوێژخوێن و ئیمامدا بەربەست هەیە

١١٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَصِيرَةٌ يَبْسُطُهَا بِالنَّهَارِ وَيَحْتَجِرُهَا بِاللَّيْلِ فَيُصَلِّي فِيهَا، فَفَطِنَ لَهُ النَّاسُ فَصَلَّوْا بِصَلَاتِهِ وَبَيْنَهُ وَبَيْنَهُمُ الْحَصِيرَةُ فَقَالَ: «اكْلُفُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ؛ فَإِنَّ اللَّهَ ﷯ لَا يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا، وَإِنَّ أَحَبَّ الْأَعْمَالِ إِلَى اللَّهِ ﷯ أَدْوَمُهُ وَإِنْ قَلَّ». ثُمَّ تَرَكَ مُصَلَّاهُ ذَلِكَ فَمَا عَادَ لَهُ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ ﷯، وَكَانَ إِذَا عَمِلَ عَمَلًا أَثْبَتَهُ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ حەسیرێکی هەبوو بە ڕۆژ ڕایدەخست و بە شەویش دەیکرد بە ژوور و نوێژی تێدا دەکرد، خەڵکی پێیان زانی، بە نوێژی پێغەمبەر ﷺ نوێژیان کرد، لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و خەڵکدا تەنها ئەو حەسیرە بوو، فەرمووی: «چی لە تواناتاندا هەیە لە کردەوە ئەنجامی بدەن، چونکە بەڕاستی خوا ﷯ بێزار نابێت تا ئێوە بێزار نەبن، بەڕاستی چاکترین کردەوە لەلای خوا ﷯ بەردەوامبوونە لەسەری ئەگەرچی کەمیش بێت». پاشان وازی لە شوێنی نوێژەکەی هێنا نەگەڕایەوە بۆی هەتا خوا ﷯ ڕووحی لێ وەرگرتەوە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) ئەگەر کردەوەیەکی بکردایە بەردەوام دەبوو لەسەری.

## صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ عَلَى عَاتِقِهِ مِنْهُ شَيْءٌ

## پیاو بە پۆشاکێک نوێژ بکات هیچ شتێک لە پۆشاکەکە بەسەر شانیەوە نەبێ

١١١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُصَلِّيَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ عَلَى عَاتِقِهِ مِنْهُ شَيْءٌ».

ئەبو هوڕەیرە ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «با هیچ یەکێک لە ئێوە بە یەک پۆشاکەوە نوێژ نەکات و هیچ (شتێکیش لە پۆشاکەکە) بەسەر شانیەوە نەبێت».



# كِتَابُ الْإِمَامَةِ

## پەرتووکی پێشنوێژی و نوێژی بەکۆمەڵ

### الصَّلَاةُ مَعَ أَئِمَّةِ الْجَوْرِ

### نوێژکردن لەگەڵ پێشەوایانی ستەمکار



١١٢. عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ الْبَرَاءِ قَالَ: أَخَّرَ زِيَادٌ الصَّلَاةَ فَأَتَانِي ابْنُ صَامِتٍ فَأَلْقَيْتُ لَهُ كُرْسِيًّا فَجَلَسَ عَلَيْهِ، فَذَكَرْتُ لَهُ صُنْعَ زِيَادٍ فَعَضَّ عَلَى شَفَتَيْهِ وَضَرَبَ عَلَى فَخِذِي وَقَالَ: إِنِّي سَأَلْتُ أَبَا ذَرٍّ ﵁ كَمَا سَأَلْتَنِي فَضَرَبَ فَخِذِي كَمَا ضَرَبْتُ فَخِذَكَ وَقَالَ: إِنِّي سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَمَا سَأَلْتَنِي فَضَرَبَ فَخِذِي كَمَا ضَرَبْتُ فَخِذَكَ فَقَالَ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ: «صَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ أَدْرَكْتَ مَعَهُمْ فَصَلِّ وَلَا تَقُلْ: إِنِّي صَلَّيْتُ فَلَا أُصَلِّي».

ئەبو عالیەی بەڕاء دەڵێت: زیاد نوێژی دوا خست ئیبن صامیت هات بۆ لام کورسییەکم بۆی هێنا لەسەری دانیشت، ئەوەی زیاد کردی بۆم باس کرد، لێوی خۆی گەست و کێشای بە ڕانمدا، گوتی: من پرسیارم کرد لە ئەبو زەڕ ﵁ وەک چۆن تۆ پرسیارت لێ کردم، دای بەسەر ڕانمدا، وەک چۆن دام بەسەر ڕانتدا، گوتی:

پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ وەک چۆن پرسیارت لێ کردم، دای بەسەر ڕانمدا، وەک چۆن دام بەسەر ڕانتدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «(ئەگەر گەیشتی بە کەسانێک نوێژیان دوا خست)، تۆ لە کاتی خۆیدا نوێژەکانت ئەنجام بدە، ئەگەر (دوای نوێژکردنەکەت) گەیشتی پێیاندا (ئەوان تازە نوێژی بەکۆمەڵیان دەکرد) نوێژ بکە، مەڵێ: نوێژم کرد نوێژ ناکەمەوە».

## مَنْ أَحَقُّ بِالْإِمَامَةِ

### کێ لەپێشتر و شاییستەترە بۆ پێشنوێژیکردن

١١٣. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ، فَإِنْ كَانُوا فِي الْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ فِي الْهِجْرَةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي الْهِجْرَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ سِنًّا، وَلَا تَؤُمَّ الرَّجُلَ فِي سُلْطَانِهِ وَلَا تَقْعُدْ عَلَى تَكْرِمَتِهِ إِلَّا أَنْ يَأْذَنَ لَكَ».

ئەبو مەسعوود رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دەبێ شارەزاترینی خەڵکی بە پەرتووکی خوا پێشنوێژییان بۆ بکات، (ئەو کەسەی شارەزاترینە بە خوێندنی قورئان)، ئەگەر لە خوێندنی قورئاندا یەکسان بوون، ئەوەیان پێش دەخرێ کە پێشتر کۆچی کردووە (لە مەککە بۆ مەدینە)، ئەگەر لە کۆچکردنیشدا وەک یەکدی بوون، شارەزاترینیان بە سوننەت پێش دەخرێت، ئەگەر لە سوننەتیشدا یەکسان بوون بەتەمەنترینیان پێش دەخرێت، وە پێشنوێژی بۆ کەسێک مەکە لە ماڵ و شوێنی خۆی، وە دامەنیشە لەسەر جێگاکەی تا مۆڵەتت پێ نەدات».

## اجْتِمَاعُ الْقَوْمِ فِي مَوْضِعٍ هُمْ فِيهِ سَوَاءٌ

### کۆبوونەوەی خەڵکانێک لە شوێنێکدا هەموویان تیایدا وەکوو یەکدی بن

١١٤. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانُوا ثَلَاثَةً فَلْيَؤُمَّهُمْ أَحَدُهُمْ وَأَحَقُّهُمْ بِالْإِمَامَةِ أَقْرَؤُهُمْ».

ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر سێ کەس بوون با یەکێکیان پێشنوێژییان بۆ بکات، شیاوترینیان بە پێشنوێژی خوێندەوارترینیانە (بە قورئان)».

## اجْتِمَاعُ الْقَوْمِ وَفِيهِمُ الْوَالِي

### کۆبوونەوەی خەڵکانێک دەسەڵاتداریان لەگەڵ بێت



١١٥. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُؤَمُّ الرَّجُلُ فِي سُلْطَانِهِ وَلَا يُجْلَسُ عَلَى تَكْرِمَتِهِ إِلَّا بِإِذْنِهِ».

ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «با پیاوێک پێشنوێژی نەکات بۆ پیاوێک لە شوێنی دەسەڵاتەکەی، هەروەها لەسەر جێگاکەی دانەنیشێت بەبێ پرسپێکردنی».

## صَلَاةُ الْإِمَامِ خَلْفَ رَجُلٍ مِنْ رَعِيَّتِهِ

## نوێژکردنی ئیمام لەدوای یەکێک لە نوێژخوێنەکانی

١١٦. عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: آخِرُ صَلَاةٍ صَلَّاهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَعَ الْقَوْمِ صَلَّى فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُتَوَشِّحًا خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ.

ئەنەس رضي الله عنه دەڵێت: کۆتا نوێژ پێغەمبەری خوا ﷺ کردی لەگەڵ خەڵکەکە بە یەک پارچە پۆشاکەوە نوێژی کرد لکەکانی لەسەر سینگی بەستبوو لەپشت ئەبو بەکرەوە رضي الله عنه.

## إِمَامَةُ الْأَعْمَى



## پێشنوێژیکردنی کەسی نابینا

١١٧. عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ: أَنَّ عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ رضي الله عنه كَانَ يَؤُمُّ قَوْمَهُ وَهُوَ أَعْمَى، وَأَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهَا تَكُونُ الظُّلْمَةُ وَالْمَطَرُ وَالسَّيْلُ وَأَنَا رَجُلٌ ضَرِيرُ الْبَصَرِ فَصَلِّ يَا رَسُولَ اللَّهِ فِي بَيْتِي مَكَانًا أَتَّخِذُهُ مُصَلًّى، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ لَكَ؟»، فَأَشَارَ إِلَى مَكَانٍ مِنَ الْبَيْتِ فَصَلَّى فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ.

مەحمودی کوڕی ڕەبیع دەگێڕێتەوە: عیتبانی کوڕی مالیک رضي الله عنه پێشنوێژیی بۆ خەڵکەکەی دەکرد و کوێریش بوو، بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: هەندێ جار تاریکی و باران و لافاو دروست دەبێت، منیش پیاوێکی نابینام (لەو کاتانە ناتوانم بچم بۆ مزگەوت)، ئەی پێغەمبەری خوا لە شوێنێکی ماڵەکەمدا نوێژ بکە، با بیکەم بە شوێنی نوێژ تێداکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ هات و فەرمووی: «کوێت پێ خۆشە

نوێژی تێدا بکەم؟»، ئاماژەی کرد بۆ شوێنێک لە ماڵەکەیدا، پێغەمبەریش ﷺ نوێژی تێدا کرد.

## إِمَامَةُ الْغُلَامِ قَبْلَ أَنْ يَحْتَلِمَ

## پێشنوێژیی منداڵ پێش باڵغبوونی

١١٨. عَنْ عَمْرُو بْنِ سَلَمَةَ الْجَرْمِيُّ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ يَمُرُّ عَلَيْنَا الرُّكْبَانُ فَنَتَعَلَّمُ مِنْهُمُ الْقُرْآنَ، فَأَتَى أَبِي النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «لِيَؤُمَّكُمْ أَكْثَرُكُمْ قُرْآنًا»، فَجَاءَ أَبِي فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لِيَؤُمَّكُمْ أَكْثَرُكُمْ قُرْآنًا»، فَنَظَرُوا فَكُنْتُ أَكْثَرَهُمْ قُرْآنًا، فَكُنْتُ أَؤُمُّهُمْ وَأَنَا ابْنُ ثَمَانِ سِنِينَ.

عەمڕی کوڕی سەلەمەی جەڕمی رضي الله عنه دەڵێت: سوارەکان تێدەپەڕین بەلاماندا، ئێمەش قورئان فێر دەبووین لێیانەوە، (دیارە ئەوان ماڵیان لە جێگایەک بووە ئاوی تێدا بووە، هاوەڵانی بەسەفەر دەهاتن و دەڕۆیشتن لەوێ نوێژیان دەکرد، دەڵێت:) باوکم هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەر ﷺ) پێی فەرموو: «با ئەو کەسەتان پێشنوێژیتان بۆ بکات کە زۆرترین قورئانی لەبەرە»، باوکیشم هات گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «با کەسێکتان پێشنوێژیتان بۆ بکات کە زۆرترین قورئانی لەبەر بێت»، تەماشایان کرد من زۆرترین قورئانم لەبەر بوو، بۆیە من پێشنوێژیم بۆ دەکردن و (ئەو کاتە) تەمەنم هەشت ساڵ بوو.

## الْإِمَامُ تَعْرِضُ لَهُ الْحَاجَةُ بَعْدَ الْإِقَامَةِ

## کاتێك ئیمام کارێکی بۆ دێتە پێش دوای قامەت

١١٩. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَجِيٌّ لِرَجُلٍ فَمَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ حَتَّى نَامَ الْقَوْمُ.

ئەنەس ﵁ دەڵێت: قامەت کرا بۆ نوێژ، پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ کەسێکدا قسەی دەکرد نەهات بۆ نوێژ هەتا خەڵکەکە خەویان لێکەوت.

## اسْتِخْلَافُ الْإِمَامِ إِذَا غَابَ

## شوێنگرەوەی ئیمام ئەگەر ئامادە نەبوو

١٢٠. عَنْ سَهْلِ بْنُ سَعْدٍ ﵁: كَانَ قِتَالٌ بَيْنَ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَتَاهُمْ لِيُصْلِحَ بَيْنَهُمْ، ثُمَّ قَالَ لِبِلَالٍ: «يَا بِلَالُ إِذَا حَضَرَ الْعَصْرُ وَلَمْ آتِ فَمُرْ أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ»، فَلَمَّا حَضَرَتْ أَذَّنَ بِلَالٌ ثُمَّ أَقَامَ، فَقَالَ لِأَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: تَقَدَّمْ، فَتَقَدَّمَ أَبُو بَكْرٍ فَدَخَلَ فِي الصَّلَاةِ، ثُمَّ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَجَعَلَ يَشُقُّ النَّاسَ حَتَّى قَامَ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ وَصَفَّحَ الْقَوْمُ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ إِذَا دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ لَمْ يَلْتَفِتْ، فَلَمَّا رَأَى أَبُو بَكْرٍ التَّصْفِيحَ لَا يُمْسِكُ عَنْهُ الْتَفَتَ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ، فَحَمِدَ اللَّهَ ﷻ عَلَى قَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَهُ: «امْضِهْ»، ثُمَّ مَشَى أَبُو بَكْرٍ الْقَهْقَرَى عَلَى عَقِبَيْهِ فَتَأَخَّرَ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تَقَدَّمَ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ قَالَ: «يَا أَبَا بَكْرٍ مَا مَنَعَكَ إِذْ أَوْمَأْتُ إِلَيْكَ أَنْ لَا تَكُونَ مَضَيْتَ؟»، فَقَالَ: لَمْ يَكُنْ لِابْنِ أَبِي قُحَافَةَ أَنْ يَؤُمَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ. وَقَالَ لِلنَّاسِ: «إِذَا نَابَكُمْ شَيْءٌ فَلْيُسَبِّحِ الرِّجَالُ، وَلْيُصَفِّحِ النِّسَاءُ».

سەهلی کوڕی سەعد ﵁ دەڵێت: لە نێوان نەوەکانی عەمری کوڕی عەوف شەڕ و ئاژاوەیەک ڕووی دا، هەواڵ گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ ئەویش نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان هات بۆ لایان بۆ ئەوەی نێوانیان چاک بکات، پاشان بە

بیلالی فەرمووی: «ئەی بیلال ئەگەر کاتی نوێژی عەسر هات، نەهاتمەوە بە ئەبو بەکر بڵێ پێشنوێژی بکات بۆ خەڵک»، کە کاتی نوێژی عەسر هات، بیلال بانگی دا دواتر قامەتی کرد، بە ئەبو بەکری گوت: پێش بکەوە، ئەبو بەکر پێش کەوت و نوێژی دابەست، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بەنێو خەڵکەکەدا هات لەپشت ئەبو بەکر نوێژی دابەست، خەڵکەکەش (وەکوو ئاگادارکردنەوەی ئەبو بەکر بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ) چەپڵەیان لێدا، جا ئەبو بەکر ئەگەر چووبایە نێو نوێژەوە لای نەدەکردەوە و ئاوڕی نەدەدایەوە، بەڵام کاتێك بینیی خەڵکەکە هەر چەپڵە لێدەدەن لای کردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی ئاماژەی بۆی کرد، ئەویش ستاییشی خوای کرد لەسەر فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی: «بەردەوام بە»، پاشان ئەبو بەکر هاتە دواوە، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بینیی پێش کەوت و نوێژی بۆ خەڵکی کرد، کاتێك لە نوێژەکەی بوویەوە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «ئەی ئەبو بەکر چی وای لێ کردی کاتێك ئاماژەم بۆت کرد نوێژەکەت تەواو نەکرد؟»، فەرمووی: بۆ کوڕی ئەبو قوحافە نییە پێشنوێژی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بکات، (دوایی پێغەمبەر ﷺ) بە خەڵکەکەی فەرموو: «ئەگەر شتێکتان بۆ دروست بوو لە کاتی نوێژکردندا با پیاوان (سُبْحَانَ اللَّه) بڵێن و ئافرەتانیش چەپڵە لێبدەن (بە نێولەپی دەستی ڕاست بدەن لە پشتی دەستی چەپ)».



## الِائْتِمَامُ بِمَنْ يَأْتَمُّ بِالْإِمَامِ

## پەیڕەوکردن و شوێنکەوتنی ئەو کەسەی شوێنی ئیمام دەکەوێت

١٢١. عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الظُّهْرَ وَأَبُو بَكْرٍ خَلْفَهُ، فَإِذَا كَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَبَّرَ أَبُو بَكْرٍ يُسْمِعُنَا.

جابیر رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین و ئەبو بەکریش

ﷺ لە پشتیەوە بوو، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ (اللَّهُ أَكْبَرَ)ی بکردایە، ئەبو بەکریش تەکبیرەکانی دەگەیاند بە ئێمە و گوێبیستی دەکردین.

## مَا يَقُولُ الْإِمَامُ إِذَا تَقَدَّمَ فِي تَسْوِيَةِ الصُّفُوفِ

### ئەو قسەیەی ئیمام دەیڵێ کاتێك پێش دەکەوێت بۆ ڕێکخستنی ڕیزەکان

١٢٢. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْسَحُ عَوَاتِقَنَا وَيَقُولُ: «اسْتَوُوا وَلَا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، وَلْيَلِيَنِي مِنْكُمْ أُولُو الْأَحْلَامِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ».

ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دەهێنا بە شانەکانماندا (و دەینووساندین بە یەکدییەوە) و دەیفەرموو: «ڕێک و ڕاست بن جیاوازی مەکەن (بە هاتنەپێش و چوونەدواوە لە ڕیزەکان) دوایی دڵەکانتان دەگۆڕێت، با ئەوانەتان کە خاوەنی ژیری و تێگەیشتنی زیاترن (قوڕئانی زیاتریان لەبەرە و تێگەیشتووترن لە ڕیزی نوێژدا) لە منەوە نزیکتر بن، دوایی ئەوانەی دوای وان، دوایی ئەوانەی دوای وان (لە ڕووی قوڕئان و تێگەیشتنەوە)».



## ذِكْرُ خَيْرِ صُفُوفِ النِّسَاءِ وَشَرِّ صُفُوفِ الرِّجَالِ

### باسی چاکترین ڕیزی ئافرەتان و خراپترین ڕیزی پیاوان

١٢٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا وَشَرُّهَا آخِرُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «چاکترینی ڕیزی

پیاوان یەکەمینیەتی، خراپترینیشیان کۆتاییەکەیەتی، وە چاکترین ڕیزی ئافرەتان کۆتاییەکەیەتی، خراپترینیشیان یەکەمینیەتی».

## مَا عَلَى الْإِمَامِ مِنَ التَّخْفِيفِ

### ئەوەی لەسەر ئیمام پێویستە لە ئاسانکاری

١٢٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ بِالنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ؛ فَإِنَّ فِيهِمُ السَّقِيمَ وَالضَّعِيفَ وَالْكَبِيرَ، فَإِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ مَا شَاءَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێک لە ئێوە نوێژی کرد بۆ خەڵکی با ئاسان و سوکی بکات، چونکە نەخۆش و لاواز و پیر و بەساڵاچوویان تێدایە، ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد بۆ خۆی با چۆن دەیەوێت درێژی بکاتەوە».



## اخْتِلَافُ نِيَّةِ الْإِمَامِ وَالْمَأْمُومِ

### جیاوازی نیەتی ئیمام و نوێژخوێن

١٢٥. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: كَانَ مُعَاذٌ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى قَوْمِهِ يَؤُمُّهُمْ، فَأَخَّرَ ذَاتَ لَيْلَةٍ الصَّلَاةَ، وَصَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى قَوْمِهِ يَؤُمُّهُمْ فَقَرَأَ سُورَةَ الْبَقَرَةِ، فَلَمَّا سَمِعَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ تَأَخَّرَ فَصَلَّى، ثُمَّ خَرَجَ فَقَالُوا: نَافَقْتَ يَا فُلَانُ؟! فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا نَافَقْتُ وَلَآتِيَنَّ النَّبِيَّ ﷺ فَأُخْبِرُهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ مُعَاذًا يُصَلِّي مَعَكَ ثُمَّ يَأْتِينَا فَيَؤُمُّنَا، وَإِنَّكَ أَخَّرْتَ الصَّلَاةَ

الْبَارِحَةَ فَصَلَّى مَعَكَ ثُمَّ رَجَعَ فَأَمَّنَا فَاسْتَفْتَحَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ فَلَمَّا سَمِعْتُ ذَلِكَ تَأَخَّرْتُ فَصَلَّيْتُ، وَإِنَّمَا نَحْنُ أَصْحَابُ نَوَاضِحَ نَعْمَلُ بِأَيْدِينَا، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا مُعَاذُ أَفَتَّانٌ أَنْتَ، اقْرَأْ بِسُورَةِ كَذَا وَسُورَةِ كَذَا».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﭬ دەڵێت: موعاز لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ نێو قەومەکەی پێشنوێژیی بۆ دەکردن، شەوێک پێغەمبەر ﷺ نوێژەکەی دوا خست، ئەویش لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی کرد، پاشان گەڕایەوە بۆ لای قەومەکەی پێشنوێژیی بۆ کردن سوورەتی بەقەرەی خوێند، پیاوێک لە خەڵکەکە گوێبیستی بوو، هاتە دواوە بەتەنیا نوێژەکەی خۆی کرد، پاشان دەرچوو، دواتر گوتیان: بوویتە دووڕوو ئەی فڵان؟! گوتی: سوێند بە خوا نەبوومە دووڕوو، دەبێ بچم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێ بدەم، هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، موعاز نوێژ لەگەڵ جەنابت دەکات، پاشان دێت بۆ لای ئێمە پێشنوێژیان بۆ دەکات، تۆ دوێنێ نوێژەکەت دوا خست، ئەویش لەگەڵ جەنابتدا نوێژی کرد، دواتر گەڕایەوە پێشنوێژیی بۆ کردین، دەستی کرد بە خوێندنی سوورەتی بەقەرە، کاتێك گوێم لێ بوو، دوا کەوتم نوێژی خۆمم کرد، ئێمە خەڵکی خاوەنکارین بە دەستەکانی خۆمان کار دەکەین، پێغەمبەر ﷺ بە موعازی فەرموو: «ئەی موعاز ئایا تۆ دەتەوێت ببیتە مایەی فیتنە، فڵانە سوورەت بخوێنە و فڵانە سوورەت بخوێنە».



## فَضْلُ الْجَمَاعَةِ

## پێگە و گەورەیی نوێژی بەکۆمەڵ

١٢٦. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭭ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ عَلَى صَلَاةِ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نوێژی بەکۆمەڵ بیست و حەوت پلە چاکترە لە نوێژی بەتەنها».

## الْمُحَافَظَةُ عَلَى الصَّلَوَاتِ حَيْثُ يُنَادَى بِهِنَّ

## پارێزگاری لە نوێژەکان بەکۆمەڵ کاتێك بانگیان بۆ دەدرێت

١٢٧. عَنْ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ ﵁ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ الْمَدِينَةَ كَثِيرَةُ الْهَوَامِّ وَالسِّبَاعِ، قَالَ: «هَلْ تَسْمَعُ حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ؟»، قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «فَحَيَّ هَلًا». وَلَمْ يُرَخِّصْ لَهُ.

لە ئیبن ئوم مەکتوومەوە ﵁ دەگێڕنەوە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی مەدینە ژیانداری ژەهراوی و دڕندەی زۆرە، فەرمووی: «ئایا گوێت لە (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ) دەبێت؟»، گوتی: بەڵێ. فەرمووی: «دەبێت بەدەمیەوە بچیت»، مۆڵەتی پێ نەدا.



## الْعُذْرُ فِي تَرْكِ الْجَمَاعَةِ

## هەبوونی بیانوو بۆ وازهێنان لە نوێژی بەکۆمەڵ

١٢٨. عَنْ عُرْوَةَ أَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَرْقَمَ ﵁: كَانَ يَؤُمُّ أَصْحَابَهُ فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ يَوْمًا فَذَهَبَ لِحَاجَتِهِ، ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمُ الْغَائِطَ فَلْيَبْدَأْ بِهِ قَبْلَ الصَّلَاةِ».

عوروە دەگێڕێتەوە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەم ﵁ پێشنوێژیی بۆ هاوەڵەکانی دەکرد، ڕۆژێک کاتی نوێژ هات ڕۆیشت بۆ سەرئاوکردن، پاشان گەڕایەوە، گوتی: گوێم لە

پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «ئەگەر یەکێک لە ئێوە هەستی کرد پێویستی بە سەرئاو هەیە، با لەپێش نوێژەکەیدا سەرئاو بکات».

١٢٩. عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِحُنَيْنٍ فَأَصَابَنَا مَطَرٌ، فَنَادَى مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ.

ئەبو مەلیح لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە حونەین باران دایگرتین، بانگدەری پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی دا: نوێژ لە بارگە و جێگاکانی خۆتاندا بکەن.

## حَدُّ إِدْرَاكِ الْجَمَاعَةِ

## سنووری گەیشتن بە نوێژی بەکۆمەڵ



١٣٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ خَرَجَ عَامِدًا إِلَى الْمَسْجِدِ فَوَجَدَ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ مِثْلَ أَجْرِ مَنْ حَضَرَهَا وَلَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس دەستنوێژ بگرێت بەچاکترین شێوە، پاشان دەربچێت بە مەبەستی چوونە مزگەوت، ببینێت خەڵکی نوێژیان تەواو کردووە، خوا پاشتی ئەوانەی بۆ دەنووسێت کە ئامادە بوون (لە نوێژەکە)، بێ ئەوەی هیچیش لە پاداشتی ئەوان کەم بێتەوە».

## إِعَادَةُ الصَّلَاةِ مَعَ الْجَمَاعَةِ بَعْدَ صَلَاةِ الرَّجُلِ لِنَفْسِهِ

## دووبارەکردنەوەی نوێژ لەگەڵ کۆمەڵ بۆ ئەو کەسەی پێشتر بەتەنیا نوێژی کردووە

١٣١. عَنْ مِحْجَنٍ رضي الله عنه: أَنَّهُ كَانَ فِي مَجْلِسٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأُذِّنَ بِالصَّلَاةِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ رَجَعَ وَمِحْجَنٌ فِي مَجْلِسِهِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ؟ أَلَسْتَ بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ؟»، قَالَ: بَلَى، وَلَكِنِّي كُنْتُ قَدْ صَلَّيْتُ فِي أَهْلِي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا جِئْتَ فَصَلِّ مَعَ النَّاسِ وَإِنْ كُنْتَ قَدْ صَلَّيْتَ».

میحجەن رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: لە کۆڕێکدا بوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بانگ درا بۆ نوێژ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا، پاشان گەڕایەوە میحجەنیش لە جێگاکەی خۆیدا دانیشتبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: «چ شتێك ڕێگرت بوو کە نوێژ بکەیت؟ ئایا تۆ پیاوێکی موسوڵمان نیت؟»، گوتی: بەڵێ. بەڵام من لەماڵەوە نوێژم کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: «ئەگەر هاتی لەگەڵ خەڵکی نوێژ بکە ئەگەر چی نوێژیشت کردبوو».

## مَا يُكْرَهُ مِنَ الصَّلَاةِ عِنْدَ الْإِقَامَةِ

## نوێژکردن کەڕاهەتی هەیە لە کاتی قامەتدا

١٣٢. عَنْ ابْنِ بُحَيْنَةَ رضي الله عنه قَالَ: أُقِيمَتْ صَلَاةُ الصُّبْحِ فَرَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلًا يُصَلِّي وَالْمُؤَذِّنُ يُقِيمُ فَقَالَ: «أَتُصَلِّي الصُّبْحَ أَرْبَعًا؟».

ئیبن بوحەینە رضي الله عنه دەڵێت: قامەت کرا بۆ نوێژی بەیانی، پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی نوێژی دەکرد و بانگدەریش قامەتی دەکرد، فەرمووی: «ئایا چوار ڕکات نوێژی بەیانی دەکەیت؟».

## الرُّكُوعُ دُونَ الصَّفِّ

### ڕکووعبردن لە جگە لە ڕیزی نوێژ

١٣٣. عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﵁: أَنَّهُ دَخَلَ الْمَسْجِدَ وَالنَّبِيُّ ﷺ رَاكِعٌ، فَرَكَعَ دُونَ الصَّفِّ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «زَادَكَ اللَّهُ حِرْصًا وَلَا تَعُدْ».

ئەبو بەکرە ﵁ دەگێڕێتەوە: کە ئەو چۆتە مزگەوت و پێغەمبەر ﷺ لە ڕکووعدا بوو، لە دەرەوەی ڕیزی جەماعەت ڕکووعی برد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «خوا سووربوونت زیاتر بکات، بەڵام ئەو کارە دووبارە مەکەرەوە».

# كِتَابُ الافْتِتَاحِ

# پەرتووكی دەستپێكردنی نوێژ

## رَفْعُ الْيَدَيْنِ حَذْوَ الْمَنْكِبَيْنِ

## بەرزكردنەوەی دەست تا ئاستی هەردووك شان



١٣٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ رَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا كَذَلِكَ وَقَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»، وَكَانَ لَا يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السُّجُودِ.

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێك دەستی بە نوێژ بكردایە دەستەكانی بەرز دەكردەوە تا ئاستی سەرشانەكانی، كاتێك ڕكووعی ببردایە، هەروەها كاتێك سەری بەرز بكردایەتەوە لە ڕكووع بە هەمان شێوە دەستەكانی بەرز دەكردەوە و دەیفەرموو: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»، بەڵام كاتێك بچووایە بۆ سوژدە ئەوەی نەدەكرد.

## بَابُ مَوْضِعِ الْإِبْهَامَيْنِ عِنْدَ الرَّفْعِ

### باسی جێگای هەردوو پەنجە گەورە لە کاتی دەست بەرزکردنەوە

١٣٥. عَنْ عَبْدِ الْجَبَّارِ بْنُ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه: أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى تَكَادَ إِبْهَامَاهُ تُحَاذِي شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ.

عەبدولجەباری کوڕی وائیل لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: ئەو پێغەمبەری ﷺ بینیوە کاتێك دەستی بکردایە بە نوێژ هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، هەتا هەردوو پەنجە گەورەکەی دەهاتە ئاستی نەرمایی گوێیەکانی.

## فَرْضُ التَّكْبِيرَةِ الْأُولَى



### گوتنی: (اللّٰهُ أَكْبَرَ)ی یەکەم فەڕزە (لە دەستپێکی نوێژ)

١٣٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَرَدَّ عَلَيْهِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: «ارْجِعْ فَصَلِّ؛ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ»، فَرَجَعَ فَصَلَّى كَمَا صَلَّى، ثُمَّ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَعَلَيْكَ السَّلَامُ، ارْجِعْ فَصَلِّ؛ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ»، فَعَلَ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ الرَّجُلُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أُحْسِنُ غَيْرَ هَذَا فَعَلِّمْنِي، قَالَ: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلَاتِكَ كُلِّهَا».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مزگەوتەوە، پیاوێکیش هاتە مزگەوتەوە و نوێژی کرد، پاشان هات سڵاوی کرد لە پێغەمبەری خوا

ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دایەوە و فەرمووی: «بگەڕێوە نوێژ بکە، چونکە بەڕاستی تۆ نوێژت نەکردووە»، گەڕایەوە هەر وەکوو پێشتر نوێژی کرد، پاشان هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سڵاوی لێ کرد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «(وعليک السلام)، بگەڕێوە نوێژ بکە، چونکە بەڕاستی تۆ نوێژت نەکردووە»، سێ جار ئەوەی پێ دووبارە کردەوە، پیاوەکە گوتی: سوێند بەو خوایەی تۆی بەهەق ناردووە لەمە چاکتر نازانم، فێرم بکە، فەرمووی: «ئەگەر هەڵسایت بۆ نوێژ (اللَّهُ أَكْبَرُ) بکە، پاشان چەندە دەزانیت لە قوڕئان بیخوێنە (لەدوای خوێندنی سووڕەتی فاتیحە)، پاشان ڕکووع ببە تا دڵنیا دەبیت ڕکووعت بردووە، پاشان هەڵسەوە هەتا بەتەواوی ڕێک دەبیتەوە، پاشان سوژدە ببە هەتا دڵنیا دەبیت سوژدەت بردووە، پاشان سەرت بەرز بکەرەوە هەتا دڵنیا دەبیت دانیشتووی، پاشان لە هەموو نوێژەکەتدا بەو شێوەیە بکە».



## الْقَوْلُ الَّذِي يُفْتَتَحُ بِهِ الصَّلَاةُ

### ئەو وتەیەی کە نوێژی پێ دەست پێ دەکرێت

١٣٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَامَ رَجُلٌ خَلْفَ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: اللَّهِ أَكْبَرُ كَبِيرًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، وَسُبْحَانَ اللَّهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً. فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَاحِبُ الْكَلِمَةِ؟»، فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا يَا نَبِيَّ اللَّهِ. فَقَالَ: «لَقَدْ ابْتَدَرَهَا اثْنَا عَشَرَ مَلَكًا».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێت: پیاوێک لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵسا و گوتی: (اللَّهِ أَكْبَرُ كَبِيراً، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيراً، وَسُبْحَانَ اللَّهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «کێ خاوەنی ئەو وتەیە بوو؟»، پیاوێک گوتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: «بەڕاستی دوازدە فریشتە دەستپێشخەرییان بۆ کرد (هەر کامێکیان دەیوست زووتر بینووسن)».

## بَابُ الدُّعَاءِ بَيْنَ التَّكْبِيرَةِ وَالْقِرَاءَةِ

### باسی پاڕانەوە لە نێوان (اللَّهُ أَكْبَر)ی دابەستنی نوێژ و قورئان خوێندندا

١٣٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ صَلَّى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ سَكَتَ هُنَيْهَةً فَقُلْتُ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ مَا تَقُولُ فِي سُكُوتِكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ؟ قَالَ: أَقُولُ: «اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێك دەستی بە نوێژ بکردایە کەمێک دەوەستا، گوتم: باوک و دایکم بەقوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی بێدەنگبوونت لە نێوان (اللَّهُ أَكْبَر)ی دابەستنی نوێژ و قورئان خوێندندا چی دەفەرموویت؟ فەرمووی: دەڵێم: «خوایە نێوانی من و گوناهەکانم دوور بخەرەوە وەکوو چۆن نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوات دوور خستۆتەوە، خوایە پاکم بکەرەوە لە گوناهەکانم وەکوو چۆن جلی سپی پاک دەبێتەوە لە پیس و پۆخڵی، خوایە بمشۆرە لە گوناهەکانم بە ئاو و بەفر و تەرزە».

## إِيجَابُ قِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ فِي الصَّلَاةِ

### پێویستبوونی خوێندنی سوورەتی فاتیحە لە نوێژدا

١٣٩. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ».

عوبادەی کوڕی صامیت ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «نوێژ نییە بۆ

ئەو کەسەی سوورەتی فاتیحە نەخوێنێت».

## تَأْوِيلُ قَوْلِهِ ﷻ: {وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ} الأعراف: ٢٠٤

## مانای فەرمایشتی خوا ﷻ:
## {وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ}

١٤٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَرَأَ فَأَنْصِتُوا، وَإِذَا قَالَ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فَقُولُوا: اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ».



ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان ئیمام تەنها بۆ ئەوە دانراوە پەیڕەویی لێ بکرێت، ئەگەر (اللَّهُ أَكْبَرَ)ی کرد ئێوەش (اللَّهُ أَكْبَرَ) بکەن بەدوایدا، ئەگەر قورئانی خوێند بێدەنگ بن، ئەگەر گوتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، بڵێن: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْد)».

## الْقِرَاءَةُ فِي الصُّبْحِ بِإِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ

## خوێندنی (إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ) لە نوێژی بەیانیدا

١٤١. عَنْ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْفَجْرِ إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ.

عەمری کوڕی حورەیس رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانیدا:

(إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ)ی خوێند.

## بَابُ الْفَضْلِ فِي قِرَاءَةِ الْمُعَوِّذَتَيْنِ

## باسی پێگە و گەورەیی خوێندنی (الْمُعَوِّذَتَينِ)

١٤٢. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁ قَالَ: اتَّبَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ رَاكِبٌ فَوَضَعْتُ يَدِي عَلَى قَدَمِهِ فَقُلْتُ: أَقْرِئْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ سُورَةَ هُودٍ، وَسُورَةَ يُوسُفَ. فَقَالَ: «لَنْ تَقْرَأَ شَيْئًا أَبْلَغَ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ: قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَ: قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ».

عوقبەی کوڕی عامیر ﵁ دەڵێت: شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتم، ئەو سوار بوو، دەستم خستە سەر قاچەکانی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا سووڕەتی هوود و سووڕەتی یوسفم بۆ بخوێنە. فەرمووی: «هیچ شتێک ناخوێنیت گەورەتر بێت لەلای خوا لە: (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ)».

## بَابُ سُجُودِ الْقُرْآنِ السُّجُودُ فِي (ص)

## باسی سوجدەی قوڕئان و سوجدەبردن لە خوێندنی سووڕەتی (ص)

١٤٣. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَجَدَ فِي ص، وَقَالَ: «سَجَدَهَا دَاوُدُ تَوْبَةً، وَنَسْجُدُهَا شُكْرًا».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ سوژدەی برد لە سووڕەتی (ص) و فەرمووی: «داوود سوژدەی بردووە لەبەر تەوبەکردن، ئێمەش سوژدە دەبەین وەکوو سوپاسگوزاری».

## إِسْمَاعُ الْإِمَامِ الْآيَةَ فِي صَلَاةِ الظُّهْرِ

### باسی ئیمام له نوێژی نیوەڕۆدا ئایەت گوێبیستی نوێژخوێنان دەکات

١٤٤. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ بِأُمِّ الْقُرْآنِ وَسُورَتَيْنِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ مِنْ صَلَاةِ الظُّهْرِ وَصَلَاةِ الْعَصْرِ، وَيُسْمِعُنَا الْآيَةَ أَحْيَانًا، وَكَانَ يُطِيلُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى.

ئەبو قەتادە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ له دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسردا فاتیحەی دەخوێند لەگەڵ دوو سوڕەتدا، جار جار ئایەتەکانی دەدا بەگوێیاندا و دەمانبیست، له ڕکاتی یەکەم نوێژەکەی درێژ دەکردەوە.



## الْفَضْلُ فِي قِرَاءَةِ: قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ

### پێگە و گەورەیی خوێندنی: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)

١٤٥. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ رَجُلاً عَلَى سَرِيَّةٍ، فَكَانَ يَقْرَأُ لِأَصْحَابِهِ فِي صَلَاتِهِمْ فَيَخْتِمُ بِقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدُ، فَلَمَّا رَجَعُوا ذَكَرُوا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهُ ﷺ، فَقَالَ: «سَلُوهُ، لِأَيِّ شَيْءٍ فَعَلَ ذَلِكَ؟»، فَسَأَلُوهُ فَقَالَ: لِأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَنِ ﷻ، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللَّهَ ﷻ يُحِبُّهُ».

عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی کردە ئەمیری لەشکرێک، ئەویش قوڕئانی دەخوێند بۆ هاوەڵەکانی، (هەموو جار بە سووڕەتی:) (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)، کۆتایی پێ دەهێنا، کاتێک گەڕانەوە، باسی ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، فەرمووی: «پرسیاری لێ بکەن بزانن بۆچی ئەوەی کردووە؟»، پرسیاریان لێ کرد، ئەویش وتی: چونکە ئەوە سیفەتی خوای میهرەبانە ﷻ، من حەز دەکەم

بیخوێنمەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هەواڵی پێ بدەن کە بەڕاستی خوا ﷻ خۆشی دەوێت».

١٤٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً سَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ يُرَدِّدُهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ».

ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پیاوێک گوێی لێ بوو پیاوێکی دیکە (سووڕەتی) (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ی دەخوێند و دووبارەی دەکردەوە، کاتێك ڕۆژ بوویەوە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆ باس کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «سوێند بەو زاتەی نەفسی منی بەدەستە، ئەو سووڕەتە بەرانبەرە بە سێیەکی قوڕئان».



## تَعَوُّذُ الْقَارِئِ إِذَا مَرَّ بِآيَةِ عَذَابٍ

## قوڕئانخوێن کاتێك دەگات بە ئایەتی سزا پەنا دەگرێ بە خوا

١٤٧. عَنْ حُذَيْفَةَ رضي الله عنه: أَنَّهُ صَلَّى إِلَى جَنْبِ النَّبِيِّ ﷺ لَيْلَةً فَقَرَأَ، فَكَانَ إِذَا مَرَّ بِآيَةِ عَذَابٍ وَقَفَ وَتَعَوَّذَ، وَإِذَا مَرَّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ وَقَفَ فَدَعَا، وَكَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ»، وَفِي سُجُودِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى».

حوزەیفە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: ئەو شەوێک لە تەنیشت پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد، (پێغەمبەر ﷺ) قوڕئانی خوێند، کاتێك بەسەر ئایەتی سزادا تێپەڕ ببووایە دەوەستا و پەنای دەگرت، کاتێکیش بەسەر ئایەتی ڕەحمەتدا تێپەڕ ببووایە دەوەستا نزای میهرەبانی دەکرد، لە ڕکووعبردنیشدا دەیفەرموو: «(سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ)، واتە: پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری مەزنم»، لە سوجدەشدا دەیفەرموو: «(سُبْحَانَ

رَبِّيَ الأَعْلَى)، واته: پاكی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری بەرز».

## بَابُ مَدِّ الصَّوْتِ بِالْقِرَاءَةِ

### باسی درێژكردنەوەی دەنگ لە قورئانخوێندندا

١٤٨. عَنْ قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسًا: كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: كَانَ يَمُدُّ صَوْتَهُ مَدًّا.

قەتادە ﷺ دەڵێت: پرسیارم كرد لە ئەنەس ﷺ ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن قورئانی دەخوێند؟ گوتی: دەنگی درێژ دەكردەوە بە درێژكردنەوە.



## تَزْيِينُ الْقُرْآنِ بِالصَّوْتِ

### ڕازاندنەوەی قورئانخوێندن بە دەنگی خۆش

١٤٩. عَنْ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ».

بەڕاء ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «قورئان بڕازێننەوە بە دەنگتان».

## إِقَامَةُ الصُّلْبِ فِي الرُّكُوعِ

### ڕێككردنەوەی بڕبڕەی پشت لە ڕكووعدا

١٥٠. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُجْزِئُ صَلَاةٌ لَا يُقِيمُ الرَّجُلُ فِيهَا صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ».

ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نوێژێک دروست نییە، ئەگەر نوێژخوێن پشتی تێدا ڕاست نەکاتەوە لە ڕکووع و لە سوجدەدا».



# كِتَابُ التَّطْبِيقِ

## پەرتووكی جێبەجێكردن

### بَابُ التَّطْبِيقِ

**باسی دەست بەیەكەوە نووساندن و دانانی لە نێوان ئەژنۆكان لە ڕكووعدا**



١٥١. عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ ﵁ قَالَ: صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ أَبِي وَجَعَلْتُ يَدَيَّ بَيْنَ رُكْبَتَيَّ، فَقَالَ لِيَ: اضْرِبْ بِكَفَّيْكَ عَلَى رُكْبَتَيْكَ، قَالَ: ثُمَّ فَعَلْتُ ذَلِكَ مَرَّةً أُخْرَى، فَضَرَبَ يَدِي، وَقَالَ: إِنَّا قَدْ نُهِينَا عَنْ هَذَا وَأُمِرْنَا أَنْ نَضْرِبَ بِالْأَكُفِّ عَلَى الرُّكَبِ.

موصعەبی كوڕی سەعید ﵁ دەڵێت: لە تەنیشت باوكمەوە نوێژم كرد، هەردوو دەستم خستە نێوانی ئەژنۆكانم، پێی گوتم: لەپی دەستت بخەرە سەر ئەژنۆت، گوتی: پاشان جارێكی دیكە، ئەوەم دووبارە كردەوە، كێشای بە هەردوو دەستم و گوتی: ئێمە ئەوەمان لێ قەدەغە كراوە، فەرمانمان پێ كراوە لەپی دەستمان بخەینە سەر ئەژنۆمان.

## الْإِمْسَاكُ بِالرُّكَبِ فِي الرُّكُوعِ

### گرتنی ئەژنۆ لە کاتی ڕکووعبردن

١٥٢. عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه قَالَ: سُنَّتْ لَكُمُ الرُّكَبُ، فَأَمْسِكُوا بِالرُّكَبِ.

عومەر رضي الله عنه دەڵێت: بەڕاستی سوننەت لەوەدایە توند دەست بە ئەژنۆوە بگرن.

## تَعْظِيمُ الرَّبِّ فِي الرُّكُوعِ

### بەگەورەدانانی پەروەردگار لە ڕکووعدا

١٥٣. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَشَفَ النَّبِيُّ ﷺ السِّتَارَةَ وَالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنه، فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلَّا الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ أَوْ تُرَى لَهُ»، ثُمَّ قَالَ: «أَلَا إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا، فَأَمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ، وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ پەردەی لادا خەڵکەکەش ڕیزیان بەستبوو لەپشت ئەبو بەکر رضي الله عنه، فەرمووی: «ئەی خەڵکینە! بەڕاستی مژدەدانی پێغەمبەرایەتی نەما، جگە لە خەوی چاک کەسێکی موسوڵمان بیبینێت یان خەوی پێوە ببینن»، پاشان فەرمووی: «ئاگادار بن! من لێم قەدەغە کراوە لە ڕکووع، یان لە سوجدەدا قوڕئان بخوێنم، هەرچی ڕکووعە پەروەردگاری تیادا بە گەورە بگرن، لە سوجدەشدا بپاڕێنەوە شیاوە لێتان وەربگیرێت».

# بَابُ الذِّكْرِ فِي الرُّكُوعِ

## باسی زیکری ڕکووعبردن

١٥٤. عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَرَكَعَ فَقَالَ فِي رُكُوعِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ»، وَفِي سُجُودِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى».

حوزەیفە ﵁ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم کرد ڕکووعی برد، لە ڕکووعەکەیدا فەرمووی: «(سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ)، واتە: پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری مەزنم»، وە لە سوژدەکەشیدا فەرمووی: «(سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى)، واتە: پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری بەرزم».

١٥٥. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: «سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ الْمَلَائِكَةِ وَالرُّوحِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکووعیدا دەیفەرموو: «(سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ الْمَلَائِكَةِ وَالرُّوحِ)، واتە: ئەی پەروەردگاری پاک و بێگەرد، گەورەیی و پیرۆزی شیاوی تۆیە، ئەی پەروەردگاری فریشتەکان و ڕووح (کە جیبریلە)».

١٥٦. عَنْ عَوْفَ بْنَ مَالِكٍ ﵁ يَقُولُ: قُمْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةً، فَلَمَّا رَكَعَ مَكَثَ قَدْرَ سُورَةِ الْبَقَرَةِ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: «سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ».

عەوفی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: شەوێک لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسام، کاتێك چووە ڕکووع بەئەندازەی خوێندنی سووڕەتی بەقەڕە مایەوە، لە ڕکووعەکەیدا دەیفەرموو: «پاکی و بێگەردی بۆ تۆیە ئەی خاوەنی زاڵبوون و جێبەجێکردن و کەماڵ و مەزنی».

١٥٧. عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ ﷺ كَانَ إِذَا رَكَعَ قَالَ: «اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي وَعِظَامِي وَمُخِّي وَعَصَبِي».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك ڕکووعی بردبایە دەیفەرموو: «خوایە ڕکووعم بۆ تۆ برد، ملکەچی تۆ بووم، بڕوام هێنا بە تۆ، بیستن و بینین و ئێسک و مۆخ و دەمارم ملکەچی تۆ بوون».

## بَابُ رَفْعِ الْيَدَيْنِ حَذْوَ فُرُوعِ الْأُذُنَيْنِ عِنْدَ الرَّفْعِ مِنَ الرُّكُوعِ

### باسی بەرزکردنەوەی دەستەکان تا ئاستی بەرزایی گوێیەکان لە کاتی هەڵسانەوە لە ڕکووع

١٥٨. عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَرْفَعُ يَدَيْهِ إِذَا رَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا فُرُوعَ أُذُنَيْهِ.

مالیکی کوڕی حوەیریس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەگێڕێتەوە: ئەو پێغەمبەری خوای ﷺ بینی دەستەکانی بەرز دەکردەوە، کاتێك ڕکووعی ببردایە و کاتێك سەری بەرز بکردایەتەوە لە ڕکووع و تا ئاستی بەرزایی هەردوو گوێی.

## بَابُ مَا يَقُولُ الْمَأْمُومُ

### باسی ئەوەی نوێژخوێن دەیڵێت

١٥٩. عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَقَطَ مِنْ فَرَسٍ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ، فَدَخَلُوا عَلَيْهِ يَعُودُونَهُ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ قَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ».

ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەسپێک کەوتە خوارەوە بە لای ڕاستیدا، ڕۆیشتن بۆ لای سەردانیان کرد، ئینجا کاتی نوێژ هات، کاتێك لە نوێژ بوویەوە فەرمووی: «ئیمام بۆ ئەوە دانراوە پەیڕەوی لێ بکرێت، ئەگەر ڕکووعی برد ئێوەش ڕکووع ببەن، ئەگەر سەری بەرز کردەوە ئێوەش سەرتان بەرز بکەنەوە، وە ئەگەر وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه)، ئێوەش بڵێن: (رَبَّنَا لَكَ الْحَمْد)».

## مَا يَقُولُ فِي قِيَامِهِ ذَلِكَ

### باسی ئەوەی (نوێژخوێن) دەیڵێت لەدوای هەڵسانەوەی لە ڕکووع

١٦٠. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَرَادَ السُّجُودَ بَعْدَ الرَّكْعَةِ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الْأَرْضِ وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ».



ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك دەیویست بچێتە سوجدە دوای ڕکووعبردن، دەیفەرموو: «(اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ، وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْد)، واتە: خوایە ستاییش بۆ تۆ بە پڕاوپڕی ئاسمانەکان و پڕاوپڕی زەوی، وە پڕاوپڕی ئەو شتەی دەتەوێت دوای ئەوانە».

## بَابُ الْقُنُوتِ بَعْدَ الرُّكُوعِ

### باسی دوعای قونووت دوای هەڵسانەوە لە ڕکووع

١٦١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَهْرًا بَعْدَ الرُّكُوعِ يَدْعُو عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ وَعُصَيَّةَ عَصَتِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ.

ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ مانگێک قونووتی خوێند لە ڕكووع و نزای كرد لە (تیرەو هۆزەكانی:) (رِعْل) و (ذَكْوَانَ) و (عُصَيَّةَ)، چونكە (ئەم سێ تیرەیە) سەرپێچیی خوا و پێغەمبەریان ﷺ كرد.

## بَابُ الْقُنُوتِ فِي صَلَاةِ الظُّهرِ

## باسی دوعای قونووت لە نوێژی نیوەڕۆدا

١٦٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَأُقَرِّبَنَّ لَكُمْ صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يَقْنُتُ فِي الرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ مِنْ صَلَاةِ الظُّهْرِ، وَصَلَاةِ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ، وَصَلَاةِ الصُّبْحِ، بَعْدَ مَا يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَيَدْعُو لِلْمُؤْمِنِينَ وَيَلْعَنُ الْكَفَرَةَ.



ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: نوێژی پێغەمبەری خواتان ﷺ بۆ نزیک دەكەمەوە، (ڕاوی) دەڵێت: ئەبو هورەیرە، دوعای قونووتی دەخوێند لە كۆتا ڕكاتی نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عیشا و نوێژی بەیانی، دوای ئەوەی دەیگوت: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه)، ئینجا دوعای بۆ بڕواداران دەكرد و نەفرینی لە بێبڕوایان دەكرد.

## بَابُ نَصْبِ الْقَدَمَيْنِ فِي السُّجُودِ

## باسی چەقاندنی هەردوو پێ لە سوجدەدا

١٦٣. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: فَقَدْتُ رَسُولَ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَانْتَهَيْتُ إِلَيْهِ وَهُوَ سَاجِدٌ وَقَدَمَاهُ مَنْصُوبَتَانِ وَهُوَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَبِكَ مِنْكَ، لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ».

عائیشە ﷺ دەڵێت: شەوێک پێغەمبەرم ﷺ لێ ون بوو، (لەپی دەستم بەملاولادا

دەکوتا) پێی گەیشتم، ئەو لە سوجدەدا بوو هەردوو قاچی چەقاندبوو دەیفەرموو: «خوایە پەنا دەگرم بە ڕەزامەندیت لەوەی لێم توڕە بیت، بە لێبووردنت لەوەی سزام بدەیت، پەنا دەگرم بە زاتی تۆ (لە شوێنەواری سیفەتەکانی) تۆ، ناتوانم ستاییشکردنت بژمێرم، وەکوو ئەوەی تەنها تۆ دەتوانیت ستاییشی خۆت بکەیت، بەوەی شیاوە بە مەزنیت».

## بَابُ الدُّعَاءِ فِي السُّجُودِ

### باسی دوعاکردن لە سوجدەدا

١٦٤. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ وَبَاتَ رَسُولُ ﷺ عِنْدَهَا، فَرَأَيْتُهُ قَامَ لِحَاجَتِهِ فَأَتَى الْقِرْبَةَ فَحَلَّ شِنَاقَهَا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءًا بَيْنَ الْوُضُوءَيْنِ، ثُمَّ أَتَى فِرَاشَهُ فَنَامَ، ثُمَّ قَامَ قَوْمَةً أُخْرَى فَأَتَى الْقِرْبَةَ فَحَلَّ شِنَاقَهَا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءًا هُوَ الْوُضُوءُ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي وَكَانَ يَقُولُ فِي سُجُودِهِ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي سَمْعِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي بَصَرِي نُورًا، وَاجْعَلْ مِنْ تَحْتِي نُورًا، وَاجْعَلْ مِنْ فَوْقِي نُورًا، وَعَنْ يَمِينِي نُورًا، وَعَنْ يَسَارِي نُورًا، وَاجْعَلْ أَمَامِي نُورًا، وَاجْعَلْ خَلْفِي نُورًا، وَأَعْظِمْ لِي نُورًا»، ثُمَّ نَامَ حَتَّى نَفَخَ، فَأَتَاهُ بِلَالٌ فَأَيْقَظَهُ لِلصَّلَاةِ.



ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: لەلای پوورم مەیموونەی کچی حاریسە خەوتم، (کە خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو) پێغەمبەریش ﷺ لەلای خەوت، بینیم هەڵسا بۆ سەرئاو، هات بۆ لای جەوەنەکە دەمەکەی کردەوە، پاشان دەستنوێژی شوشت بە دەستنوێژێکی مامناوەند، پاشان هات بۆ سەر جێگاکەی و خەوت، پاشان جارێکی دیکە هەڵسا و چوو بۆ لای جەوەنەکە و پەتەکەی کردەوە، پاشان دەستنوێژێکی شوشت بەتێروتەواوی، پاشان هەڵسا نوێژی کرد و لە سوجدەکەیدا دەیفەرموو: «خوایە ڕووناکی بخەیتە دڵمەوە، ڕووناکی بخەیتە بیستنمەوە، ڕووناکی بخەیتە

بینینمەوە، ڕووناکی بخەیتە خواروومەوە، ڕووناکی بخەیتە سەرووومەوە، ڕووناکی بخەیتە لای ڕاست و لای چەپم، ڕووناکی لە پێشەوەم دابنێیت، ڕووناکی لە پشتیشمەوە دابنێیت، ڕووناکیم بۆ مەزن بکەی»، پاشان خەوت هەتا پرخەی کرد، بیلال هات بۆ لای هەڵیساند لەخەو بۆ نوێژ.

١٦٥. عَنْ عَلِيٍّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا سَجَدَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ فَأَحْسَنَ صُورَتَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ».

عەلی ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك سوجدەی ببردایە دەیفەرموو: «خوایە تەنها سوجدەم بۆ تۆ برد و تەسلیمی تۆ بووم و بڕوام بە تۆ هێنا، ڕوخسارم سوژدەی برد بۆ ئەو خوایەی دروستی کردووە و وێنەی کێشاوە بەچاکترین شێوە، بیستن و بینینی بۆ کۆ کردۆتەوە، پاکی و بێگەردی بۆ چاکترینی بەدیهێنەرانە».



## أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنَ اللهِ

## نزیکترین کاتی بەندە لە خوای باڵادەست

١٦٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ ﷻ وَهُوَ سَاجِدٌ، فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگاری ﷻ ئەو کاتەیە کە لە سوجدەدایە، بۆیە زۆر دوعای تێدا بکەن».

## فَضْلُ السُّجُودِ

### پێگەو گەورەیی سوجدە بردن

١٦٧. عَنْ رَبِيعَةَ بْن كَعْبٍ الْأَسْلَمِيِّ رضي الله عنه قَالَ: كُنْتُ آتِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِوَضُوئِهِ وَبِحَاجَتِهِ، فَقَالَ: «سَلْنِي»، قُلْتُ: مُرَافَقَتَكَ فِي الْجَنَّةِ، قَالَ: «أَوَ غَيْرَ ذَلِكَ»، قُلْتُ: هُوَ ذَاكَ، قَالَ: «فَأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ».

ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمی رضي الله عنه دەڵێت: من دەهاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی دەستنوێژ و پێویستیم بۆی ئامادە دەکرد، فەرمووی: «داوام لێ بکە؟»، گوتم: هاوڕێیەتیت لە بەهەشتدا، فەرمووی: «ئەی جگە لەوە (داواکاری دیکەت نییە؟)»، گوتم: تەنها ئەوە، فەرمووی: «دان بگرە بە خۆتدا و یارمەتیم بدە بە زۆر سوجدەبردن».



## تَرْكُ ذَلِكَ (أي: رفع اليدين) بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ

### وازهێنان لە بەرزکردنەوەی دەستەکان لە کاتی بەرزبوونەوە لە نێوان هەردوو سوجدەکەدا

١٦٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ، وَبَعْدَ الرُّكُوعِ، وَلَا يَرْفَعُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێك دەستی بە نوێژ بکردایە تەکبیری دەکرد و دەستەکانی بەرز دەکردەوە، کاتێك ڕکووعیشی ببردایە و لەدوای ڕکووعیش (دەستی بەرز دەکردەوە)، بەڵام لە نێوانی هەر دوو سوجدەکەدا دەستی بەرز نەدەکردەوە.

## بَابُ كَيْفَ الْجُلُوسُ لِلتَّشَهُّدِ الْأَوَّلِ

### باسی چۆنیەتی دانیشتن لە تەحیاتی یەکەمدا

١٦٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: إِنَّ مِنْ سُنَّةِ الصَّلَاةِ أَنْ تُضْجِعَ رِجْلَكَ الْيُسْرَى وَتَنْصِبَ الْيُمْنَى.

ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: بەڕاستی لە سوننەت و شێوازی نوێژ ئەوەیە قاچی چەپت درێژ بکەیت لەژێرتدا و قاچی ڕاستیش بچەقێنێت.

## بَابُ الْإِشَارَةِ بِالْأُصْبُعِ فِي التَّشَهُّدِ الْأَوَّلِ

### باسی ئاماژەکردن بە پەنجە لە تەحیاتی یەکەمدا



١٧٠. عَنِ ابْنِ الزُّبَيْرِ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا جَلَسَ فِي الثِّنْتَيْنِ أَوْ فِي الْأَرْبَعِ يَضَعُ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ أَشَارَ بِأُصْبُعِهِ.

ئیبنو زوبەیر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دابنیشتایە لە دووەم ڕکات، یان چوارەم ڕکات، دەستەکانی دەخستە سەر ئەژنۆکانی، پاشان بە پەنجەی ئاماژەی دەکرد.

## كَيْفَ التَّشَهُّدُ الْأَوَّلُ

### چۆنیەتی تەحیاتی یەکەم

١٧١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه قَالَ: عَلَّمَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَقُولَ إِذَا جَلَسْنَا فِي الرَّكْعَتَيْنِ: «التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ،

السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ».

عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردین کاتێك دانیشتین لە دوو ڕکاتەکەدا بڵێین: «هەرچی گەورەیی و مەزنی هەیە تەنها بۆ خوایە، هەرچی نوێژ و وتەی جوان و کردەوە پاکەکان هەیە تەنها بۆ خوایە، سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکەت (زیادەی هەموو چاکەیەک) لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر، سڵاو لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو بەندە چاکەکان، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، شایەتی دەدەم موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە».

## بَابُ تَرْكِ التَّشَهُّدِ الْأَوَّلِ

## باسی وازهێنان لە تەحیاتی یەکەم (بەهۆی لەبیرچوون)



١٧٢. عَنْ ابْنِ بُحَيْنَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فَقَامَ فِي الشَّفْعِ الَّذِي كَانَ يُرِيدُ أَنْ يَجْلِسَ فِيهِ، فَمَضَى فِي صَلَاتِهِ حَتَّى إِذَا كَانَ فِي آخِرِ صَلَاتِهِ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ ثُمَّ سَلَّمَ.

ئیبن بوحەینە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد لە دووەم ڕکات هەڵسایەوە کە دەیویست دابنیشێت بۆ تەحیات، بەردەوام بوو لە نوێژەکەی تا گەیشتە کۆتایی نوێژەکەی دوو سوجدەی برد پێش ئەوەی سەلام بداتەوە، پاشان سەلامی دایەوە.



# كِتَابُ السَّهْوِ

## پەرتووکی لەبیرچوون (لە نوێژدا)

### بَابُ التَّشْدِيدِ فِي الِالْتِفَاتِ فِي الصَّلَاةِ

### باسی هەڕەشەی توند لە ئاوڕدانەوە لە نوێژدا



١٧٣. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الِالْتِفَاتِ فِي الصَّلَاةِ، فَقَالَ: «اخْتِلَاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الصَّلَاةِ».

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئاوڕدانەوە لە نوێژدا، فەرمووی: «دزینێکە شەیتان لە نوێژەکە دەیدزێت».

### بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الِالْتِفَاتِ فِي الصَّلَاةِ يَمِينًا وَشِمَالًا

### باسی ڕێگەدان بە ئاوڕدانەوە بەلای ڕاست و چەپدا لە نوێژدا

١٧٤. عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: اشْتَكَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَأَبُو بَكْرٍ يُكَبِّرُ يُسْمِعُ النَّاسَ تَكْبِيرَهُ، فَالْتَفَتَ إِلَيْنَا فَرَآنَا قِيَامًا، فَأَشَارَ إِلَيْنَا فَقَعَدْنَا، فَصَلَّيْنَا

بِصَلَاتِهِ قُعُودًا، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: «إِنْ كُنْتُمْ آنِفًا تَفْعَلُونَ فِعْلَ فَارِسَ وَالرُّومِ يَقُومُونَ عَلَى مُلُوكِهِمْ وَهُمْ قُعُودٌ فَلَا تَفْعَلُوا، ائْتَمُّوا بِأَئِمَّتِكُمْ إِنْ صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا، وَإِنْ صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا».

جابیر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش بوو لە پشتیەوە نوێژمان کرد ئەو دانیشتبوو، ئەبو بەکریش تەکبیری دەکرد و تەکبیری پێغەمبەری خوای ﷺ دەگەیاند بە خەڵکەکە، ئاوڕی لێ داینەوە تەماشای کردین وەستاوین، ئاماژەی بۆ کردین دابنیشین، ئێمەش بەدانیشتنەوە نوێژمان کرد، کاتێك سەلامی دایەوە فەرمووی: «ئێوە کەمێک پێش ئێستا وەکوو فارس و ڕۆمەکانتان کرد کە لەبەردەم پادشاکانیان هەڵدەستان، ئەوانیش دانیشتبوون، وا مەکەن، شوێنی پێشنوێژەکەتان بکەون، ئەگەر بەوەستانەوە نوێژی کرد بەوەستانەوە نوێژ بکەن، ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، بەدانیشتنەوە نوێژ بکەن».



## بَابُ الْمَشْيِ أَمَامَ الْقِبْلَةِ خُطًى يَسِيرَةً

## باسی ڕۆیشتن بەرەو قیبلە، چەند هەنگاوێکی کەم لە نوێژدا

١٧٥. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: اسْتَفْتَحْتُ الْبَابَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي تَطَوُّعًا وَالْبَابُ عَلَى الْقِبْلَةِ فَمَشَى عَنْ يَمِينِهِ أَوْ عَنْ يَسَارِهِ، فَفَتَحَ الْبَابَ ثُمَّ رَجَعَ إِلَى مُصَلَّاهُ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: لە دەرگام دا پێغەمبەری خوا ﷺ (لەو کاتەدا) نوێژی سوننەتی دەکرد، دەرگاکەش لە ڕووی قیبلەوە بوو، بە لای ڕاستی، یان چەپی ڕۆیشت دەرگاکەی کردەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ جێگای نوێژەکەی.

## بَابُ الْبُكَاءِ فِي الصَّلَاةِ

## باسی گریان لەنێو نوێژدا

١٧٦. عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، وَهُوَ يُصَلِّي وَلِجَوْفِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ الْمِرْجَلِ.

موتەرریف لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد لە ناخییەوە گریانێکی بەکوڵ دەردەچوو، وەکوو چۆن قاپێک ئاوی تێدا دەکوڵێت.

## الْكَلَامُ فِي الصَّلَاةِ

## قسەکردن لەنێو نوێژدا

١٧٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الصَّلَاةِ وَقُمْنَا مَعَهُ، فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ: اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي وَمُحَمَّدًا وَلَا تَرْحَمْ مَعَنَا أَحَدًا، فَلَمَّا سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِلْأَعْرَابِيِّ: «لَقَدْ تَحَجَّرْتَ وَاسِعًا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا بۆ نوێژ و ئێمەش لەگەڵی هەڵساین، دەشتەکییەک لە نوێژدا گوتی: خوایە ڕەحم بە من و موحەممەد بکەیت، ڕەحم بە کەسی دیکە نەکەیت لەگەڵمان، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە بە دەشتەکییەکەی فەرموو: «بەڕاستی ڕەحمەتی فراوانی خوات بەرتەسک کردەوە».

## بَابُ إِتْمَامِ الْمُصَلِّي عَلَى مَا ذَكَرَ إِذَا شَكَّ

### باسی نوێژخوێن کاتێك کەوتە گومانەوە لەنێو نوێژەکەی ئەوە تەواو دەکات کە لەبیریەتی

١٧٨. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلْيُلْغِ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ عَلَى الْيَقِينِ، فَإِذَا اسْتَيْقَنَ بِالتَّمَامِ، فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ قَاعِدٌ، فَإِنْ كَانَ صَلَّى خَمْسًا شَفَعَتَا لَهُ صَلَاتَهُ، وَإِنْ صَلَّى أَرْبَعًا كَانَتَا تَرْغِيمًا لِلشَّيْطَانِ».

ئەبو سەعید رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێک لە ئێوە کەوتە گومانەوە لەنێو نوێژەکەی با گومان وەلا بنێت و بونیاد لەسەر دڵنیایی بنێت، ئەگەر دڵنیایی هەڵبژارد با بەدانیشتنەوە دوو سوجدە ببات، جا ئەگەر پێنج ڕکاتی کردبوو ئەو دوو سوجدەیە (جێگای ڕکاتێکی بۆ دەگرنەوە) و نوێژەکەی دەکەن بە جووت، (دەبنەوە بە چوار ڕکات)، ئەگەر چوار ڕکاتی کردبوو ئەوە ئەو دوو سوجدەیە دەبێتە مایەی گەڕانەوەی شەیتان بەڕیسوایی».



## بَابُ مَا يَفْعَلُ مَنْ صَلَّى خَمْسًا

### باسی ئەو کەسەی پێنج ڕکاتی کرد چی دەکات؟

١٧٩. عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سُوَيْدٍ، قَالَ: صَلَّى عَلْقَمَةُ خَمْسًا، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ: مَا فَعَلْتُ، قُلْتُ بِرَأْسِي: بَلَى، قَالَ: وَأَنْتَ يَا أَعْوَرُ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ حَدَّثَنَا، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ صَلَّى خَمْسًا فَوَشْوَشَ الْقَوْمُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، فَقَالُوا لَهُ: أَزِيدَ فِي الصَّلَاةِ؟ قَالَ: «لَا»، فَأَخْبَرُوهُ، فَثَنَى رِجْلَهُ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ».

ئیبراهیمی کوڕی سوەید دەڵێت: عەلقەمە پێنج ڕکات نوێژی کرد، پێی گوترا (پێنج ڕکات نوێژت کرد)، گوتی: نەخێر نەمکردووە، منیش بە سەرم ئاماژەم بۆی کرد: بەڵکوو کردووتە، گوتی: تۆ ئەی نابینا شایەتی ئەوە دەدەیت؟ گوتم: بەڵێ، جا دوو سوجدەی برد، پاشان بۆی باس کردین لە عەبدوڵڵاوە ﵁ پێغەمبەری خوا ﷺ پێنج ڕکات نوێژی کرد، خەڵکەکە پەشۆکان هەندێکیان (دەچوون) بۆ لای هەندێکی دیکەیان، پێیان گوت: ئایا نوێژ زیاد کراوە؟ فەرمووی: «نەخێر»، هەواڵیان پێدا قاچەکانی جووت کرد و دوو سوجدەی برد، پاشان فەرمووی: «بەڵکوو من مرۆڤم بیرم دەچێت، وەک چۆن ئێوەش بیرتان دەچێت».

## بَابُ السَّلَامِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ

### باسی سەلامکردن لەسەر پێغەمبەر ﷺ



١٨٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلَّهِ مَلَائِكَةً سَيَّاحِينَ فِي الْأَرْضِ يُبَلِّغُونِي مِنْ أُمَّتِي السَّلَامَ».

عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەدڵنیاییی خوا کۆمەڵە فریشتەیەکی (تایبەتی) هەن دەگەڕێن بەسەر زەویدا، سەلامی ئوممەتەکەمم پێ دەگەیەنن».

## بَابُ كَيْفَ الصَّلَاةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ

### باسی چۆنیەتی سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ

١٨١. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ ﵁ قَالَ: قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أُمِرْنَا أَنْ نُصَلِّيَ عَلَيْكَ

وَنُسَلِّمَ، أَمَّا السَّلَامُ فَقَدْ عَرَفْنَاهُ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: «قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ».

ئەبو مەسعوودی ئەنصاڕی ﵁ دەڵێت: بە پێغەمبەر ﷺ گوترا: فەرمانمان پێ کرا سەڵاوات و سەلام بدەین لەسەرت، هەرچی سەلامە ئەوە زانیمان، ئەی چۆن سەڵاوات بدەین لەسەرت؟ فەرمووی: «بڵێن: خوایە سەڵاوات بڕێژە بەسەر موحەممەد، هەروەک سەڵاواتت ڕژاند بەسەر خانەوادەی ئیبڕاهیم، خوایە بەرەکەت بڕێژە بەسەر موحەممەد، هەروەک فەڕ و پیرۆزیت ڕژاند بەسەر خانەوادە و کەسوکاری ئیبڕاهیم».

## بَابُ الدُّعَاءِ بَعْدَ الذِّكْرِ



### باسی دوعای دوای زیکرکردن لە تەحیاتدا

١٨٢. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ جَالِسًا يَعْنِي وَرَجُلٌ قَائِمٌ يُصَلِّي، فَلَمَّا رَكَعَ وَسَجَدَ وَتَشَهَّدَ دَعَا، فَقَالَ فِي دُعَائِهِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنَّ لَكَ الْحَمْدَ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ الْمَنَّانُ بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ، يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ، إِنِّي أَسْأَلُكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِأَصْحَابِهِ: «تَدْرُونَ بِمَا دَعَا؟»، قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَقَدْ دَعَا اللَّهَ بِاسْمِهِ الْعَظِيمِ، الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ، وَإِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووم، پیاوێکیش بەپێوە نوێژی دەکرد، کاتێك ڕکووعی برد و سوجدەی برد و شایەتمانی هێنا پاڕایەوە، لە پاڕانەوەکەیدا گوتی: خوایە من داوات لێ دەکەم بەوەی سوپاس و ستاییش هیی تۆیە، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە تۆ، خاوەن بەخششی

زۆری، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، ئەی خاوەن گەورەیی و مەزنی و ڕێز و شکۆ، ئەی زیندوو ئەی ڕاگر (ی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیانە)، من داوات لێ دەکەم، پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵەکانی فەرموو: «دەزانن بە چی پاڕایەوە؟»، گوتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: «سوێند بەو زاتەی نەفسی منی بەدەستە بە ناوی گەورە و مەزنی خوا پاڕایەوە، کە ئەگەر پێی بانگ بکرێت وەڵام دەداتەوە، ئەگەر داوای پێ بکرێت دەبەخشێت».

١٨٣. عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رضي الله عنه: أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي، قَالَ: «قُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْنِي، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ».

ئەبو بەکری صدیق رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: ئەو بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: نزایەکم فێر بکە لە نوێژەکانمدا پێی بپاڕێمەوە، فەرمووی: «بڵێ: خوایە من ستەمم لە نەفسی خۆم کردووە ستەمێکی زۆر، کەس لە گوناح خۆش نابێ مەگەر تۆ، لێم خۆش بە بە لێخۆشبوونێک لەلایەن خۆتەوە و ڕەحمم پێ بکە، بەڕاستی تۆ لێخۆشبووی بەبەزەیی».



١٨٤. عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ رضي الله عنه قَالَ: أَخَذَ بِيَدِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «إِنِّي لَأُحِبُّكَ يَا مُعَاذُ»، فَقُلْتُ: وَأَنَا أُحِبُّكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَلَا تَدَعْ أَنْ تَقُولَ فِي كُلِّ صَلَاةٍ: رَبِّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ».

موعازی کوڕی جەبەل رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گرتم و فەرمووی: «من خۆشم دەوێی ئەی موعاز»، گوتم: منیش خۆشم دەوێی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: «لەدوای هەر نوێژێک دەستبەرداری ئەم پاڕانەوەیە مەبە: پەروەردگارم یارمەتیم بدە لەسەر یادکردن و سوپاسکردن و باش پەرستنت».

## عَدَدُ التَّهْلِيلِ وَالذِّكْرِ بَعْدَ التَّسْلِيمِ

### ژمارەی تەهلیل و یادکردن دوای سەلامدانەوە

١٨٥. عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يُهَلِّلُ فِي دُبُرِ الصَّلَاةِ، يَقُولُ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَلَا نَعْبُدُ إِلَّا إِيَّاهُ، لَهُ النِّعْمَةُ وَلَهُ الْفَضْلُ وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ»، ثُمَّ يَقُولُ ابْنُ الزُّبَيْرِ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُهَلِّلُ بِهِنَّ فِي دُبُرِ الصَّلَاةِ.

ئەبو زوبەیر دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر رضي الله عنهما لەدوای هەموو نوێژێک تەهلیلی دەکرد و دەیگوت: «هیچ پەرستراوێک بەهەق نییە جگە لە خوای تاک و تەنهای بێ هاوبەش، هەموو موڵک و ستاییش بۆ ئەوە و بەسەر هەموو شتێکتدا بەتوانایە، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، جگە لەو کەس ناپەرستین، خاوەنی بەخشش و ستاییشی چاکە، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، بەدڵسۆزییەوە پەرستشی بۆ دەکەین ئەگەرچی بێبڕوایانیش پێیان ناخۆش بێت»، پاشان ئیبن زوبەیر دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ (بەم شێوەیە) تەهلیلی پێ دەکردن لەدوای هەموو نوێژێک.



## بَابُ قُعُودِ الْإِمَامِ فِي مُصَلَّاهُ بَعْدَ التَّسْلِيمِ

### باسی دانیشتنی ئیمام لە شوێنی خۆی لەدوای سەلامدانەوە

١٨٦. عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى الْفَجْرَ قَعَدَ فِي مُصَلَّاهُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ.

جابیری کوڕی سەمورە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك نوێژی

بەیانی بکردایە لە شوێنی نوێژەکەی دادەنیشت تا خۆر هەڵدەهات.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ مُبَادَرَةِ الْإِمَامِ بِالِانْصِرَافِ مِنَ الصَّلَاةِ

### باسی قەدەغەکردنی نوێژخوێن لەوەی پێش ئیمام هەڵسێت

١٨٧. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: «إِنِّي إِمَامُكُمْ، فَلَا تُبَادِرُونِي بِالرُّكُوعِ وَلَا بِالسُّجُودِ، وَلَا بِالْقِيَامِ وَلَا بِالِانْصِرَافِ، فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ أَمَامِي وَمِنْ خَلْفِي»، ثُمَّ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ رَأَيْتُمْ مَا رَأَيْتُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا»، قُلْنَا: مَا رَأَيْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «رَأَيْتُ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ».



ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک نوێژی بۆ کردین، پاشان ڕووی تێ کردین و فەرمووی: «من ئیمامی ئێوەم، پێشم مەکەون لە ڕکووع و سوجدە و لە هەڵسانەوە و ڕۆیشتنم (لەدوای تەواوبوونی نوێژ)، چونکە من لەپێش و لەدواوە دەتانبینم»، پاشان فەرمووی: «سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە ئەوەی من بینیم ئێوەش بتانبینیایە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان»، گوتمان: چیت بینیوە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: «بەهەشت و دۆزەخم بینی».



# كِتَابُ الْجُمْعَةِ

## پەرتووکی هەینی

### بَابُ التَّشْدِيدِ فِي التَّخَلُّفِ عَنِ الْجُمْعَةِ

### باسی هەڕەشەی توند لە نەڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی



١٨٨. عَنْ أَبِي الْجَعْدِ الضَّمْرِيِّ ﷺ وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَرَكَ ثَلَاثَ جُمَعٍ تَهَاوُنًا بِهَا طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِهِ».

ئەبو جەعدی زەمری ﷺ کە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بوو، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس واز لە سێ (نوێژی) هەینی بهێنێت وەك بەسووك سەیرکردنی، ئەوە بەهۆیەوە خوا مۆری ناوە بەسەر دڵیەوە».

١٨٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ عُمَرَ ﷺ يُحَدِّثَانِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ وَهُوَ عَلَى أَعْوَادِ مِنْبَرِهِ: «لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ، أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، وَلَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ».

ئیبن عەبباس و ئیبن عومەر ﷺ گێڕاویانەتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەرە

دارەکەی بوو فەرمووی: «خەڵکانێک واز لە هەینییەکانیان دێنن، نزیکە خوا مۆر بدات لەسەر دڵەکانیان و ببن بە یەکێک لەوانەی غافڵ و بێئاگان».



# كِتَابُ تَقْصِيرِ الصَّلَاةِ فِي السَّفَرِ

## پەرتووکی کورتکردنەوەی نوێژ لە گەشتدا



١٩٠. عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ، قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: {وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا} النساء: ١٠١، فَقَدْ أَمِنَ النَّاسُ، فَقَالَ عُمَرُ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: «صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللَّهُ بِهَا عَلَيْكُمْ فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ».

ئەبو یەعلای کوڕی ئومەییە دەڵێت: بە عومەری کوڕی خەتتابم رضي الله عنه گوت: {وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا}، بێگومان ئێستا خەڵکی لە ئاساییش و هێمنیدان (ئیدی بۆ نوێژ کورت دەکەنەوە)، پێشەوا عومەر رضي الله عنه گوتی: سەرم سووڕ ما لەوەی تۆ سەرت پێی سوڕما، پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی ئەوە، فەرمووی: «بەخششێکی خوایە بەخشیویەتی پێتان بەخششەکە وەربگرن».

١٩١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنَّا نَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ لَا نَخَافُ إِلَّا اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ نُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ.

ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێت: ئێمە لە نێوانی مەککە و مەدینەدا دەڕۆیشتین لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها و تەنها لە خوا ﷻ دەترساین، دوو ڕکات نوێژمان دەکرد.

١٩٢. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ فَلَمْ يَزَلْ يَقْصُرُ حَتَّى رَجَعَ فَأَقَامَ بِهَا عَشْرًا.

ئەنەس ﵁ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووم لە مەدینە بۆ مەککە بەردەوام نوێژی کورت دەکردەوە هەتا گەڕایەوە دە ڕۆژ لەوێ مایەوە.

## بَابُ الْمَقَامِ الَّذِي يُقْصَرُ بِمِثْلِهِ الصَّلَاةُ

### باسی مانەوە لەو شوێنەی کە نوێژی تێدا کورت دەکرێتەوە



١٩٣. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّهَا اعْتَمَرَتْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ حَتَّى إِذَا قَدِمَتْ مَكَّةَ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي قَصَرْتَ، وَأَتْمَمْتُ، وَأَفْطَرْتَ، وَصُمْتُ، قَالَ: «أَحْسَنْتِ يَا عَائِشَةُ»، وَمَا عَابَ عَلَيَّ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ عومرەی کرد لە مەدینە بۆ مەککە هەتا کاتێك گەیشتە مەککە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دایك و باوکم بەقوربانت بن نوێژت کورت کردەوە، من بەتەواوی کردم، ڕۆژووت نەگرت من گرتم، فەرمووی: «چاکت کرد ئەی عائیشە»، ڕەخنەی لێ نەگرتم.



# كِتَابُ الكُسُوف

## پەرتووکی (خۆر و مانگ) گیران

### كُسُوفُ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ

### گیرانی خۆر و مانگ



١٩٤. عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ تَعَالَى لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُخَوِّفُ بِهِمَا عِبَادَهُ».

ئەبو بەکرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێك ناگیرێن، بەڵام خوا ﷻ بەندەکانی خۆی پێ دەترسێنێت».

## التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ وَالدُّعَاءُ عِنْدَ كُسُوفِ الشَّمْسِ

### تەسبیحکردن و تەکبیر و پاڕانەوە لە کاتی خۆرگیران

١٩٥. عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَمُرَةَ ﵁ قَالَ: بَيْنَا أَنَا أَتَرَامَى بِأَسْهُمٍ لِي بِالْمَدِينَةِ إِذْ انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَجَمَعْتُ أَسْهُمِي، وَقُلْتُ: لَأَنْظُرَنَّ مَا أَحْدَثَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ، فَأَتَيْتُهُ مِمَّا يَلِي ظَهْرَهُ، وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَجَعَلَ يُسَبِّحُ، وَيُكَبِّرُ، وَيَدْعُو حَتَّى حُسِرَ عَنْهَا، قَالَ: ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ.

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمورە ﵁ دەڵێت: لە کاتێکدا من تیرم دەهاویشت لە مەدینە لەناکاو خۆر گیرا، تیرەکانم کۆ کردەوە و گوتم: دەچم بزانم پێغەمبەری خوا ﷺ باسی چی دەکات دەربارەی خۆرگیران، لەلای پشتیەوە دانیشتم، ئەو لەنێو مزگەوت بوو تەسبیح و تەکبیری دەکرد و دەپاڕایەوە هەتا خۆرگیرانەکە نەما، پاشان هەستا دوو ڕکات نوێژی کرد و چوار سوجدەی برد.



## خُرُوجُ الْإِمَامِ إِلَى الْمُصَلَّى لِلِاسْتِسْقَاءِ

### دەرچوونی ئیمام بۆ شوێنی نوێژەبارانە

١٩٦. عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ ﵁ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ إِلَى الْمُصَلَّى يَسْتَسْقِي، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَقَلَبَ رِدَاءَهُ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ.

عەبدوڵڵای کوڕی زەید ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دەرەوە بۆ نوێژگە بۆ نوێژەبارانە، ڕووی کردە قیبلە و عەباکەی هەڵگەڕاندەوە و دوو ڕکات نوێژی کرد.

## ذِكْرُ الدُّعَاءِ

### باسی نزا

١٩٧. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «اللَّهُمَّ اسْقِنَا».

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «خوایە بارانمان بۆ ببارێنیت».

## الْقَوْلُ عِنْدَ الْمَطَرِ

### چ دەگوترێت لە کاتی باران



١٩٨. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا أُمْطِرَ، قَالَ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ صَيِّبًا نَافِعًا».

عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك باران بباریایە دەیفەرموو: «خوایە بیکەیت بە بارانێکی بەسوود».



# كِتَابُ صَلَاةِ الْخَوْفِ

## پەرتووکی نوێژی ترس



١٩٩. عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ زَهْدَمٍ، قَالَ: كُنَّا مَعَ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِي بِطَبَرِسْتَانَ، فَقَالَ: أَيُّكُمْ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ؟ فَقَالَ حُذَيْفَةُ ﵁: أَنَا، فَقَامَ حُذَيْفَةُ فَصَفَّ النَّاسَ خَلْفَهُ صَفَّيْنِ، صَفًّا خَلْفَهُ وَصَفًّا مُوَازِيَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِي خَلْفَهُ رَكْعَةً ثُمَّ انْصَرَفَ هَؤُلَاءِ إِلَى مَكَانِ هَؤُلَاءِ، وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً وَلَمْ يَقْضُوا.

سەعلەبەی کوڕی زەهدەم دەڵێت: ئێمە لەگەڵ سەعیدی کوڕی عاص بووین لە تەبەریستان، گوتی: کامەتان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی کردووە؟ حوزەیفە ﵁ گوتی: من، جا حوزەیفە هەستا و خەڵکەکەی کرد بە دوو ڕیز لە پشتیەوە، ڕیزێك لە پشتیەوە، ڕیزێکیش ڕووبەڕووی دوژمن، یەك ڕکات نوێژی کرد بۆ ئەو ڕیزەی لە پشتیەوە بوون، پاشان ئەمانەی پشتی ڕۆیشتن بۆ شوێنی ئەوانەی ڕووبەڕووی دوژمن بوون، ئەوانیش هاتن یەك ڕکات نوێژی بۆ کردن، نوێژەکەیان قەزا نەکردەوە (لە کاتی ئاساییش).

٢٠٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِذِي قَرَدٍ، وَصَفَّ النَّاسَ خَلْفَهُ صَفَّيْنِ، صَفًّا خَلْفَهُ وَصَفًّا مُوَازِيَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ خَلْفَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ انْصَرَفَ هَؤُلَاءِ إِلَى مَكَانِ هَؤُلَاءِ، وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً وَلَمْ يَقْضُوا.

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە (ذی قرد) نوێژی كرد، خەڵكەكەی كرد بە دوو ڕیز لە پشتیەوە، ڕیزێك لە پشتیەوە، ڕیزێكیش ڕووبەڕووی دوژمن، یەك ڕكات نوێژی كرد بۆ ئەو ڕیزەی لە پشتیەوە بوون، پاشان ئەمانەی پشتی ڕۆیشتن بۆ شوێنی ئەوانەی ڕووبەڕووی دوژمن بوون، ئەوانیش هاتن یەك ڕكات نوێژی بۆ كردن، نوێژەكەیان قەزا نەكردەوە (لە كاتی ئاساییش).



# كِتَابُ صَلَاةِ الْعِيدَيْنِ

## پەرتووكی نوێژی هەردوو جەژنەكە

٢٠١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: كَانَ لِأَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ يَوْمَانِ فِي كُلِّ سَنَةٍ يَلْعَبُونَ فِيهِمَا، فَلَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ، قَالَ: «كَانَ لَكُمْ يَوْمَانِ تَلْعَبُونَ فِيهِمَا وَقَدْ أَبْدَلَكُمُ اللَّهُ بِهِمَا خَيْرًا مِنْهُمَا: يَوْمَ الْفِطْرِ، وَيَوْمَ الْأَضْحَى».



ئەنەسی كوڕی مالیك ﵁ دەڵێت: نەفامەكان لە هەر ساڵێكدا دوو ڕۆژیان هەبوو خۆشییان تێدا دەردەبڕی، كاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە، فەرمووی: «ئێوە دوو ڕۆژتان هەبوو خۆشیتان تێدا دەردەبڕی، خوا بۆتانی گۆڕی بە چاكتر لەو دووانە: جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربانی».

### تَرْكُ الْأَذَانِ لِلْعِيدَيْنِ

### وازهێنان لە بانگدان لە هەردوو جەژنەكەدا

٢٠٢. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي عِيدٍ قَبْلَ الْخُطْبَةِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ.

جابیر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەژندا نوێژی بۆ کردین پێش وتاردان، بەبێ بانگ و بەبێ قامەت.

## بَابُ صَلَاةِ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ

### باسی نوێژی هەردوو جەژنەکە پێش وتار

٢٠٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ ﷺ كَانُوا يُصَلُّونَ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ.

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر ﷺ، نوێژی هەردوو جەژنەکەیان دەکرد پێش وتاردان.



## الْإِنْصَاتُ لِلْخُطْبَةِ

### بێدەنگبوون و گوێگرتن بۆ وتار

٢٠٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ أَنْصِتْ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «کاتێك بە هاوەڵەکەت گوت بێدەنگ بە، ئیمامیش وتاری دەدا، ئەوە غەڵبەغەڵبت کردووە».



# كِتَابُ قِيَامِ اللَّيْلِ وَتَطَوُّعِ النَّهَارِ

# پەرتووکی شەونوێژ و سوننەتی ڕۆژ

## بَابُ الْحَثِّ عَلَى الصَّلَاةِ فِي الْبُيُوتِ وَالْفَضْلِ فِي ذَلِكَ

### باسی هاندان لەسەر نوێژکردن لە ماڵان و چاکەی ئەو کارە



٢٠٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ وَلَا تَتَّخِذُوهَا قُبُورًا».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نوێژ لە ماڵەکانتان بکەن و مەیکەن بە گۆڕستان».

٢٠٦. عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﵁ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْمَغْرِبِ فِي مَسْجِدِ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ، فَلَمَّا صَلَّى قَامَ نَاسٌ يَتَنَفَّلُونَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الصَّلَاةِ فِي الْبُيُوتِ».

کەعبی کوڕی عوجرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریبی کرد لە مزگەوتی نەوەکانی عەبدولئەشهەل، کاتێك نوێژی تەواو کرد خەڵکێك هەڵستان

نوێژی زیادەیان کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «پێویستە ئەم نوێژە لەماڵەوە بکەن».

## بَابُ صَلَاةِ الْقَاعِدِ فِي النَّافِلَةِ

## باسی نوێژی سوننەت بەدانیشتنەوە

٢٠٧. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى كَانَ أَكْثَرُ صَلَاتِهِ قَاعِدًا إِلَّا الْفَرِيضَةَ، وَكَانَ أَحَبُّ الْعَمَلِ إِلَيْهِ أَدْوَمَهُ وَإِنْ قَلَّ.

ئوم سەلەمە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەمرد هەتا زۆربەی نوێژەکانی بەدانیشتنەوە بوو جگە لە نوێژە فەرزەکان، وە خۆشەویستترین کردەوە بەلایەوە بەردەوامبوونی بوو لەسەری ئەگەرچی کەمیش بووایە.



## بَابُ كَيْفَ الْقِرَاءَةُ بِاللَّيْلِ

## باسی چۆنیەتی قورئانخوێندن بە شەو

٢٠٨. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِاللَّيْلِ يَجْهَرُ أَمْ يُسِرُّ؟ قَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ قَدْ كَانَ يَفْعَلُ رُبَّمَا جَهَرَ، وَرُبَّمَا أَسَرَّ.

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەیس دەڵێت: پرسیارم لە عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا کرد، قورئانخوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بووە لە شەودا، بە دەنگی بەرزی دەیخوێند یان بە نزم؟ گوتی: هەموو ئەوانەی دەکرد هەندێك جار بەدەنگی بەرز، هەندێك جاریش بە دەنگی نزم.

## بَابُ الْحَثِّ عَلَى الْوِتْرِ قَبْلَ النَّوْمِ

### باسی سووربوون لەسەر ویتر پێش خەوتن

٢٠٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ بِثَلَاثٍ: النَّوْمِ عَلَى وِتْرٍ، وَصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَرَكْعَتَيِ الضُّحَى.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: خۆشەویستم ﷺ وەسیەتی بۆ کردم بە سێ شت: خەوتن لەدوای ویتر، ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێك، دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالْوِتْرِ قَبْلَ الصُّبْحِ

### باسی فەرمانکردن بە ویتر پێش نوێژی بەیانی

٢١٠. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﵁ يَقُولُ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْوِتْرِ، فَقَالَ: «أَوْتِرُوا قَبْلَ الصُّبْحِ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ویتر، فەرمووی: «ویتر بکەن پێش نوێژی بەیانی».

## بَابُ كَيْفَ الْوِتْرُ بِإِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً

### باسی چۆنیەتی یازدە ڕکات ویتر

٢١١. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً وَيُوتِرُ مِنْهَا بِوَاحِدَةٍ، ثُمَّ يَضْطَجِعُ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ لە شەودا یازدە ڕکات نوێژی دەکرد، یەك ڕکاتی دەکردە تاکی ئەو نوێژانەی کردوویەتی، پاشان بە لای ڕاستیدا پاڵ دەکەوت.

## بَابُ مَنْ كَانَ لَهُ صَلَاةٌ بِاللَّيْلِ فَغَلَبَهُ عَلَيْهَا النَّوْمُ

### باسی هەرکەسێك لە شەودا شەونوێژ بکات و خەو زۆری بۆ بهێنێت

٢١٢. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنَ امْرِئٍ تَكُونُ لَهُ صَلَاةٌ بِلَيْلٍ فَغَلَبَهُ عَلَيْهَا نَوْمٌ إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ أَجْرَ صَلَاتِهِ، وَكَانَ نَوْمُهُ صَدَقَةً عَلَيْهِ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هیچ کەسێك نییە لە شەودا شەونوێژ بکات خەو زاڵ بێت بەسەریدا و زۆری بۆ بهێنێت ئیللا خوا پاداشتی نوێژەکەی بۆ دەنووسێت، خەوەکەشی دەبێتە بەخشش بۆی».



# كِتَابُ الْجَنَائِزِ

## پەرتووکی جەنازە

### بَابُ تَمَنِّي الْمَوْتِ

باسی ئاواتخواستنی مردن

٢١٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمُ الْمَوْتَ، إِمَّا مُحْسِنًا فَلَعَلَّهُ أَنْ يَزْدَادَ خَيْرًا، وَإِمَّا مُسِيئًا فَلَعَلَّهُ أَنْ يَسْتَعْتِبَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «با هیچ کەسێکتان ئاواتی مردن نەخوازێت، یان چاکەخوازە، بەڵکوو لە ژیاندا خێر و چاکەی زیاتر بکات، یان گوناهبارە، بەڵکوو لە ژیاندا داوای لێخۆشبوون بکات و بگەڕێتەوە لە گوناهو خراپە».

### الدُّعَاءُ بِالْمَوْتِ

نزاکردنی مردن

٢١٤. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَدْعُوا بِالْمَوْتِ وَلَا تَتَمَنَّوْهُ،

فَمَنْ كَانَ دَاعِيًا لَا بُدَّ فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي».

ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «داوای مردن مەکەن و ئاواتی بۆ مەخوازن، ئەگەر کەسێك هەر داوا دەکات با بڵێ: خوایە بمژیێنە هەتا ژیان خێری تێدایە بۆم، وە بممرێنە ئەگەر مردن خێری تێدایە بۆم».

## كَثْرَةُ ذِكْرِ الْمَوْتِ

### زۆر یادکردنەوەی مردن

٢١٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ».



ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زۆر یادی ڕوخێنەری چێژ و لەزەتەکان بکەنەوە (کە مردنە).

## فِيمَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ

### دەربارەی کەسێك حەز بکات بە گەیشتن بە خوا

٢١٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ»، قَالَ شُرَيْحٌ: فَأَتَيْتُ عَائِشَةَ، فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَذْكُرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدِيثًا إِنْ كَانَ كَذَلِكَ فَقَدْ هَلَكْنَا، قَالَتْ: وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ»، وَلَكِنْ لَيْسَ مِنَّا أَحَدٌ إِلَّا وَهُوَ يَكْرَهُ الْمَوْتَ، قَالَتْ: قَدْ قَالَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَيْسَ بِالَّذِي تَذْهَبُ إِلَيْهِ، وَلَكِنْ إِذَا طَمَحَ الْبَصَرُ،

وَحَشْرَجَ الصَّدْرُ، وَاقْشَعَرَّ الْجِلْدُ فَعِنْدَ ذَلِكَ مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك حەز بکات بگات بە خوا، خواش حەز دەکات بە گەیشتنی، هەر کەسێك پێی ناخۆش بێت بگات بە خوا، خواش گەیشتنی ئەوی پێناخۆشە»، شورەیح دەڵێت: چوومە خزمەت خاتوو عائیشە، گوتم: ئەی دایکی بڕواداران، بیستم ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ باسی فەرموودەیەکی دەکرد، ئەگەر بەو شێوەیە بێت ئێمە تیا چووین، گوتی: ئەو فەرموودەیە چییە؟ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك حەز بکات بگات بە خوا، خواش حەز دەکات بە گەیشتنی، هەر کەسێك پێیناخۆش بێت بگات بە خوا، خواش گەیشتنی ئەوی پێناخۆشە»، بەڵام هیچ یەکێك لە ئێمە نییە حەزی لە مردن بێت، عائیشە دەڵێت: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرمووە، بەڵام نەك بەو شێوەیەی تۆ بۆی چوویت، بەڵکوو ئەگەر چاو ئەبڵەق بوو، ڕووح گەیشتە غەرغەرە و سینگ توووند بوو نەفس کەوتە دووودڵییەوە، پێستیشی تەزووی پێدا هات، ئەو کاتە هەر کەسێك حەز بکات بگات بە خوا، خواش حەز دەکات بە گەیشتنی، هەر کەسێك پێیناخۆش بێت بگات بە خوا، خواش گەیشتنی ئەوی پێناخۆشە.



## تَقْبِيلُ الْمَيِّتِ

## ماچکردنی مردوو

٢١٧. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﵁، قَبَّلَ بَيْنَ عَيْنَيِ النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ مَيِّتٌ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: ئەبو بەکر ﵁ نێوچاوانی پێغەمبەری ﷺ ماچ کرد، لە کاتێکدا کە مردبوو.

## فِي الْبُكَاءِ عَلَى الْمَيِّتِ

### دەربارەی گریان لەسەر مردوو

٢١٨. عَنْ أَنَسٍ ﵁ أَنَّ فَاطِمَةَ بَكَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ مَاتَ فَقَالَتْ: يَا أَبَتَاهُ مِنْ رَبِّهِ مَا أَدْنَاهُ؟ يَا أَبَتَاهُ إِلَى جِبْرِيلَ نَنْعَاهْ، يَا أَبَتَاهُ جَنَّةُ الْفِرْدَوْسِ مَأْوَاهْ.

ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد فاتیمە گریا، گوتی: ئای باوکی من چەندە لە پەروەردگارت نزیکی، ئای باوکی من هەواڵی مردنت دەدەین بە جیبریل، ئای باوکی من بەهەشتی فیردەوس جێگایەتی.

## أَرْوَاحُ الْمُؤْمِنِينَ

### ڕووحی بڕواداران



٢١٩. عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا نَسَمَةُ الْمُؤْمِنِ طَائِرٌ فِي شَجَرِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَبْعَثَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلَى جَسَدِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

کەعبی کوڕی مالیك ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان ڕووحی بڕوادار باڵندەیەکە لەنێو دار و درەختەکانی بەهەشت هەتا خوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەینێرێت بۆ نێو لاشەکەی».

٢٢٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ ابْنِ آدَمَ يَأْكُلُهُ التُّرَابُ إِلَّا عَجْبَ الذَّنَبِ مِنْهُ خُلِقَ، وَفِيهِ يُرَكَّبُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەموو نەوەیەکی ئادەم خۆڵ دەیخوات جگە لە (عَجْبَ الذَّنَبِ)، چونکە لەوە دروست کراوە، لەوەش

دروست دەكرێتەوە جارێكی دیكە».

تێبینی:

(عَجْبَ الذَّنَبِ): ئێسكێكە لە خوارەوەی پشتە، بنچینە و بناغەی مرۆڤە و لەوە دروست كراوە و دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی جارێكی دیكە ئادەمی لەسەر دروست بكرێتەوە.

## الْبَعْثُ

### زیندووكردنەوە



٢٢١. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عُرَاةً غُرْلاً، وَأَوَّلُ الْخَلَائِقِ يُكْسَى إِبْرَاهِيمُ عليه السلام»، ثُمَّ قَرَأَ: «{كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ} الأنبياء: ١٠٤».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: «ئێوە دەگەن بە خوا عزوجل بۆ لێپرسینەوە و پاداشتدانەوە بەپێپەتی و ڕووتوقووتی و خەتەنەنەكراوی، هەروەها لە ڕۆژی دواییدا یەكەم كەس لە دروستكراوەكاندا ئیبراهیم عليه السلام پۆشاكی لەبەر دەكرێت». پاشان ئەمەی خوێندەوە: «{كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ}».



# كتاب الصِّيَامِ

## پەرتووکی ڕۆژوو

### بَابُ وُجُوبِ الصِّيَامِ

### باسی پێویست (یان واجب) بوونی ڕۆژوو



٢٢٢. عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ ﵁ أَنَّ أَعْرَابِيًّا جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَائِرَ الرَّأْسِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَخْبِرْنِي مَاذَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ؟ قَالَ: «الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ شَيْئًا»، قَالَ: أَخْبِرْنِي بِمَا افْتَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الصِّيَامِ؟ قَالَ: «صِيَامُ شَهْرِ رَمَضَانَ إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ شَيْئًا»، قَالَ: أَخْبِرْنِي بِمَا افْتَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الزَّكَاةِ؟ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَرَائِعِ الْإِسْلَامِ، فَقَالَ: وَالَّذِي أَكْرَمَكَ، لَا أَتَطَوَّعُ شَيْئًا لَا أَنْقُصُ مِمَّا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ شَيْئًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ أَوْ دَخَلَ الْجَنَّةَ إِنْ صَدَقَ».

تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ قژی ئاڵۆز و تێکئاڵاو بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا چی فەڕز کردووە لەسەرم لە نوێژ؟ فەرمووی: «پێنج نوێژی فەڕز کردووە مەگەر نوێژی

زیادە بکەیت»، گوتی: هەواڵم بدەرێ خوا چی لە ڕۆژوو فەرز کردووە لەسەرم؟ فەرمووی: «ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان مەگەر ڕۆژووی زیادە بگریت»، گوتی: هەواڵم بدەرێ خوا چی لە زەکات فەرز کردووە لەسەرم؟ هەواڵی پێ دا بەوەی شەریعەتی ئیسلام فەرزی کردووە، گوتی: سوێند بەو خوایەی بەڕێزی کردووی نە لەوە زیاتر دەکەم و نە لەوە کەمتر دەکەم کە خوا فەرزی کردووە لەسەرم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «سەرفراز بوو ئەگەر ڕاست بکات، یان چووە بەهەشتەوە ئەگەر ڕاست بکات».

## بَابُ الْفَضْلِ وَالْجُودِ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ

## باسی چاکە و بەخشندەیی لە مانگی ڕەمەزان



٢٢٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ، وَكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ عليه السلام، وَكَانَ جِبْرِيلُ يَلْقَاهُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ فَيُدَارِسُهُ الْقُرْآنَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ.

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشندەترینی نێو خەڵکی بوو، لە ڕەمەزاندا زۆر زیاتر بەخشندەتر دەبوو کاتێك کە جیبریل عليه السلام پێی دەگەیشت، جیبریل لە هەموو شەوێکی مانگی ڕەمەزان پێی دەگەیشت دەوری قوڕئانی لەگەڵ دەکردەوە، دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێك جیبریل پێی دەگەیشت لە شنەی شەماڵ بەخشندەتر بوو.

## بَابُ فَضْلِ شَهْرِ رَمَضَانَ

### باسی پێگە و گەورەیی مانگی ڕەمەزان

٢٢٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَخَلَ رَمَضَانُ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێك مانگی ڕەمەزان هات دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە، دەرگاکانی ئاگریش دادەخرێن، شەیتانەکانیش دەبەسترێنەوە».

## الْحَثُّ عَلَى السَّحُورِ

### هاندان بۆ پارشێوکردن



٢٢٥. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً».

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پارشێو بکەن، چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە».

## قَدْرُ مَا بَيْنَ السُّحُورِ وَبَيْنَ صَلَاةِ الصُّبْحِ

### ئەندازەی نێوان پارشێو و نێوان نوێژی بەیانی

٢٢٦. عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: تَسَحَّرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قُمْنَا إِلَى الصَّلَاةِ، قُلْتُ: كَمْ كَانَ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: قَدْرُ مَا يَقْرَأُ الرَّجُلُ خَمْسِينَ آيَةً.

زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ پارشێومان کرد، پاشان هەڵساین بۆ نوێژ، گوتم: ماوەی نێوانیان چەند بوو؟ گوتی: بەئەندازەی ئەوەی کەسێک پەنجا ئایەت بخوێنێت.

## دَعْوَةُ السَّحُورِ

## بانگکردن بۆ پارشێو

٢٢٧. عَنْ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يَدْعُو إِلَى السَّحُورِ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، وَقَالَ: «هَلُمُّوا إِلَى الْغَدَاءِ الْمُبَارَكِ».

عیربازی کوڕی ساریە ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بانگی دەکرد بۆ پارشێوکردن لە مانگی ڕەمەزان، فەرمووی: «وەرن بۆ خواردنی بەبەرەکەت».



## فَصْلُ مَا بَيْنَ صِيَامِنَا وَصِيَامِ أَهْلِ الْكِتَابِ

## جیاوازی لە نێوان ڕۆژووی ئێمە و ڕۆژووی خاوەن کتێبەکان

٢٢٨. عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ فَصْلَ مَا بَيْنَ صِيَامِنَا وَصِيَامِ أَهْلِ الْكِتَابِ أَكْلَةُ السَّحُورِ».

عەمری کوڕی عاص ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان جیاوازی لە نێوان ڕۆژووی ئێمە و ڕۆژووی خاوەن کتێبەکان خواردنی پارشێوە».

## التَّسْهِيلُ فِي صِيَامِ يَوْمِ الشَّكِّ

## ئاسانکاری لە ڕۆژووگرتنی ئەو ڕۆژەی گومانی تێدایە

٢٢٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: «أَلَا لَا تَقَدَّمُوا الشَّهْرَ بِيَوْمٍ أَوِ اثْنَيْنِ، إِلَّا رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صِيَامًا فَلْيَصُمْهُ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «ئاگادار بن پێش مانگی ڕەمەزان مەکەون بە ڕۆژووگرتنی ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ، مەگەر کەسێک پێشتر ڕۆژووی گرتبێت، ئەوە با ڕۆژوو بگرێت».

## بَابُ ثَوَابِ مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ



## باسی پاداشتی ئەو کەسەی ڕۆژێک بۆ خوا بەڕۆژوو بووە

٢٣٠. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بَاعَدَ اللَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّارِ بِذَلِكَ الْيَوْمِ سَبْعِينَ خَرِيفًا».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک ڕۆژێک لەپێناو خوادا بەڕۆژوو بووبێت، خوا نێوان ئەو و ئاگر حەفتا پاییز دوور دەخاتەوە بەهۆی ئەو ڕۆژەوە».

## بَابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ الصِّيَامِ فِي السَّفَرِ

### باسی ئەوەی بە ناپەسند دانراوە لە ڕۆژووگرتن لە گەشتدا

٢٣١. عَنْ كَعْبِ بْنِ عَاصِمٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ».

کەعبی کوڕی عاصیم رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «ڕۆژووگرتن لە گەشتدا لە چاکەکاری نییە».

## بَابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ الصِّيَامِ فِي السَّفَرِ

### باسی ئەوەی قەدەغە کراوە لە ڕۆژووگرتن لە گەشتدا



٢٣٢. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِرَجُلٍ فِي ظِلِّ شَجَرَةٍ يُرَشُّ عَلَيْهِ الْمَاءُ، قَالَ: «مَا بَالُ صَاحِبِكُمْ هَذَا؟»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ صَائِمٌ، قَالَ: «إِنَّهُ لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ أَنْ تَصُومُوا فِي السَّفَرِ، وَعَلَيْكُمْ بِرُخْصَةِ اللَّهِ الَّتِي رَخَّصَ لَكُمْ فَاقْبَلُوهَا».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بەلای پیاوێک لە سێبەری دارێکدا بوو ئاویان دەپڕژاندا بەسەریدا، فەرمووی: «ئەوە هاوەڵەکەتان چیەتی؟»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕۆژووە، فەرمووی: «بێگومان نیشانەی چاکەکاری نییە ڕۆژوو بگرن لە گەشتدا (وەکوو هاوەڵەکەتان)، دەست بگرن بە مۆڵەت و ئاسانکاری خوا کە مۆڵەتی پێ داون و وەریبگرن».

## صَوْمُ النَّبِيِّ ﷺ بأَبِي هُوَ وأُمِّي

## ڕۆژووی پێغەمبەر ﷺ دایک و باوکم بەقوربانی بن

٢٣٣. عَنْ أُسَامَةَ بْن زَيْدٍ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ تَصُومُ حَتَّى لَا تَكَادَ تُفْطِرُ، وَتُفْطِرُ حَتَّى لَا تَكَادَ أَنْ تَصُومَ، إِلَّا يَوْمَيْنِ إِنْ دَخَلَا فِي صِيَامِكَ وَإِلَّا صُمْتَهُمَا، قَالَ: «أَيُّ يَوْمَيْنِ؟»، قُلْتُ: يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، قَالَ: «ذَانِكَ يَوْمَانِ تُعْرَضُ فِيهِمَا الْأَعْمَالُ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ، فَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ».

ئوسامەی کوڕی زەید رضي الله عنه دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ ئەوەندە بەڕۆژوو دەبیت تا خەریکە (بڵێم ڕۆژێک نییە) بە ڕۆژوو نەبیت، ئەوەندەش ڕۆژوو ناگریت تا خەریکە بەڕۆژوو نەبیت، جگە لە دوو ڕۆژ نەبێت ئەگەر بکەوێتە نێو ڕۆژەکانی بەڕۆژووبوونت، یان ئەو ڕۆژانەی بێڕۆژوویت حەتمەن هەر دەیانگریت، فەرمووی: «کام دوو ڕۆژ؟»، وتم: ڕۆژی دووشەممە و ڕۆژی پێنجشەممە، فەرمووی: «ئەوە دوو ڕۆژە کردەوەکان لای پەروەردگاری جیهانییان دەخرێنە ڕوو، حەز دەکەم کردەوەکانم بخرێنە ڕوو من بەڕۆژوو بم».

٢٣٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِرَكْعَتَيِ الضُّحَى، وَأَنْ لَا أَنَامَ إِلَّا عَلَى وِتْرٍ، وَصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ.

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردم بە دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو، وە نەخەوم تا نوێژی ویتر دەکەم، وە لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ ڕۆژوو بگرم.

## النَّهْيُ عَنْ صِيَامِ الدَّهْرِ

### قەدەغەی بەڕۆژووبوون لە تەواوی ساڵ

٢٣٥. عَنْ عِمْرَانَ ﷺ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فُلَانًا لَا يُفْطِرُ نَهَارًا الدَّهْرَ، قَالَ: «لَا صَامَ وَلَا أَفْطَرَ».

عیمڕان ﷺ دەڵێت: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا، فڵانە کەس بەدرێژایی ڕۆژەکانی ساڵ ڕۆژوو ناشکێنێت، فەرمووی: «نە بەڕۆژوو بووە و نە بێڕۆژووش بووە».

# كِتَابُ الزَّكَاةِ

## پەرتووکی زەکات

### بَابُ وُجُوبِ الزَّكَاةِ

باسی پێویستبوونی زەکات



٢٣٦. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِمُعَاذٍ حِينَ بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ: «إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ، فَإِذَا جِئْتَهُمْ فَادْعُهُمْ إِلَى أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ بِذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ ﷻ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ -يَعْنِي- أَطَاعُوكَ بِذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ ﷻ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ بِذَلِكَ، فَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە موعازی فەرموو کاتێك ناردی بۆ یەمەن: «تۆ دەچیت بۆ لای خەڵکانێک لە خاوەن کتێبەکان، کاتێك چوویت بۆ لایان بانگیان بکە بۆ ئەوەی شایەتمان بێنن بە: (أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ)، جا ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵیی تۆیان کرد بەو شایەتمانە، ئەوە پێیان ڕابگەیەنە کە

بەڕاستی خوا ﷻ پێنج نوێژی لەسەریان فەرز کردووە لە شەو و ڕۆژێکدا، جا ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵیی تۆیان کرد بەوە، ئەوە پێیان ڕابگەیەنە کە بەڕاستی خوا زەکاتی لەسەریان فەرز کردووە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێت و دەگەڕێنرێتەوە بۆ هەژارەکانیان، جا ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵییان کردی بەوە، ئەوە لە نزای ستەملێکراو بترسە».

٢٣٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ مِنْ شَيْءٍ مِنَ الْأَشْيَاءِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، دُعِيَ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ يَا عَبْدَ اللَّهِ هَذَا خَيْرٌ لَكَ، وَلِلْجَنَّةِ أَبْوَابٌ، فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلَاةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلَاةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ»، قَالَ أَبُو بَكْرٍ رضي الله عنه: هَلْ عَلَى مَنْ يُدْعَى مِنْ تِلْكَ الْأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ، فَهَلْ يُدْعَى مِنْهَا كُلِّهَا أَحَدٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «نَعَمْ، وَإِنِّي أَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ»، يَعْنِي: أَبَا بَكْرٍ.



ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەس دوو جووت لە شتێک لە شتەکان ببەخشێت لەپێناو خوا (بۆ نموونە: دوو وشتر، یان دوو مەڕ یان ... هتد)، لە دەرگاکانی بەهەشتەوە بانگ دەکرێت ئەی بەندەی خوا ئەمە خێر و پاداشتێکە خوا ئامادەی کردووە بۆ تۆ، بەهەشتیش چەندین دەرگای هەیە، جا هەر کەس لە ئەهلی نوێژ بێت لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێت، هەر کەس لە ئەهلی جیهاد بێت لە دەرگای جیهادەوە بانگ دەکرێت، هەر کەس لە ئەهلی خێر و سەدەقە و زەکات بێت لە دەرگای خێر و سەدەقە و زەکاتەوە بانگ دەکرێت، هەر کەس لە ئەهلی ڕۆژوو بێت لە دەرگای ڕەییانەوە بانگ دەکرێت»، ئەبو بەکری صدیق رضي الله عنه گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا پێویست دەکات کەسێک لەو هەموو دەرگایانەوە بانگ بکرێت، (چونکە لە هەر دەرگایەکیانەوە چووە ژوورەوە ڕزگاری دەبێت)، ئایا کەسێک هەیە لە هەموو دەرگاکانەوە بانگ بکرێت؟ فەرمووی: «بەڵێ،

ئومێد دەکەم تۆ لەوانە بیت»، واتە: ئەبو بەکر.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي حَبْسِ الزَّكَاةِ

## باسی هەڕەشەکردن لە دەرنەکردنی زەکات

٢٣٨. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: جِئْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ جَالِسٌ فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ، فَلَمَّا رَآنِي مُقْبِلًا، قَالَ: «هُمُ الْأَخْسَرُونَ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ»، فَقُلْتُ: مَا لِي لَعَلِّي أُنْزِلَ فِيَّ شَيْءٌ، قُلْتُ: مَنْ هُمْ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي؟ قَالَ: «الْأَكْثَرُونَ أَمْوَالًا، إِلَّا مَنْ قَالَ: هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا»، حَتَّى بَيْنَ يَدَيْهِ، وَعَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ شِمَالِهِ، ثُمَّ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَا يَمُوتُ رَجُلٌ فَيَدَعُ إِبِلًا أَوْ بَقَرًا لَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهَا، إِلَّا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا كَانَتْ وَأَسْمَنَهُ تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، كُلَّمَا نَفِدَتْ أُخْرَاهَا أُعِيدَتْ أُولَاهَا حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ».

ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێت: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە سێبەری کەعبە دانیشتبوو، کە بینیی بەرەو ڕووی دەڕۆیشتم، فەرمووی: «سوێند بە پەروەردگاری کەعبە ئەوانە زەرەرمەند بوون»، گوتم: ڕەنگە شتێکم بۆ ڕوو بدات، گوتم: ئەوانە کێن دایک و باوکم بەقوربانت بن، فەرمووی: «ئەوانەی ماڵ و سامانیان زۆرە، جگە لە کەسێک نەبێت دەبەخشێت بەو شێوە و بەو شێوە و بەو شێوە»، لە پێشی و لای ڕاستی و لای چەپی، پاشان فەرمووی: «سوێند بە خوا هەرکەس بمرێت وشترێک، یان مانگایەک جێ بهێڵێت زەکاتی دەرنەکردبێت لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر گەورەتر دێت، بە سمەکانی دەیشێلێت و بە شاخەکانی قۆچی لێ دەدات، کاتێك کۆتاییەکەیان تەواو دەبێت یەکەمینیان دەست پێ دەکاتەوە تا بڕیار لە نێوان خەڵکیدا دەدرێت».

٢٣٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ رَجُلٍ لَهُ مَالٌ لَا يُؤَدِّي

حَقَّ مَالِهِ إِلَّا جُعِلَ لَهُ طَوْقًا فِي عُنُقِهِ، شُجَاعٌ أَقْرَعُ وَهُوَ يَفِرُّ مِنْهُ وَهُوَ يَتْبَعُهُ»، ثُمَّ قَرَأَ مِصْدَاقَهُ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ ﷻ: «﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ آل عمران: ١٨٠».

عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر پیاوێک سامانێکی هەبێت زەکاتەکەی دەرنەکات، ئەوە خوا ئەو سامانە دەکات بە پیرەمارێکی کەچەڵ لە گەردنی دەئاڵێت، ئەو لێی ڕادەکا و ئەویش شوێنی دەکەوێت»، پاشان پشتڕاستکەرەوەی ئەمەی لە کتێبی خوادا ﷻ خوێندەوە: «﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾، واتە: هەرگیز وا گومان نەبەن ئەو کەسانەی کە چرووکی دەکەن بەوەی خوا پێی بەخشیون لە ڕێز و بەهرەی خۆی کە ئەو چرووکییە چاکترە بۆیان، نا وا نییە، بەڵکوو ئەوە خراپە بۆیان، ئەوەی چرووکییان پێی دەکرد بەزوویی وەک تەوق دەکرێتە ملیان لە ڕۆژی دواییدا».

## بَابُ مَانِعِ الزَّكَاةِ

### باسی ئەوانەی زەکات نادەن

٢٤٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَهُ وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ، قَالَ عُمَرُ، لِأَبِي بَكْرٍ: كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَمَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ، إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ»، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﵁: لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عِقَالًا كَانُوا يُؤَدُّونَهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهِ قَالَ عُمَرُ ﵁: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ رَأَيْتُ اللَّهَ

شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد، پاشان لەدوای ئەو ئەبو بەکر کرا بە جێنشینی، ئەوەی بێبڕوا بوویەوە لە عەرەبەکان بێڕوا بوویەوە، (ئەبو بەکر ﵁ گوتی: یان زەکات دەدەن یان دەجەنگم لەگەڵتان)، عومەر ﵁ بە ئەبو بەکری ﵁ گوت: چۆن لەگەڵ ئەو خەڵکە دەجەنگیت، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «فەرمانم پێ کراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، جا هەر کەس گوتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، ماڵ و نەفسی پارێزراوە، مەگەر بە هەقی ئیسلام نەبێت، لێپرسینەوەشی لای خوایە». ئەبو بەکر ﵁ گوتی: سوێند بە خوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان نوێژ و زەکات، چونکە زەکات مافی ماڵ و سامانە، سوێند بە خوا ئەگەر ڕێگری بکەن گوریسێکم نەدەنێ (لە ماڵی زەکات) کە پێشتر دابێتیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگیان لەگەڵ دەکەم لەسەر نەدانی، عومەر ﵁ گوتی: سوێند بە خوا تەنها خوا دڵی ئەبو بەکری خستە سەر بڕیاردانی جەنگ، منیش بۆم دەرکەوت ئەو لەسەر هەقە.



## بَابُ زَكَاةِ الْإِبِلِ

### باسی زەکاتی وشتر

٢٤١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە دەغڵودان و خورمادا لە پێنج ویسق کەمتر زەکاتی ناکەوێت (ئەویش بەرانبەرە بە ٦٥٢ کغم)، لە پێنج سەر وشتر کەمتر زەکاتی تێدا نییە، لە زیویشدا لە پێنج ئوقیە

کەمتر زەکاتی ناکەوێت (هەر ئوقیەیەکیش چل درهەمە، کە پێنج ئوقیە دەکاتە دوو سەد درهەم زیو)».

## بَابُ زَكَاةِ الْبَقَرِ

## باسی زەکاتی مانگا

٢٤٢. عَنْ مُعَاذٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ وَأَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ مِنْ كُلِّ حَالِمٍ دِينَارًا أَوْ عِدْلَهُ مَعَافِرَ، وَمِنَ الْبَقَرِ مِنْ ثَلَاثِينَ تَبِيعًا أَوْ تَبِيعَةً، وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةً.

موعاز ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ یەمەن، فەرمانی پێ کرد دینارێک یان لە بری ئەوە گوێرەکەیەکی یەکساڵە بە سەرانە لە هەموو کەسێکی باڵغ وەربگرێت، لە زەکاتی مانگاش لە سی دانە گوێرەکەیەکی یەکساڵە، نێر بێت یان مێ، وە لە هەموو چل دانەیەک گوێرەکەیەکی دوو ساڵە وەربگرێت.

## بَابُ مَانِعِ زَكَاةِ الْبَقَرِ

## باسی ئەو کەسانەی زەکاتی مانگا و ڕەشەوڵاخ نادەن

٢٤٣. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ وَلَا بَقَرٍ وَلَا غَنَمٍ لَا يُؤَدِّي حَقَّهَا، إِلَّا وُقِفَ لَهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِقَاعٍ قَرْقَرٍ تَطَؤُهُ ذَاتُ الْأَظْلَافِ بِأَظْلَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ ذَاتُ الْقُرُونِ بِقُرُونِهَا، لَيْسَ فِيهَا يَوْمَئِذٍ جَمَّاءُ وَلَا مَكْسُورَةُ الْقَرْنِ». قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَاذَا حَقُّهَا؟ قَالَ: «إِطْرَاقُ فَحْلِهَا، وَإِعَارَةُ دَلْوِهَا، وَحَمْلٌ عَلَيْهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَلَا صَاحِبِ مَالٍ لَا يُؤَدِّي حَقَّهُ، إِلَّا يُخَيَّلُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعٌ أَقْرَعُ يَفِرُّ مِنْهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يَتَّبِعُهُ يَقُولُ لَهُ: هَذَا كَنْزُكَ الَّذِي كُنْتَ تَبْخَلُ بِهِ، فَإِذَا رَأَى أَنَّهُ

لَا بُدَّ لَهُ مِنْهُ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي فِيهِ، فَجَعَلَ يَقْضَمُهَا كَمَا يَقْضَمُ الْفَحْلُ».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ خاوەن وشتر، یان مانگا، یان مەڕ و بزنێک نییە مافی نەدابێت لە ئاژەڵەکان، ئیللا لە ڕۆژی دواییدا دەوەستێنرێت لە دەشتاییەکی تەختدا، ئەوانەی کە سمیان هەیە بە سمەکانیان دەیشێلن، ئەوانەش کە شاخیان هەیە بە شاخەکانیان بەر قۆچی دەدەن، لەو ڕۆژەدا ئاژەڵێکی بێشاخ و شاخشکاویان تێدا نییە»، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ماف پێدانی ئەوانە چۆنە؟ فەرمووی: «بەکەڵدانیان و پێدانیان بە خەڵک بۆ ئاو دەرهێنان لە بیردا، باریان پێ هەڵبگیرێت لەپێناو خوا، وە خاوەن هیچ ماڵ و سامانێک نییە کە مافی ماڵ و سەروەتەکەی دەرنەکات، حەتمەن لە ڕۆژی دواییدا بۆی دەبێتە پیرەمارێکی کەچەڵ شوێنی دەکەوێت و خاوەنەکەی لێی ڕادەکات، ئەویش شوێنی دەکەوێت و پێی دەڵێت: ئەمە گەنجینەکەتە کە لە دونیادا ڕەزیلیت لێ دەکرد، کاتێک زانی ڕزگاری نابێت لێی، دەستی دەخاتە نێو دەمیەوە ئەویش گازی لێ دەگرێت وەک چۆن ئاژەڵی نێرە گاز دەگرێت».



## بَابُ الْجَمْعِ بَيْنَ الْمُتَفَرِّقِ وَالتَّفْرِيقِ بَيْنَ الْمُجْتَمِعِ

### باسی تێکەڵکردنی ئاژەڵی جیاکراوە و جیاکردنەوەی ئاژەڵی تێکەڵکراو

٢٤٤. عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ ﵁ قَالَ: أَتَانَا مُصَدِّقُ النَّبِيِّ ﷺ فَأَتَيْتُهُ فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: إِنَّ فِي عَهْدِي أَنْ لَا نَأْخُذَ رَاضِعَ لَبَنٍ، وَلَا نَجْمَعَ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلَا نُفَرِّقَ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ بِنَاقَةٍ كَوْمَاءَ فَقَالَ: خُذْهَا، فَأَبَى.

سوەیدی کوڕی غەفەلە ﵁ دەڵێت: فەرمانبەر و کۆکەرەوەی زەکات لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ هات بۆ لامان، منیش چووم بۆ لای گوێم لێ بوو دەیوت: لە

سەردەمی مندا ئاژەڵی شیردەرمان وەرنەدەگرت، ئاژەڵی جیامان تێکەڵ نەدەکرد، ئاژەڵی تێکەڵیشمان جیا نەدەکردەوە، لە ترسی زەکات پیاوێک دەهات بۆ لای بە وشترێکی زۆر چاک دەیگوت: وەریبگرە، ئەویش وەرینەدەگرت.

✍ تێبینی:

دروست نییە دوو خاوەن مەڕومالات مەڕەکانیان لەیەکدی جیا بێت و یەک زەکات بدەن، بۆ نموونە: ئەگەر هەریەکە و چل سەریان هەبوو، لە کاتی دەرکردنی زەکات کۆیان بکەنەوە بۆ ئەوەی هەردووکیان یەک سەر زەکات دەربکەن، ئەوە دروست نییە، بەڵکوو دەبێ لەم کاتەدا هەر یەکە و زەکاتی خۆی بەجیا بدات، هەروەها نابێت دوو کەس مەڕومالاتیان پێکەوە بێت لەیەکدی جیایان بکەنەوە لەبەر دەرکردنی زەکات، ئەگەر هەردووکیان تێکەڵ بوون ئەوە بەیەکسانی زەکات دەردەکەن.



٢٤٥. عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ سَاعِيًا فَأَتَى رَجُلًا فَآتَاهُ فَصِيلًا مَخْلُولًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «بَعَثْنَا مُصَدِّقَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَإِنَّ فُلَانًا أَعْطَاهُ فَصِيلًا مَخْلُولًا، اللَّهُمَّ لَا تُبَارِكْ فِيهِ وَلَا فِي إِبِلِهِ»، فَبَلَغَ ذَلِكَ الرَّجُلَ فَجَاءَ بِنَاقَةٍ حَسْنَاءَ فَقَالَ: أَتُوبُ إِلَى اللَّهِ ﷻ وَإِلَى نَبِيِّهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ فِيهِ وَفِي إِبِلِهِ».

وائیلی کوڕی حوجر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نێردراوی خۆی نارد هات بۆ لای پیاوێک ئەویش ئاژەڵێکی لەڕی بۆی هێنا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «کۆکەرەوەی زەکاتمان نارد، فڵانە کەس وشترێکی لەڕی پێ دا، خوایە بەرەکەت نەخەیتە خۆی و وشترەکەشی»، هەواڵ گەیشت بەو پیاوە هات وشترێکی چاکی هێنا، گوتی: تەوبە دەکەم بۆ لای خوا ﷻ و بۆ لای پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «خوایە بەرەکەت بخەیتە خۆی و وشترەکەی».

## بَابُ زَكَاةِ الْحِنْطَةِ

### باسی زەکاتی گەنم

٢٤٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ فِي الْبُرِّ وَالتَّمْرِ زَكَاةٌ حَتَّى تَبْلُغَ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، وَلَا يَحِلُّ فِي الْوَرِقِ زَكَاةٌ حَتَّى تَبْلُغَ خَمْسَةَ أَوَاقٍ، وَلَا يَحِلُّ فِي إِبِلٍ زَكَاةٌ حَتَّى تَبْلُغَ خَمْسَ ذَوْدٍ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زەکات لە گەنم و خورمادا دروست نییە تا ڕێژەیان دەگاتە پێنج ویسق (کە دەکاتە: ٦٥٢ کغم)، لە زیودا زەکات ناکەوێت تا ڕێژەی دەگاتە پێنج ئوقیە، لە وشتریشدا زەکات ناکەوێت هەتا دەگاتە پێنج سەر».



## بَابُ مَا يُوجِبُ الْعُشْرَ وَمَا يُوجِبُ نِصْفَ الْعُشْرِ

### باسی ئەوەی دەیەک واجب دەکات، ئەوەیشی نیوەی دەیەک واجب دەکات

٢٤٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْأَنْهَارُ وَالْعُيُونُ أَوْ كَانَ بَعْلًا الْعُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بِالسَّوَانِي وَالنَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەو میوە و دانەوێڵەیەی بە باران و ڕووبار و کانیاو ئاو درابێت، یان ئاوی دارخورمای خواردبێت بە شێی زەوی بەبێ ئاوی ئاسمان ئەوە دەیەک زەکاتی دەکەوێت، ئەوەی بەهۆی ئاژەڵ یان لە ڕووبار بۆی هێنراوە (و مەسرەفی لێ کراوە) و ئاودراوە، ئەوە نیوەی زەکاتی دەیەکی دەکەوێت».

## بَابُ الْمَعْدِنِ

### باسی كانزا

٢٤٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْعَجْمَاءُ جُرْحُهَا جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئاژەڵ (هەر زیانێک بدات بەبێ کەمتەرخەمی لەلایەن خاوەنەکەیەوە) ئەوە بەفیڕۆ دەڕوات، بیر هیچی تێدا نییە (ئەگەر کەسێک لە زەوییەکی خۆیدا بیرێک هەڵبکەنێت دواتر کەسێک، یان شتێک بکەوێتە ناویەوە ئەوە خوێنبایی نییە، یان ئەگەر کەسێک پیاوێک بەکرێ بگرێت بیری بۆ هەڵبکەنێت، شتێک کەوت بەسەریدا و مرد بەبێ کەمتەرخەمی خاوەن ماڵ ئەوە خوێنبایی نییە)، کانزا و مەعدەنیش هیچی تێدا نییە (ئەگەر کەسێک لە زەوییەکی خۆیدا، یان زەوییەک هیی کەس نەبێت چاڵ هەڵبکەنێت، دواتر کەسێک بکەوێتە ناوی، بەبێ کەمتەرخەمی خاوەنەکەی ئەوە خوێنبایی بۆ نییە)، لە خەزێنە (لە دۆزینەوەی ئەو کەلوپەلە گرانبەهایانەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئیسلام) پێنجیەک زەکات هەیە».



## بَابُ فَرْضِ زَكَاةِ رَمَضَانَ

### باسی زەکاتی (سەرفیترە) لە مانگی ڕەمەزان

٢٤٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَكَاةَ رَمَضَانَ عَلَى الْحُرِّ وَالْعَبْدِ، وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى، صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، فَعَدَلَ النَّاسُ بِهِ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ.

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفیترەی فەرز کرد لەسەر

ئازاد و بەندە و نێر و مێ، صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە جۆ، خەڵکی نیو صاع گەنمیان یەکسان کرد بەرانبەر بە صاعێک لە جۆ.

تێبینی:

صاعێک چوار گوێلە، هەر گوێلێک (٥٤٤) گرامە، کەواتە: چوار صاع دەکاتە دوو کیلۆ و سەد و حەفتا و شەش گرام.

## مَكِيلَةُ زَكَاةِ الْفِطْرِ

## پێوانەی زەکاتی سەرفیترە

٢٥٠. عَنْ أَبِي رَجَاءٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ يَخْطُبُ عَلَى مِنْبَرِكُمْ -يَعْنِي: مِنْبَرَ الْبَصْرَةِ- يَقُولُ: صَدَقَةُ الْفِطْرِ صَاعٌ مِنْ طَعَامٍ.



ئەبو ڕەجاء دەڵێت: گوێم لە ئیبن عەبباس ﵄ بوو، لەسەر مینبەرەکەتان وتاری دەدا -واتە: مینبەری بەصڕە- دەیگوت: زەکاتی سەرفیترە صاعێکە لە خواردن.

## الزَّبِيبُ

## دەرکردنی مێوژ بۆ زەکاتی سەرفیترە

٢٥١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ إِذْ كَانَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ.

ئەبو سەعید ﵁ دەڵێت: ئێمە زەکاتی سەرفیترەمان دەردەکرد کاتێک پێغەمبەری خوامان ﷺ لەنێودا بوو، صاعێک لە خواردن، یان صاعێک لە جۆ، یان صاعێک لە

خورما، یان صاعێک لە مێوژ، یان صاعێک لە کەشک.

## كَمِ الصَّاعُ

### صاع ئەندازەکەی چەندێکە؟

٢٥٢. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «الْمِكْيَالُ مِكْيَالُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ وَالْوَزْنُ وَزْنُ أَهْلِ مَكَّةَ».

ئیبن عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «پێوانە پێوانەی خەڵکی مەدینەیە، کێشانەش کێشانەی خەڵی مەککەیە».

تێبینی:

(الْمِكْيَالُ مِكْيَالُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ): صاعی مەدینە ئەو صاعەیە کە پەیوەستە بە دەرکردنی زەکاتی سەرفیترە و کەفارەتەکانی دیکە، چونکە صاعەکانی ناوچەکانی دیکە جیاوازن لەگەڵ ئەوەی مەدینە، هەرچەندە بە هەموویان دەگوترێت: صاع، بەڵام صاعی مەدینە بە پێوانە دادەنرێت، (وَالْوَزْنُ وَزْنُ أَهْلِ مَكَّةَ) جگە لە کێشانەی زێڕ و زیو، مەبەست ئەوەیە ئەوەی ئیعتیباری پێ دەکرێت لە بەشی زەکات لە کێشانە هیی خەڵکی مەککەیە، کە بریتییە لەو درهەمەی کە دە دانەی بەرانبەرە بە حەوت مسقاڵ.



## بَابُ الْوَقْتِ الَّذِي يُسْتَحَبُّ أَنْ تُؤَدَّى صَدَقَةُ الْفِطْرِ فِيهِ

### باسی ئەو کاتەی کە چاکتر وایە زەکاتی سەرفیترەی تێدا بدرێت

٢٥٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ، أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ

النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ، قَالَ ابْنُ بَزِيعٍ: بِزَكَاةِ الْفِطْرِ.

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد زەکاتی سەرفیترە بدرێت پێش ئەوەی خەڵکی دەربچن بۆ نوێژ. ئیبن بەزیع دەڵێت: بە زەکاتی سەرفیترە.

## بَابُ الصَّدَقَةِ مِنْ غُلُولٍ

### باسی دەرکردنی زەکات لە ماڵی دزیاری دەستکەوتی جەنگ

٢٥٤. عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ ﷻ لَا يَقْبَلُ صَلَاةً بِغَيْرِ طُهُورٍ، وَلَا صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ».

ئەبو مەلیح لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «بەڕاستی خوا نوێژ وەرناگرێت بەبێ دەستنوێژ، زەکات و صەدەقەی دزیاریش وەرناگرێت».

تێبینی:

(غُلول): دزیکردنە لە غەنیمەت و دەستکەوتی جەنگ.

## جُهْدُ الْمُقِلِّ

### بەخشین لەلایەن کەسێکی هەژار بەپێی توانای خۆی

٢٥٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُبْشِيٍّ الْخَثْعَمِيِّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ أَيُّ الْأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «إِيمَانٌ لَا شَكَّ فِيهِ، وَجِهَادٌ لَا غُلُولَ فِيهِ، وَحَجَّةٌ مَبْرُورَةٌ»، قِيلَ: فَأَيُّ الصَّلَاةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «طُولُ الْقُنُوتِ»، قِيلَ: فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «جُهْدُ الْمُقِلِّ»،

قِيلَ: فَأَيُّ الْهِجْرَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «مَنْ هَجَرَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ ﷻ»، قِيلَ: فَأَيُّ الْجِهَادِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «مَنْ جَاهَدَ الْمُشْرِكِينَ بِمَالِهِ، وَنَفْسِهِ»، قِيلَ: فَأَيُّ الْقَتْلِ أَشْرَفُ؟ قَالَ: «مَنْ أُهَرِيقَ دَمُهُ، وَعُقِرَ جَوَادُهُ».

عەبدوڵڵای کوڕی حوبشی خەسعەمی ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی باشترین کردەوە؟ فەرمووی: «بڕواهێنانێك هیچ گومانی تێدا نەبێت و جیهادێکیش هیچ دزی و خیانەتێکی تێدا نەبێت، حەجێکی وەرگیراویش»، گوترا: چی دەفەرمووی دەربارەی باشترین نوێژ؟ فەرمووی: «وەستانی درێژی تێدا بێت». گوترا: چی دەفەرمووی دەربارەی باشترین بەخشین؟ فەرمووی: «بەخشینی کەسێکی هەژار بەپێی توانای خۆی». گوترا: چی دەفەرمووی دەربارەی باشترین کۆچکردن؟ فەرمووی: «ئەوەی کۆچ دەکات لە حەرامکراوەکانی خوا (پشت هەڵدەکات لە حەرامکراوەکانی خوا)»، گوترا: چی دەفەرمووی دەربارەی باشترین جیهاد؟ فەرمووی: «ئەوەی جیهادی هاوبەشدانەران دەکات بە ماڵ و گیانی خۆی»، گوترا: چی کوشتنێک شەڕەفە؟ فەرمووی: «کەسێک خۆی و ئەسپەکەی لە گۆڕەپانی جیهادا بکوژرێن».

٢٥٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «سَبَقَ دِرْهَمٌ مِائَةَ أَلْفِ دِرْهَمٍ»، قَالُوا: وَكَيْفَ؟ قَالَ: «كَانَ لِرَجُلٍ دِرْهَمَانِ تَصَدَّقَ بِأَحَدِهِمَا، وَانْطَلَقَ رَجُلٌ إِلَى عُرْضِ مَالِهِ، فَأَخَذَ مِنْهُ مِائَةَ أَلْفِ دِرْهَمٍ فَتَصَدَّقَ بِهَا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «یەک درهەم پێشی سەد هەزار درهەم کەوتەوە»، گوتیان: جا چۆن؟ فەرمووی: «پیاوێک دوو درهەمی هەبوو دانەیەکیان دەکات بە خێر، پیاوێکیش چوو بۆ لای بەشێک لە ماڵەکەی سەد هەزار درهەمی لێ دەرکرد و کردی بە خێر».

تێبینی:

کەسی یەکەم نیوەی ماڵەکەی کردۆتە خێر، بەڵام کەسی دووەم بەشێکی زۆر کەمی بەخشیوە لەو ماڵە زۆرەی خوا پێی داوە.

## الْيَدُ الْعُلْيَا

### دەستی بەرز

٢٥٧. عن حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﵁ يَقُولُ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِطِيبِ نَفْسٍ، بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ، لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلَا يَشْبَعُ، وَالْيَدُ الْعُلْيَا، خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى».



حەکیمی کوڕی حیزام ﵁ دەڵێت: داوام کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی بەخشیم، پاشان داوام لێ کرد، پێی بەخشیم، پاشان داوام کرد پێی بەخشیم، پاشان فەرمووی: «بەڕاستی ئەم ماڵ و سامانە سەوز و شیرینە، ئەوەی بە ڕەزامەندی و بێ داواکردن وەریبگرێت، بەرەکەتی بۆ تێدەکرێت، هەرکەسیش وەریبگرێت و چاوبرسی بێت، بەرەکەتی بۆ تێناکرێت، ئەوەش وەکوو ئەو کەسەی لێ دێت کە هەر دەخوا و تێر نابێت، دەستی بەرز چاکترە لە دەستی نزم».

## بَابُ أَيَّتُهُمَا الْيَدُ الْعُلْيَا

### باسی کامەیان دەستی بەرزە

٢٥٨. عَنْ طَارِقٍ الْمُحَارِبِيِّ ﵁ قَالَ: قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ

عَلَى الْمِنْبَرِ يَخْطُبُ النَّاسَ وَهُوَ يَقُولُ: «يَدُ الْمُعْطِي الْعُلْيَا، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ: أُمَّكَ، وَأَبَاكَ، وَأُخْتَكَ، وَأَخَاكَ، ثُمَّ أَدْنَاكَ، أَدْنَاكَ».

تاریقی موحاریبی ﷺ دەڵێت: چووین بۆ مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ وەستابوو لەسەر مینبەر وتاری بۆ خەڵکی دەدا و دەیفەرموو: «دەستی بەخشەر بەرزە، بەوانە دەست پێ بکە کە بژێوی و بەخێوکردنیان لەسەر تۆیە: دایکت، باوکت، خوشکت، برات، پاشان نزیکترت، نزیکترت».

## الْيَدُ السُّفْلَى

## دەستی نزم



٢٥٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ وَهُوَ يَذْكُرُ الصَّدَقَةَ، وَالتَّعَفُّفَ عَنِ الْمَسْأَلَةِ: «الْيَدُ الْعُلْيَا، خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا الْمُنْفِقَةُ، وَالْيَدُ السُّفْلَى السَّائِلَةُ».

عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی بەخشین و خۆپاراستنی دەکرد لە سواڵکردن، دەیفەرموو: «دەستی بەرز چاکترە لە دەستی نزم، دەستی بەرز ئەو دەستەیە کە دەبەخشێت، دەستی نزم ئەو دەستەیە کە داوا دەکات».

## عَطِيَّةُ الْمَرْأَةِ بِغَيْرِ إِذْنِ زَوْجِهَا

## بەخشینی ئافرەت بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی

٢٦٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: لَمَّا فَتَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ قَامَ خَطِيبًا فَقَالَ فِي خُطْبَتِهِ: «لَا يَجُوزُ لِامْرَأَةٍ عَطِيَّةٌ، إِلَّا بِإِذْنِ زَوْجِهَا».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککەی کرد هەستا وتاری خوێند، لە وتارەکەیدا فەرمووی: «دروست نییە بۆ هیچ ئافرەتێک ببەخشێت، تەنها بە مۆڵەتی مێردەکەی نەبێت».

## بَابُ أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ

### باسی ئەوە چ بەخشینێک باشترینە

٢٦١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «أَنْ تَصَدَّقَ، وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ، تَأْمُلُ الْعَيْشَ، وَتَخْشَى الْفَقْرَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا چ بەخشینێک باشترینە؟ فەرمووی: «ئەوەیان کە ببەخشیت لەکاتێکدا لەشت ساغ بێت و ئومێدت بە ژیان هەبێت و لە هەژاریش بترسیت».



٢٦٢. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَنْفَقَ الرَّجُلُ عَلَى أَهْلِهِ وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا، كَانَتْ لَهُ صَدَقَةً».

ئەبو مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر پیاو ببەخشێتە خانەوادەکەی و چاوەڕوانی پاداشت بکات ئەوە دەبێتە بەخشین بۆی».

## صَدَقَةُ الْبَخِيلِ

### بەخشینی کەسی ڕەزیل و پیسکە

٢٦٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ مَثَلَ الْمُنْفِقِ الْمُتَصَدِّقِ،

وَالْبَخِيلِ كَمَثَلِ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا جُبَّتَانِ -أَوْ جُنَّتَانِ- مِنْ حَدِيدٍ، مِنْ لَدُنْ ثُدِيِّهِمَا إِلَى تَرَاقِيهِمَا، فَإِذَا أَرَادَ الْمُنْفِقُ أَنْ يُنْفِقَ اتَّسَعَتْ عَلَيْهِ الدِّرْعُ أَوْ مَرَّتْ حَتَّى تُجِنَّ بَنَانَهُ، وَتَعْفُوَ أَثَرَهُ، وَإِذَا أَرَادَ الْبَخِيلُ أَنْ يُنْفِقَ قَلَصَتْ وَلَزِمَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ مَوْضِعَهَا، حَتَّى إِذَا أَخَذَتْهُ بِتَرْقُوَتِهِ -أَوْ بِرَقَبَتِهِ-». يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَشْهَدُ أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُوَسِّعُهَا، فَلَا تَتَّسِعُ، قَالَ طَاوُسٌ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يُشِيرُ بِيَدِهِ وَهُوَ يُوَسِّعُهَا وَلَا تَتَوَسَّعُ.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «وێنەی (کەسی) بەخشندە و ڕەزیل، وەکوو دوو پیاون دوو زرێی ئاسنیان لەبەردا بێت لە گۆی مەمکیانەوە تا دەفەی شانی داپۆشیبێن، بەخشندەکەش هەرچەندە خێر و چاکە بکات وردەوردە زرێکەی فراوانتر دەبێت و پێستەکەی دادەپۆشێت تا سەرپەنجەکانی دەشارێتەوە، لە زەویش دەخشێت تا شوێنپێکانی دەسڕێتەوە، ڕەزیلیش هەر کاتێك بیەوێت خێرێك بکات ئەڵقەکانی ئەو زرێیە هەر بەیەک دەنووسێن بە شوێنی خۆیانەوە، تا گیر دەبن لە شانی یان گەردنی، کابرا دەیەوێت فراوانی بکات کەچی فراوان نابێت». ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: شایەتی دەدەم بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ قەڵغانەکەی فراوان دەکرد فراوان نەدەبوو، تاوس دەڵێت: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو بەدەستی ئاماژەی دەکرد و فراوانی دەکردەوە، بەڵام فراوان نەدەبوو.



## الْإِحْصَاءُ فِي الصَّدَقَةِ

## هەژمارکردنی ئەوەی دەیبەخشیت

٢٦٤. عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا: «لَا تُحْصِي، فَيُحْصِيَ اللَّهُ ﷻ عَلَيْكِ».

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «خێر و چاکە

هەژمار مەکە، با خوا بە ژمارە ماڵ و سامانت نەداتێ».

## الْقَلِيلُ فِي الصَّدَقَةِ

### بەخشینی ماڵ و سامانی کەم

٢٦٥. عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﵁ قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّارَ فَأَشَاحَ بِوَجْهِهِ وَتَعَوَّذَ مِنْهَا -ذَكَرَ شُعْبَةُ أَنَّهُ فَعَلَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ- ثُمَّ قَالَ: «اتَّقُوا النَّارَ، وَلَوْ بِشِقِّ التَّمْرَةِ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا، فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ».

عەدی کوڕی حاتیم ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئاگری کرد ڕووی وەرگێڕا هەر وەکوو ئەوەی پەنای پێ بگرێت -شوعبە باسی کرد پێغەمبەر ﷺ سێ جار ئەوەی کرد- پاشان فەرمووی: «خۆتان لە ئاگر بپارێزن ئەگەر بەئەندازەی لەتە خورمایەکیش بێت، ئەگەر ئەو لەتە خورمایەشتان نەبوو، ئەوە بە وتەیەکی پاک و چاک و دڵخۆشکەر».



## بَابُ التَّحْرِيضِ عَلَى الصَّدَقَةِ

### باسی هاندان لەسەر بەخشین

٢٦٦. عَنْ حَارِثَةَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «تَصَدَّقُوا، فَإِنَّهُ سَيَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ يَمْشِي الرَّجُلُ بِصَدَقَتِهِ، فَيَقُولُ الَّذِي يُعْطَاهَا لَوْ جِئْتَ بِهَا بِالْأَمْسِ قَبِلْتُهَا، فَأَمَّا الْيَوْمَ فَلَا».

حاریسە ﵁ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «ببەخشن، چونکە ڕۆژگارێک دێت بەسەرتاندا کەسێک زەکاتەکەی دێنێت، ئەو کەسەی وەریدەگرێت

پێی دەڵێت: ئەگەر دوێنی بتهێنایە وەرمدەگرت، بەڵام ئەمڕۆ وەریناگرم».

## الشَّفَاعَةُ فِي الصَّدَقَةِ

### تکابۆکردن لە بەخشین

٢٦٧. عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ لَيَسْأَلُنِي الشَّيْءَ فَأَمْنَعُهُ حَتَّى تَشْفَعُوا فِيهِ، فَتُؤْجَرُوا، وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اشْفَعُوا، تُؤْجَرُوا».

موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پیاوێک داوای شتێکم لێ دەکات، پێی نادەم تا ئێوە تکای بۆ دەکەن، پاداشت وەردەگرن لەسەر تکاکردنتان»، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «تکا بکەن پاداشت وەردەگرن».



## بَابُ الْمُسِرِّ بِالصَّدَقَةِ

### باسی بەخشین بەنهێنی

٢٦٨. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْجَاهِرُ بِالْقُرْآنِ كَالْجَاهِرِ بِالصَّدَقَةِ، وَالْمُسِرُّ بِالْقُرْآنِ كَالْمُسِرِّ بِالصَّدَقَةِ».

عوقبەی کوڕی عامیر رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەو کەسەی بەئاشکرا قورئان دەخوێنێت، وەکوو ئەو کەسە وایە بەئاشکرا دەبەخشێت، ئەو کەسەی بەنهێنی قورئان دەخوێنێت، وەکوو ئەو کەسە وایە بەنهێنی دەبەخشێت».

## الْمَنَّانُ بِمَا أَعْطَى

### ئەوەی منەت دەکات بەوەی بەخشیویەتی

٢٦٩. عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: الْعَاقُّ لِوَالِدَيْهِ، وَالْمَرْأَةُ الْمُتَرَجِّلَةُ، وَالدَّيُّوثُ، وَثَلَاثَةٌ لَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ: الْعَاقُّ لِوَالِدَيْهِ، وَالْمُدْمِنُ عَلَى الْخَمْرِ، وَالْمَنَّانُ بِمَا أَعْطَى».

سالیمی کوڕی عەبدوڵلا لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سێ کۆمەڵ خوا سەیریان ناکات لە ڕۆژی دواییدا: ئەو کەسەی خراپەکارە لەگەڵ دایک و باوکی، ئەو ئافرەتەی خۆی دەچوێنێت بە پیاو، بێئابڕوو (ئەو کەسەی ڕێگەی داوە خەڵك بچنە لای خێزان و منداڵی بەبەدکاری)، سێ کۆمەڵیش ناچنە بەهەشتەوە: ئەو کەسەی خراپەکارە لەگەڵ دایک و باوکی، ئەو کەسەی بەردەوامە لەسەر مەی خواردنەوە، ئەو کەسەش کە منەت دەکات بەوەی بەخشیویەتی».



## مَنْ سَأَلَ بِاللَّهِ

### ئەو کەسەی داوای کرد لەبەر خوا پێی ببەخشرێت

٢٧٠. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ اسْتَعَاذَ بِاللَّهِ فَأَعِيذُوهُ، وَمَنْ سَأَلَكُمْ بِاللَّهِ فَأَعْطُوهُ، وَمَنِ اسْتَجَارَ بِاللَّهِ فَأَجِيرُوهُ، وَمَنْ آتَى إِلَيْكُمْ مَعْرُوفًا فَكَافِئُوهُ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَادْعُوا لَهُ حَتَّى تَعْلَمُوا أَنْ قَدْ كَافَأْتُمُوهُ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس داوای کرد لەبەر خوا پەنا بدرێت پەنای بدەن، هەر کەس بە ناوی خوا داوای لێ کردن پێی

ببەخشن، هەر کەس پەنای بۆ هێنان پەنای بدەن، هەرکەس چاکەی لەگەڵ کردن پاداشتی بدەنەوە، ئەگەر نەتانتوانی دوعای خێری بۆ بکەن، تا وا هەست دەکەن پاداشتتان داوەتەوە».

## مَنْ يُسْأَلُ بِاللَّهِ ﷻ وَلَا يُعْطِي بِهِ

### ئەو کەسەی لەبەر خوا ﷻ داوای لێ دەکرێت ببەخشێت، ئەویش پێی نابەخشێت

٢٧١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ النَّاسِ مَنْزِلًا؟»، قُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «رَجُلٌ آخِذٌ بِرَأْسِ فَرَسِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ حَتَّى يَمُوتَ، أَوْ يُقْتَلَ، وَأُخْبِرُكُمْ بِالَّذِي يَلِيهِ؟»، قُلْنَا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «رَجُلٌ مُعْتَزِلٌ فِي شِعْبٍ يُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَيُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَيَعْتَزِلُ شُرُورَ النَّاسِ، وَأُخْبِرُكُمْ بِشَرِّ النَّاسِ؟»، قُلْنَا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «الَّذِي يُسْأَلُ بِاللَّهِ ﷻ، وَلَا يُعْطِي بِهِ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئایا هەواڵتان بدەمێ بەوەی چاکترین پلەوپایەی هەیە لای خوا؟»، گوتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: «پیاوێک ڕەشمەی ئەسپەکەی دەگرێت دەجەنگێت لەپێناو خوادا تا دەمرێت یان دەکوژرێت، هەواڵتان بدەمێ بەوەی دوای ئەو دێت؟»، گوتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: «پیاوێکی گۆشەگیرە لە شیوێکدا نوێژەکانی بەجێ دێنێت و زەکات دەردەکات و لە شەڕ و خراپەکانی خەڵکی دوورە، هەواڵتان بدەمێ بە خراپترین کەس؟»، گوتمان: بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: «ئەو کەسەیە لەبەر خوا داوای لێ دەکرێت، بەڵام لەبەر خوا پێی نابەخشێت».

## فَضْلُ السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ

### پێگە و پاداشتی ئەو کەسەی سەرپەرشتیی بێوەژن دەکات

٢٧٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ، وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ».

ئەبو هورەیرە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەوەی سەرپەرشتیی بێوەژن دەکات و یارمەتی کەسی نەدار دەدات، وەک موجاهیدێک وایە لەپێناو خوادا بجەنگێت».

## الصَّدَقَةُ عَلَى الْأَقَارِبِ

### بەخشین بە کەسە نزیکەکان

٢٧٣. عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الصَّدَقَةَ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَعَلَى ذِي الرَّحِمِ اثْنَتَانِ صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ».

سەلمانی کوڕی عامیر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەخشین بەسەر هەژاراندا خێر و چاکەیە، بەسەر خاوەن ڕەحم و بەبەزەییەکاندا دووانە: هەم خێر و چاکەیە هەم بەجێهێنانی پەیوەندیی خزمایەتییە».

## الْمَسْأَلَةُ

### داواکردن و سواڵکردن لە خەڵک

٢٧٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَسْأَلُ حَتَّى يَأْتِيَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەردەوام پیاو داوا و سواڵ دەکات، هەتا لە ڕۆژی دواییدا کە دێت پارچە گۆشتێک بە ڕوخسارییەوە نەماوە».

## الإِسْتِعْفَافُ عَنِ الْمَسْأَلَةِ



### خۆپاراستن لە سواڵکردن

٢٧٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ فَيَحْتَطِبَ عَلَى ظَهْرِهِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْتِيَ رَجُلًا أَعْطَاهُ اللَّهُ عز وجل مِنْ فَضْلِهِ، فَيَسْأَلَهُ أَعْطَاهُ، أَوْ مَنَعَهُ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە ئەگەر یەکێک لە ئێوە گوریسەکەی ببات گورزەیەک دار بخاتە سەر شانی و بیهێنێت، چاکترە بۆی لەوەی بچێتە لای کەسێک کە خوا عز وجل بە فەزڵی خۆی پێی بەخشیوە و داوای لێ بکات، جا ئەویش پێی ببەخشێت یان پێی نەدات».

## بَابُ الْإِلْحَافِ فِي الْمَسْأَلَةِ

### باسی سووربوون له داواکردندا

٢٧٦. عَنْ مُعَاوِيَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تُلْحِفُوا فِي الْمَسْأَلَةِ، وَلَا يَسْأَلْنِي أَحَدٌ مِنْكُمْ شَيْئًا، وَأَنَا لَهُ كَارِهٌ، فَيُبَارَكَ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتُهُ».

موعاویه رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پێداگری و زۆر مەکەن لە داواکردندا، با یەکێک لە ئێوە داوای شتێک لە من نەکات کە پێمناخۆشە، خوا فەڕ و بەرەکەت دەخاتە نێو ئەوەی من پێی دەبەخشم».

٢٧٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ، وَلَا لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەخشین دروست نییە بۆ دەوڵەمەند، هەروەها بۆ کەسێکیش توانای کارکردنی هەبێت و لەشی ساغ و سەلامەت بێت».



## مَسْأَلَةُ الرَّجُلِ ذَا سُلْطَانٍ

### داواکردن لە کەسێکی خاوەن دەسەڵات

٢٧٨. عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْمَسَائِلَ كُدُوحٌ، يَكْدَحُ بِهَا الرَّجُلُ وَجْهَهُ، فَمَنْ شَاءَ كَدَحَ وَجْهَهُ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَ، إِلَّا أَنْ يَسْأَلَ الرَّجُلُ ذَا سُلْطَانٍ، أَوْ شَيْئًا لَا يَجِدُ مِنْهُ بُدًّا».

سەمورەی کوڕی جوندوب رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەڕاستی

داواکردن ڕوشێنەرە، مرۆڤ بەو داواکردنە ڕوخساری دەڕوشێنێت، هەر کەس ویستی ڕوخساری دەڕوشێنێت، هەرکەسیش ویستی وازی لێ دێنێت، مەگەر پیاوێك داوای (مافی خۆی) لە خاوەن دەسەڵات بکات، یان شتێک بە هیچ شێوەیەک بەدەستی نەهێنێت، (ناچار بێت و چارەسەری نەبێت، وەکوو برسێتی و نەبوونی)».

مَنْ آتَاهُ اللَّهُ ﷻ مَالاً مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ

ئەو کەسەی خوا ﷻ سامانێکی پێ دابێت بێ ئەوەی داوای بکات

٢٧٩. عَنْ ابْنِ السَّاعِدِيِّ الْمَالِكِيِّ قَالَ: اسْتَعْمَلَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﵁ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَلَمَّا فَرَغْتُ مِنْهَا فَأَدَّيْتُهَا إِلَيْهِ، أَمَرَ لِي بِعُمَالَةٍ، فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّمَا عَمِلْتُ لِلَّهِ ﷻ، وَأَجْرِي عَلَى اللَّهِ ﷻ، فَقَالَ: خُذْ مَا أَعْطَيْتُكَ، فَإِنِّي قَدْ عَمِلْتُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ لَهُ: مِثْلَ قَوْلِكَ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أُعْطِيتَ شَيْئًا مِنْ غَيْرِ أَنْ تَسْأَلَ، فَكُلْ، وَتَصَدَّقْ».

ئیبن ساعیدی مالیکی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ ئەرکی کۆکردنەوەی زەکاتی خستە ئەستۆم، کاتێك لێ بوومەوە زەکاتەکەم برد بۆی، فەرمانی کرد کرێم پێ بدرێت، پێم گوت: من لەپێناو خوادا ئەوەم کردووە و پاداشتم لای خوایە، گوتی: ئەوەی دەیدەم پێت وەریبگرە، من لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ کارم کرد، بە پێغەمبەرم ﷺ گوت: هەر وەکوو ئەوەی تۆ بە منت گوت، پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: «ئەگەر شتێکت پێ درا بەبێ ئەوەی داوای بکەی، بیخۆ و بیکە بە خێر».

# كِتَابُ مَنَاسِكِ الْحَجِّ

## پەرتووکی ڕێوڕەسمی حەج

### بَابُ وُجُوبِ الْحَجِّ

### باسی پێویستبوون (یان واجبوون)ی حەج



٢٨٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّاسَ، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ ﷻ قَدْ فَرَضَ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ»، فَقَالَ رَجُلٌ: فِي كُلِّ عَامٍ؟ فَسَكَتَ عَنْهُ حَتَّى أَعَادَهُ ثَلَاثًا، فَقَالَ: «لَوْ قُلْتُ نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، وَلَوْ وَجَبَتْ، مَا قُمْتُمْ بِهَا، ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ، وَاخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِالشَّيْءِ فَخُذُوا بِهِ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ، فَاجْتَنِبُوهُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دا بۆ خەڵکی، فەرمووی: «بەڕاستی خوا ﷻ حەجی لەسەرتان فەرز کرد»، پیاوێک گوتی: لە هەموو ساڵێکدا؟ بێدەنگ بوو تا سێ جار دووبارەی کردەوە، پاشان فەرمووی: «ئەگەر بمگوتبایە بەڵێ، ئەوە واجب دەبوو، ئەگەر واجبیش بووایە، نەتاندەتوانی ئەنجامی بدەن، وازم لێ بێنن لەوەی وازم لێ هێناوە بۆتان، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە لەناو چوون

بەهۆی ئەوەی پرسیاری زۆریان دەکرد و جیاواز بوون لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان، جا ئەگەر فەرمانم پێ کردن بە شتێک هەرچی لە توانانتاندایە لێی وەربگرن، ئەگەر شتێکیشم لێ قەدەغە کردن لێی دوور بکەونەوە».

## وُجُوبُ الْعُمْرَةِ

### واجببوونی عومرە

٢٨١. عَنْ أَبِي رَزِينٍ ﵁ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ، لَا يَسْتَطِيعُ الْحَجَّ، وَلَا الْعُمْرَةَ، وَلَا الظَّعْنَ، قَالَ: «فَحُجَّ، عَنْ أَبِيكَ، وَاعْتَمِرْ».

ئەبو ڕەزین ﵁ دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا باوکم پیاوێکی گەورە و بەساڵاچووە، ناتوانێت حەج و عومرە بکات، هەروەها ناتوانێت سواری وڵاخیش بێت، فەرمووی: «لەجیاتی باوکت حەج و عومرە بکە».

## فَضْلُ الْحَجِّ الْمَبْرُورِ

### گەورەیی حەجی وەرگیراو

٢٨٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْحَجَّةُ الْمَبْرُورَةُ: لَيْسَ لَهَا جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّةُ، وَالْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «حەجی وەرگیراو: هیچ پاداشتێکی نییە جگە لە بەهەشت، عومرەش بۆ عومرە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکانی نێوانیان».

## فَضْلُ الْحَجِّ

### پێگە و گەورەیی حەجكردن

٢٨٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَفْدُ اللَّهِ ثَلَاثَةٌ: الْغَازِي، وَالْحَاجُّ، وَالْمُعْتَمِرُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «میوانە بەڕێزەکانی خوا (لە گەشتیارەکان) سێ جۆرن: ئەو کەسەی جیهاد دەکات، ئەو کەسەی حەج دەکات، ئەو کەسەی عومرە دەکات».

٢٨٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَجَّ هَذَا الْبَيْتَ فَلَمْ يَرْفُثْ، وَلَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ».



ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس حەجی ماڵی خوا بکات و گوفتار و ڕەفتاری خراپ نەکات، خۆی گوناهبار نەکات، ئەوە دەگەڕێتەوە وەک ئەو کاتەی لەدایک بووە».

٢٨٥. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَا نَخْرُجُ فَنُجَاهِدَ مَعَكَ، فَإِنِّي لَا أَرَى عَمَلاً فِي الْقُرْآنِ، أَفْضَلَ مِنَ الْجِهَادِ؟ قَالَ: «لَا، وَلَكِنَّ أَحْسَنُ الْجِهَادِ وَأَجْمَلُهُ، حَجُّ الْبَيْتِ، حَجٌّ مَبْرُورٌ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا دەرنەچین جیهاد بکەین لەگەڵتدا، من کردەوەیەک نابینمەوە لە قوڕئاندا چاکتر بێت لە جیهاد؟ فەرمووی: «نەخێر، بەڵام چاکترین و جوانترین جیهاد حەجی ماڵی خوایە، حەجێکی وەرگیراو».

## فَضْلُ الْعُمْرَةِ

### پێگە و پاداشتی عومرە

٢٨٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ، لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّةُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «عومرە بۆ عومرە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکانی نێوانیان، حەجی وەرگیراویش: هیچ پاداشتێکی نییە جگە لە بەهەشت».

## فَضْلُ الْمُتَابَعَةِ بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ



### پێگە و پاداشتی حەج و عومرە بەدوای یەکدیدا

٢٨٧. عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﵄: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَابِعُوا بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، فَإِنَّهُمَا: يَنْفِيَانِ الْفَقْرَ، وَالذُّنُوبَ، كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ».

عەمری کوڕی دینار دەڵێت: ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «حەج و عومرە یەکێکیان بەدوای ئەوی دیکەدا بکەن (ئەگەر حەجتان کرد بەدوایدا عومرە بکەن، ئەگەر عومرەشتان کرد بەدوایدا حەج بکەن)، چونکە ئەو دووانە: هەژاری و گوناهەکان ناهێڵن، وەکوو چۆن ئاگری کوورە پیسی ئاسن لادەبات».

## الْحَجُّ عَنِ الْمَيِّتِ، الَّذِي لَمْ يَحُجَّ

حەجکردن لەجیاتی ئەو مردووەی کە حەجی نەکردوە

٢٨٨. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ أَبِيهَا، مَاتَ وَلَمْ يَحُجَّ؟ قَالَ: «حُجِّي عَنْ أَبِيكِ».

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی باوکی کە مردووە و حەجی نەکردووە؟ فەرمووی: «لەجیاتی باوکت حەج بکە».

## الْحَجُّ بِالصَّغِيرِ

حەجکردن بە منداڵی بچووک



٢٨٩. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: رَفَعَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ صَبِيًّا، فَقَالَتْ: أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: «نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ».

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: ئافرەتێک منداڵێکی بەرز کردەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئایا ئەم منداڵە حەجی بۆ هەیە؟ فەرمووی: «بەڵێ، تۆش پاداشتت دەست دەکەوێت».

## الْمَوَاقِيتُ مِيقَاتُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ

شوێنەکانی ئیحرامبەستنی خەڵکی مەدینە

٢٩٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُهِلُّ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ

ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَأَهْلُ الشَّامِ مِنَ الْجُحْفَةِ، وَأَهْلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ»، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَبَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «وَيُهِلُّ أَهْلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ».

عەبدوڵڵا کوڕی عومەر ﭭ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خەڵکی مەدینە لە (ذِي الْحُلَيْفَةِ) ئیحرام دەبەستن، خەڵکی شامیش لە (الْجُحْفَةِ)، خەڵکی نەجدیش لە (قَرْن)»، عەبدوڵڵا گوتی: پێم ڕاگەیەندرا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خەڵکی یەمەن لە (يَلَمْلَمَ) ئیحرام دەبەستن».

## النَّهْيُ عَنْ لُبْسِ الْقَمِيصِ لِلْمُحْرِمِ

## ڕێگریکردن لە پۆشینی کراس بۆ ئەو کەسەی ئیحرامی بەستووە



٢٩١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﭭ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَلْبَسُوا الْقُمُصَ، وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ، وَلَا الْبَرَانِسَ، وَلَا الْخِفَافَ، إِلَّا أَحَدٌ لَا يَجِدُ نَعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلَا تَلْبَسُوا شَيْئًا مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ، وَلَا الْوَرْسُ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﭭ دەگێڕێتەوە: پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە چ پۆشاکێک لەبەر بکات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «نە کراس لەبەر بکەن و نە مێزەر لەسەر بکەن و نە شەرواڵ لەپێ بکەن، نە ڕۆبی کڵاودار لەبەر بکەن، نە خوفف لەپێ بکەن، مەگەر کەسێک نەعلی دەست نەکەوێت، ئەوا با خوفف لەپێ بکات، بەڵام لە خوار قاپەڕەقەی قاچیەوە بیبڕێت، وە هیچ پۆشاکێک لەبەر مەکەن کە زەعفەڕان و وەرسی پێوە بێت».

## قَطْعُهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ

### بڕینی (خوففەکان) تا خوار هەردوو قاپەڕەقە

٢٩٢. عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا لَمْ يَجِدِ الْمُحْرِمُ النَّعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ».

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر ئەو کەسەی ئیحرامی بەستووە نەعلی دەست نەکەوت، با خوفف لەپێ بکات، با لە خوار قاپەڕەقەیەوە بیبڕێت».

## إِبَاحَةُ الطِّيبِ عِنْدَ الْإِحْرَامِ

### ڕێگەپێدانی بۆنخۆشکردن لە کاتی ئیحرام



٢٩٣. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عِنْدَ إِحْرَامِهِ حِينَ أَرَادَ أَنْ يُحْرِمَ، وَعِنْدَ إِحْلَالِهِ، قَبْلَ أَنْ يُحِلَّ بِيَدَيَّ.

عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆنخۆش کرد بە دەستی خۆم لە کاتی ئیحرامبەستنی، کاتێك ویستی ئیحرام بکات، کاتێك شکاندنی، پێش ئەوەی تەواف بکات.

## إِفْرَادُ الْحَجِّ

### ئیحرامبەستن بەتەنها بۆ حەج

٢٩٤. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مُوَافِينَ لِهِلَالِ ذِي الْحِجَّةِ،

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ شَاءَ أَنْ يُهِلَّ بِحَجٍّ فَلْيُهِلَّ، وَمَنْ شَاءَ أَنْ يُهِلَّ بِعُمْرَةٍ فَلْيُهِلَّ بِعُمْرَةٍ».

عائیشه ؓ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لە نزیک هاتنی مانگی (ذِي الْحِجَّةِ) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هەر کەس دەیەوێت ئیحرام ببەستێت بۆ حەج با ئیحرام ببەستێت، هەرکەسیش دەیەوێت ئیحرام ببەستێت بۆ عومرە با ئیحرام ببەستێت بۆ عومرە».

## الْقِرَانُ

## نیەتهێنانی حەج و عومرە پێکەوە



٢٩٥. عَنْ مَرْوَانَ: أَنَّ عُثْمَانَ ؓ نَهَى عَنِ الْمُتْعَةِ، وَأَنْ يَجْمَعَ الرَّجُلُ بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، فَقَالَ عَلِيٌّ ؓ: لَبَّيْكَ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ مَعًا، فَقَالَ عُثْمَانُ: أَتَفْعَلُهَا، وَأَنَا أَنْهَى عَنْهَا؟ فَقَالَ عَلِيٌّ: لَمْ أَكُنْ لِأَدَعَ سُنَّةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِأَحَدٍ مِنَ النَّاسِ.

مەڕوان دەگێڕێتەوە: عوسمان ؓ ڕێگریی کرد لە (الْمُتْعَة)، لەوەی کەسێک حەج و عومرە پێکەوە کۆ بکاتەوە، عەلی ؓ گوتی: پەروەردگار پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم بە حەج و عومرە پێکەوە، عوسمان گوتی: ئایا پێکەوە دەیانکەی؟ لە کاتێکدا من ڕێگری لێ دەکەم، عەلی گوتی: لەبەر قسەی هیچ کەسێک واز لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ناهێنم.

تێبینی:

(الْمُتْعَة): واتە کەسێک چوو بۆ حەج ئیحرام ببەستێت بە عومرە لە مانگەکانی حەجدا، هەر کە چووە ئەوێ تەواف بکات سەعی نێوان صەفا و مەڕوەش بکات،

قژی کورت بکاتەوە یان بیتاشێت، دواتر ئیحڕام لە خۆی بکاتەوە، هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵە هەتا کاتی حەجکردن، بەڵام پێویست دەبێت لەسەری کە خوێن بڕێژێت (ئاژەڵێک سەر ببڕێت).

٢٩٦. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا، لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا».

ئەنەس ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «پەروەردگار پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم بە عومڕە و حەج، پەروەردگار پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم بە عومڕە و حەج، (تەلبیەی حەج و عومڕەی دەکرد پێکەوە)».



## كَيْفَ التَّلْبِيَةُ

### چۆنیەتی تەلبیەکردن (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)

٢٩٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: «(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ)، واتە: ئەی پەروەردگار پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، وەڵامی داواکەت دەدەمەوە و تۆ تەنها و بێهاوبەشیت، بێگومان سوپاس و ستاییش و هەموو ناز و نیعمەتێک و هەموو موڵک و دەسەڵاتێک هەر بۆ تۆیە، تۆ بێهاوەڵ و بێوێنەیت».

## رَفْعُ الصَّوْتِ بِالْإِهْلَالِ

### بەرزکردنەوەی دەنگ بە تەلبیە

٢٩٨. عَنْ خَلَّادِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «جَاءَنِي جِبْرِيلُ فَقَالَ لِي: يَا مُحَمَّدُ مُرْ أَصْحَابَكَ أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّلْبِيَةِ».

خەللادی کوڕی سائیب، لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جیبریل هات بۆ لام پێی گوتم: ئەی موحەممەد فەرمان بە هاوەڵانت بکە دەنگیان بەرز بکەنەوە بە تەلبیە».

## قَتْلُ الْحَيَّةِ



### کوشتنی مار

٢٩٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَمْسٌ يَقْتُلُهُنَّ الْمُحْرِمُ: الْحَيَّةُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْغُرَابُ الْأَبْقَعُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «پێنج (گیاندار) دروستە ئیحرامپۆش بیانکوژێت: مار و مشک و کۆلارە و ئەو قەلەڕەشەی پەڵەی سپی لەسەر پشتی هەیە، یان لەسەر سینگیەتی، سەگی هاریش».

## غَسْلُ الْمُحْرِمِ بِالسِّدْرِ إِذَا مَاتَ

### شۆردنی ئیحرامپۆش بە سیدر کاتێك مرد

٣٠٠. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ رَجُلًا كَانَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَوَقَصَتْهُ نَاقَتُهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَمَاتَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ، وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ، وَلَا تُمِسُّوهُ بِطِيبٍ، وَلَا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پیاوێک لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بوو ئیحرامی بەستبوو، وشترەکەی فڕێی دایە خوارەوە و ملی شکاند و دەستبەجێ مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بە ئاو و سیدر بیشۆن، کفنی بکەن لە دوو پۆشاکدا، بۆنی خۆشی لێ مەدەن، سەر و ڕوخساری با لە دەرەوە بێت، چونکە لە ڕۆژی دواییدا زیندوو دەکرێتەوە تەلبیە دەکات».



## فِيمَنْ أُحْصِرَ بِعَدُوٍّ

### دەربارەی کەسێک دوژمن ڕێگری حەجی لێ بکات

٣٠١. عَنِ الْحَجَّاجِ بْنِ عَمْرٍو ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ كُسِرَ أَوْ عَرِجَ فَقَدْ حَلَّ وَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى»، وَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، وَأَبَا هُرَيْرَةَ، فَقَالَا: صَدَقَ.

حەججاجی کوڕی عەمر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس لە ڕێگای حەج شەل بوو، یان قاچی شکێنرا (بە هەر هۆکارێک)، ئەوە دەتوانێت ئیحرام بشکێنێت، حەجێکی دیکەی لەسەر پێویستە»، پرسیارم کرد لە ئیبن عەبباس و ئەبو هورەیرە دەربارەی ئەمە؟! گوتیان: ڕاست دەکات.

## حُرْمَةُ مَكَّةَ

### ڕێز و پیرۆزی مەککە

٣٠٢. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْفَتْحِ: «هَذَا الْبَلَدُ حَرَّمَهُ اللَّهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ، فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا يُعْضَدُ شَوْكُهُ وَلَا يُنَفَّرُ صَيْدُهُ، وَلَا يَلْتَقِطُ لُقَطَتَهُ، إِلَّا مَنْ عَرَّفَهَا، وَلَا يُخْتَلَى خَلَاهُ»، قَالَ الْعَبَّاسُ رضي الله عنه: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِلَّا الْإِذْخِرَ فَذَكَرَ كَلِمَةً مَعْنَاهَا إِلَّا الْإِذْخِرَ.

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا فەرمووی: «ئەم شارە خوا حەرامی کردووە لەو ڕۆژەی ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، ئەم شارە حەرامە لەبەر ئەوەی خوا پیرۆزی کردووە حەرامی کردووە تا ڕۆژی دوایی، دڕکەکانی هەڵناکەندرێن، نێچیرەکانیش ڕاونانرێن، دۆزراوەکانیشی هەڵناگیرێن مەگەر بۆ کەسێک پێناسەی بکات (تا خاوەنەکەی دەدۆزێتەوە)، ڕووەکەکانیشی هەڵناکەنرێن». عەبباس رضي الله عنه گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا جگە (إِذْخِر) باسی وشەیەکی کرد ئەمە ماناکەی بوو جگە لە (إِذْخِر).



## فَضْلُ الصَّلَاةِ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ

### پێگە و پاداشتی نوێژ لە مزگەوتی حەڕام

٣٠٣. عن عَبْدِ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِدِ إِلَّا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: «نوێژێک لە مزگەوتی مندا چاکترە لە هەزار نوێژی مزگەوتەکانی دیکە، جگە لە

مزگەوتی حەڕام».

## وَضْعُ الصَّدْرِ، وَالْوَجْهِ عَلَى مَا اسْتُقْبِلَ مِنْ دُبُرِ الْكَعْبَةِ

### دانانی سینگ و ڕوخسار لەسەر ئەو شوێنەی ڕووی لە پشتی کەعبەیە

٣٠٤. عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﵄ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْبَيْتَ، فَجَلَسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَكَبَّرَ، وَهَلَّلَ، ثُمَّ مَالَ إِلَى مَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْبَيْتِ فَوَضَعَ صَدْرَهُ عَلَيْهِ، وَخَدَّهُ، وَيَدَيْهِ، ثُمَّ كَبَّرَ، وَهَلَّلَ، وَدَعَا، فَعَلَ ذَلِكَ بِالْأَرْكَانِ كُلِّهَا، ثُمَّ خَرَجَ فَأَقْبَلَ عَلَى الْقِبْلَةِ وَهُوَ عَلَى الْبَابِ، فَقَالَ: «هَذِهِ الْقِبْلَةُ، هَذِهِ الْقِبْلَةُ».

ئوسامەی کوڕی زەید ﵄ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ چوومە نێو کەعبەوە دانیشت، ستاییشی خوای کرد، تەکبیر و تەهلیلی کرد، پاشان لایدایە پێشی خۆی لە کەعبە سینگ و ڕوومەت و هەردوو دەستی لەسەر دانا، پاشان تەکبیر و تەهلیلی کرد و پاڕایەوە، لە هەموو ڕوکنەکانی کەعبە ئەمەی کرد، پاشان دەرچوو ڕووی کردە قیبلە، لەسەر دەرگاکە بوو، فەرمووی: «ئەمە قیبلەیە، ئەمە قیبلەیە».



## ذِكْرُ الْفَضْلِ فِي الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ

### باسی پێگە و پاداشتی تەوافکردن بە دەوری کەعبەدا

٣٠٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ: أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ مَا أَرَاكَ تَسْتَلِمُ إِلَّا هَذَيْنِ الرُّكْنَيْنِ؟ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ مَسْحَهُمَا: يَحُطَّانِ الْخَطِيئَةَ»، وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «مَنْ طَافَ سَبْعًا، فَهُوَ كَعِدْلِ رَقَبَةٍ».

عوبەیدوڵڵای کوڕی عوبەیدی کوڕی عومەیر دەگێڕێتەوە: پیاوێک گوتی: ئەی

باوکی عەبدوڕڕەحمان چییە دەبینم تەنها دەست دەدەیت لەم دوو ڕووکنە؟ وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «بەڕاستی دەستلێدانیان گوناه دەوەرێنێت»، گوێم لێ بوو دەشیفەرموو: «هەر کەس حەوت تەواف بکات وەکوو ئازادکردنی بەندەیەک وایە».

## إِبَاحَةُ الْكَلَامِ فِي الطَّوَافِ

### ڕەوایەتی قسەکردن لە تەوافدا

٣٠٦. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَقِلُّوا الْكَلَامَ فِي الطَّوَافِ، فَإِنَّمَا أَنْتُمْ فِي الصَّلَاةِ.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: لە تەوافدا قسە کەم بکەن، چونکە ئێوە لە نوێژدان.



## الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ عَلَى الرَّاحِلَةِ

### تەوافکردنی کەعبە بەسەر وڵاخەوە

٣٠٧. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: طَافَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ حَوْلَ الْكَعْبَةِ عَلَى بَعِيرٍ يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنِهِ.

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی کرد لە حەجی ماڵئاوایی بە دەوری کەعبەدا بە گۆچانێکی چەماوە دەستی دەدا لە ڕوکنەکانی.

## ذِكْرُ الْحَجَرِ الْأَسْوَدِ

### باسی بەردە ڕەشەکە

٣٠٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭫ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْحَجَرُ الْأَسْوَدُ مِنَ الْجَنَّةِ».

ئیبن عەبباس ﭫ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەردە ڕەشەکە لە بەردی بەهەشتە».

## تَقْبِيلُ الْحَجَرِ

### ماچکردنی بەردە ڕەشەکە



٣٠٩. عَنْ عَابِسِ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَ: رَأَيْتُ عُمَرَ ﭬ جَاءَ إِلَى الْحَجَرِ فَقَالَ: إِنِّي لَأَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ، وَلَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُقَبِّلُكَ، مَا قَبَّلْتُكَ، ثُمَّ دَنَا مِنْهُ، فَقَبَّلَهُ.

عابیسی کوڕی ڕەبیعە دەڵێت: عومەرم ﭬ بینی هات بۆ لای بەردە ڕەشەکە گوتی: من دەزانم تۆ تەنها بەردێکیت، ئەگەر پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیبایە ماچتی دەکرد ماچتم نەدەکرد، پاشان لێی نزیک بوویەوە و ماچی کرد.

## الْقَوْلُ بَعْدَ رَكْعَتَيِ الطَّوَافِ

### ئەوەی دەیڵێت لەدوای دوو ڕکاتی تەواف

٣١٠. عَنْ جَابِرٍ ﭬ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَافَ سَبْعًا رَمَلَ ثَلَاثًا، وَمَشَى أَرْبَعًا، ثُمَّ قَرَأَ: {وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى} البقرة: ١٢٥، فَصَلَّى سَجْدَتَيْنِ، وَجَعَلَ الْمَقَامَ

بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَعْبَةِ، ثُمَّ اسْتَلَمَ الرُّكْنَ، ثُمَّ خَرَجَ، فَقَالَ: «إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ، فَابْدَءُوا بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ».

جابير ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ حەوت جار تەوافی کرد، سێ جار بەهەڕوەلە، چوار جاریش بەڕێکردن، پاشان (ئەم ئایەتەی) خوێندەوە: {وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى}، واتە: شوێنپێی ئیبڕاهیم بکەنە جێگای نوێژ. ئینجا دوو ڕکات نوێژی کرد، مەقامی خستە نێوان خۆی و کەعبە، پاشان دەستی دا لە ڕوکن، پاشان دەرچوو، ئینجا فەرمووی: «بەڕاستی صەفا و مەڕوە لە دروشمەکانی خوان، دەست پێ بکەن بەوەی خوا دەستی پێ کردووە».

## الشُّرْبُ مِنْ زَمْزَمَ

## خواردنەوەی ئاوی زەمزەم

٣١١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ شَرِبَ مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ وَهُوَ قَائِمٌ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئاوی زەمزەمی خواردەوە، بەپێوە وەستابوو.

## الذِّكْرُ وَالدُّعَاءُ عَلَى الصَّفَا

## زیکر و دوعاکردن لەسەر صەفا

٣١٢. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: طَافَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْبَيْتِ سَبْعًا رَمَلَ مِنْهَا ثَلَاثًا، وَمَشَى أَرْبَعًا، ثُمَّ قَامَ عِنْدَ الْمَقَامِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَقَرَأَ: {وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى} البقرة: ١٢٥، وَرَفَعَ صَوْتَهُ يُسْمِعُ النَّاسَ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَاسْتَلَمَ، ثُمَّ ذَهَبَ، فَقَالَ: «نَبْدَأُ بِمَا

بَدَأَ اللَّهُ بِهِ، فَبَدَأَ بِالصَّفَا»، فَرَقِيَ عَلَيْهَا حَتَّى بَدَا لَهُ الْبَيْتُ وَقَالَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ»، وَكَبَّرَ اللَّهَ وَحَمِدَهُ، ثُمَّ دَعَا بِمَا قُدِّرَ لَهُ، ثُمَّ نَزَلَ مَاشِيًا حَتَّى تَصَوَّبَتْ قَدَمَاهُ فِي بَطْنِ الْمَسِيلِ، فَسَعَى حَتَّى صَعِدَتْ قَدَمَاهُ، ثُمَّ مَشَى حَتَّى أَتَى الْمَرْوَةَ، فَصَعِدَ فِيهَا، ثُمَّ بَدَا لَهُ الْبَيْتُ، فَقَالَ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ»، قَالَ: ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ ذَكَرَ اللَّهَ وَسَبَّحَهُ وَحَمِدَهُ، ثُمَّ دَعَا عَلَيْهَا بِمَا شَاءَ اللَّهُ فَعَلَ هَذَا حَتَّى فَرَغَ مِنَ الطَّوَافِ.

جابير ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ حەوت جار تەوافی کەعبەی کرد سێ جاریان بە هەروەلە و چوار جار بە ڕێکردن، پاشان لای مەقام هەستا و دوو ڕکات نوێژی کرد، ئەم ئایەتەی خوێند: {وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى}، واتە: شوێن پێی ئیبراهیم بکەنە جێگای نوێژ. دەنگی بەرز کردەوەوە خەڵکی گوێیان لە دەنگی بوو، پاش ئەوەی تەواو بوو دەستی دا لە بەردە ڕەشەکە، دواتر ڕۆیشت و فەرمووی: «دەست پێ دەکەین بەوەی خوا دەستی پێ کردووە»، بە صەفا دەستی پێ کرد تا سەر کەوت و کەعبەی لێوە دیار بوو، سێ جار فەرمووی: «(لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)»، تەکبیر و ستاییشی خوای کرد، پاشان پاڕایەوە بەوەی بۆی دیاری کراوە، پاشان بە پێ دابەزیە خوارەوە بۆ نێو شیوەکەی نێوان صەفا و مەڕوە، ئینجا بەهەڕوەلە ڕۆیشت هەتا بە پێیەکانی سەر کەوت، پاشان ڕۆیشت هەتا هاتە مەڕوە و سەر کەوت و کەعبەی لێوە دیار بوو، فەرمووی: «(لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)»، سێ جار ئەوەی فەرموو، پاشان یادی خوای کرد و سوپاس و ستاییشی کرد، پاشان لەو شوێنە پاڕایەوە، ئەوەندەی خوا ویستی لە سەر بوو، ئەمەی کرد تا لە تەواف بوویەوە.

## السَّعْيُ بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ

### هەڕوەلەکردن لە نێوان صەفا و مەڕوە

٣١٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا سَعَى النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، لِيُرِيَ الْمُشْرِكِينَ قُوَّتَهُ.

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوە هەڕوەلەی کرد لە نێوان صەفا و مەڕوە، تا هاوبەشدانەران هێز و توانای ببینن.

## مَا ذُكِرَ فِي يَوْمِ عَرَفَةَ

### ئەوەی باس کراوە دەربارەی ڕۆژی عەڕەفە



٣١٤. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ أَنْ يُعْتِقَ اللَّهُ ﷻ فِيهِ عَبْدًا أَوْأَمَةً مِنَ النَّارِ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَإِنَّهُ لَيَدْنُو، ثُمَّ يُبَاهِي بِهِمُ الْمَلَائِكَةَ، وَيَقُولُ: مَا أَرَادَ هَؤُلَاءِ».

عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هیچ ڕۆژێک نییە ئەوەندەی ڕۆژی عەڕەفە خوا بەندەی تێدا ئازاد بکات لە ئاگر، بێگومان خوا نزیک دەبێتەوە، پاشان فەزڵ و ڕێزی حەجکاران دەردەخات بۆ فریشتەکان، دەفەرمووێت: ئەوانە چییان دەوێت (کە ماڵ و سامان و وڵاتیان جێ هێشتووە جگە لە لێخۆشبوونی خوا و نزیکبوونەوە لێی)».

## النَّهْيُ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ

### قەدەغەکردن لە بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عەرەفە

٣١٥. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ يَوْمَ عَرَفَةَ وَيَوْمَ النَّحْرِ وَأَيَّامَ التَّشْرِيقِ عِيدُنَا أَهْلَ الْإِسْلَامِ، وَهِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ».

عوقبەی کوڕی عامیر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژی قوربان و ڕۆژەکانی تەشریق (سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنی قوربانە) لای ئێمەی موسوڵمان، ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەیە».

## الْخُطْبَةُ بِعَرَفَةَ قَبْلَ الصَّلَاةِ



### وتاردان لە عەرەفە پێش نوێژ

٣١٦. عَنْ سَلَمَةَ بْنِ نُبَيْطٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى جَمَلٍ أَحْمَرَ بِعَرَفَةَ قَبْلَ الصَّلَاةِ.

سەلەمەی کوڕی نوبەیت لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەسەر وشترێکی سوور وتاری دەدا لە عەرەفە پێش نوێژ.

## الْجَمْعُ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِعَرَفَةَ

### کۆکردنەوەی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر لە عەرەفە

٣١٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا إِلَّا بِجَمْعٍ وَعَرَفَاتٍ.

عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکانی لە کاتی خۆیدا دەکرد جگە لە (جمع) (واتە: موزدەلیفە) و عەرەفات نەبێت.

## الْجَمْعُ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ بِالْمُزْدَلِفَةِ

### کۆکردنەوەی دوو نوێژەکە لە موزدەلیفە

٣١٨. عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ.

ئەبو ئەیوب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریب و عیشای کۆ کردەوە لە (موزدەلیفە).



## الرُّخْصَةُ لِلنِّسَاءِ فِي الْإِفَاضَةِ مِنْ جَمْعٍ قَبْلَ الصُّبْحِ

### مۆڵەتدان بە ئافرەتان لە هاتنەخوارەوە لە موزدەلیفە پێش بەرەبەیان

٣١٩. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: إِنَّمَا أَذِنَ النَّبِيُّ ﷺ لِسَوْدَةَ فِي الْإِفَاضَةِ قَبْلَ الصُّبْحِ مِنْ جَمْعٍ لِأَنَّهَا كَانَتِ امْرَأَةً ثَبِطَةً.

عائیشە ﷺ دەڵێت: بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕێگای دا بە سەودە لە هاتنەخوارەوە لە موزدەلیفە پێش بەرەبەیان، چونکە ئافرەتێکی قورس و گران بوو.

## فِيمَنْ لَمْ يُدْرِكْ صَلَاةَ الصُّبْحِ مَعَ الْإِمَامِ بِالْمُزْدَلِفَةِ

### دەربارەی ئەو کەسەی ناگات بە نوێژی بەیانی لەگەڵ ئیمام لە موزدەلیفە

٣٢٠. عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَاقِفًا بِالْمُزْدَلِفَةِ، فَقَالَ:

«مَنْ صَلَّى مَعَنَا صَلَاتَنَا هَذِهِ هَا هُنَا، ثُمَّ أَقَامَ مَعَنَا وَقَدْ وَقَفَ قَبْلَ ذَلِكَ بِعَرَفَةَ لَيْلًا أَوْ نَهَارًا، فَقَدْ تَمَّ حَجُّهُ».

عوڕوەی کوڕی موزەرریس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی وەستابوو لە موزدەلیفە، فەرمووی: «هەر کەس ئەم نوێژەمان لەگەڵ بکات لێرەدا، پاشان لەگەڵماندا بمێنێتەوە، پێش ئەوەش لە عەرەفە وەستابێت شەو یان ڕۆژ، ئەوە بێگومان حەجەکەی تەواوە».

## بَابُ الرُّكُوبِ إِلَى الْجِمَارِ وَاسْتِظْلَالِ الْمُحْرِمِ

### باسی سواربوونی ئاژەڵ بۆ بەردبارانکردنی جەمرەکان و سێبەر بۆ ئیحرامپۆش

٣٢١. عَن جَابِرِ بْن عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَرْمِي الْجَمْرَةَ وَهُوَ عَلَى بَعِيرِهِ، وَهُوَ يَقُولُ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، خُذُوا مَنَاسِكَكُمْ، فَإِنِّي لَا أَدْرِي لَعَلِّي لَا أَحُجُّ بَعْدَ عَامِي هَذَا».



جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەردبارانی (الجَمْرَةَ) ـەی دەکرد بەسەر وشترەکەیەوە، دەیفەرموو: «ئەی خەڵکینە! دروشمەکانتانم لێ وەربگرن (لە منەوە فێر بن)، چونکە من نازانم لەوانەیە دوای ئەم ساڵە حەج نەکەمەوە».

## بَابُ وَقْتِ رَمْيِ جَمْرَةِ الْعَقَبَةِ يَوْمَ النَّحْرِ

### باسی کاتی بەردبارانکردنی جەمرەی عەقەبە لە ڕۆژی قوربانیدا

٣٢٢. عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: رَمَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْجَمْرَةَ يَوْمَ النَّحْرِ، ضُحًى وَرَمَى بَعْدَ يَوْمِ

النَّحْرِ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ.

جابیر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەردبارانی جەمرەی کرد لە چێشتەنگاوی ڕۆژی قوربان، دوای ڕۆژی قوربانی بەردبارانی کرد کاتێك خۆر ترازا دوای نیوەڕۆ.

## بَابُ الرَّمْيِ بَعْدَ الْمَسَاءِ

### باسی بەردبارانکردن لەدوای ئێوارە

٣٢٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسْأَلُ أَيَّامَ مِنًى، فَيَقُولُ: «لَا حَرَجَ»، فَسَأَلَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ؟ قَالَ: «لَا حَرَجَ»، فَقَالَ رَجُلٌ: رَمَيْتُ بَعْدَ مَا أَمْسَيْتُ؟ قَالَ: «لَا حَرَجَ».



ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژەکانی مینا پرسیاری لێ دەکرا، دەیفەرموو: «ئاساییە»، پیاوێک پرسیاری لێ کرد گوتی: سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانی بکەم؟ فەرمووی: «ئاساییە»، پیاوێکی دیکە گوتی: لەدوای ئێوارە بەردبارانم کرد؟ فەرمووی: «ئاساییە».

## بَابُ عَدَدِ الْحَصَى الَّتِي يَرْمِي بِهَا الْجِمَارَ

### باسی ژمارەی ئەو بەردانەی کە بەردبارانی جەمرەی پێ دەکرێت

٣٢٤. قَالَ سَعْدٌ ﵁: رَجَعْنَا فِي الْحَجَّةِ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَبَعْضُنَا يَقُولُ: رَمَيْتُ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، وَبَعْضُنَا يَقُولُ: رَمَيْتُ بِسِتٍّ، فَلَمْ يَعِبْ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ.

سەعد ﵁ دەڵێت: لە حەجکردن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ گەڕاینەوە هەندێکمان دەیگوت:

بەردبارانم کرد بە حەوت بەرد، هەندێکیان دەیگوت: بەردبارانم کرد بە شەش بەرد، کەسیان ڕەخنەیان لە کەس نەدەگرت.



# كِتَابُ الْجِهَادِ

## پەرتووکی جیهاد

### بَابُ وُجُوبِ الْجِهَادِ

### باسی پێویستبوون (یان واجببوون)ی جیهاد



٣٢٥. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا أُخْرِجَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ مَكَّةَ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَخْرَجُوا نَبِيَّهُمْ، إِنَّا لِلَّهِ، وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، لَيَهْلِكُنَّ، فَنَزَلَتْ: {أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ} الحج: ٣٩، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ سَيَكُونُ قِتَالٌ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَهِيَ أَوَّلُ آيَةٍ نَزَلَتْ فِي الْقِتَالِ.

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە مەککە دەرکرا، ئەبو بەکر رضي الله عنه گوتی: پێغەمبەرەکەیان دەرکرد، ئێمە هەر هیی خواین و هەر بۆ لای خوا دەگەڕێینەوە، ئەوانە لەناو دەچن، دواتر ئەم ئایەتە دابەزی: {أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ}، واتە: ڕێگە درا بۆ ئەو موسوڵمانانەی جەنگیان لەگەڵدا دەکرێت، جەنگ و جیهاد بکەن، لەبەر ئەوە ستەمیان لێ کراوە، بێگومان خوا بۆ سەرخستنیان بەتوانایە. بۆیە زانیم لە ماوەیەکی کەمدا جەنگ ڕوو

دەدات، ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: ئەمە یەکەمین ئایەتە لەبارەی جەنگەوە دابەزی.

## التَّشْدِيدُ فِي تَرْكِ الْجِهَادِ

### هەڕەشەکردن لە وازهێنان لە جیهاد

٣٢٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ، وَلَمْ يُحَدِّثْ نَفْسَهُ بِغَزْوٍ، مَاتَ عَلَى شُعْبَةِ نِفَاقٍ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس مرد جەنگ و جیهادی نەکردبوو، نیەتیشی نەبووبێت جیهاد بکات، ئەوە لەسەر بەشێکی دووڕوویی مردووە».



## فَضْلُ مَنْ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ

### چاکەی ئەو کەسەی جیهاد دەکات لەپێناو خوا بە گیان و ماڵی

٣٢٧. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁: أَنَّ رَجُلًا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «مَنْ جَاهَدَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «ثُمَّ مُؤْمِنٌ فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ يَتَّقِي اللَّهَ، وَيَدَعُ النَّاسَ مِنْ شَرِّهِ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا چاکترینی خەڵکی کێیە؟ فەرمووی: «کەسێك جیهاد بکات بە گیان و ماڵی لەپێناو خوا»، گوتی: پاشان کێ چاکترین کەسە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: «پاشان بڕوادارێک لە شیوێک لە شیوەکان لە خوا بترسێت، خەڵك

پارێزراو بن لە خراپەی (واتە: زیانی بۆ خەڵک نەبێت)».

## فَضْلُ مَنْ عَمِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَلَى قَدَمِهِ

### پێگە و پاداشتی کەسێك کار بکات لەپێناوی خوا لەسەر پێیەکانی

٣٢٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدُخَانُ جَهَنَّمَ فِي مَنْخَرَيْ مُسْلِمٍ، وَلَا يَجْتَمِعُ شُحٌّ وَإِيمَانٌ فِي قَلْبِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دوو شت هەن هەرگیز پێکەوە لە هەناوی بەندەدا کۆ نابنەوە، تۆزی جیهاد لەپێناو خوادا لەگەڵ دووکەڵی دۆزەخ، هەروەها ڕەزیلی و ئیمانیش لە دڵی بەندەیەکدا هەرگیز پێکەوە کۆ نابنەوە».



## ثَوَابُ عَيْنٍ سَهِرَتْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ

### پاداشتی چاوێک لەپێناو خوادا ﷻ نەخەوێت

٣٢٩. عَن أَبَا رَيْحَانَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «حُرِّمَتْ عَيْنٌ عَلَى النَّارِ سَهِرَتْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ».

ئەبو ڕەیحانە ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «چاوێک ئاگری لەسەر حەرام کراوە لەپێناو خوادا نەخەوێت».

## فَضْلُ غَدْوَةٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ

### پێگە و پاداشتی بەیانی زوو دەرچوون بۆ جیهاد لەپێناو خوادا ﷻ

٣٣٠. عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْغَدْوَةُ وَالرَّوْحَةُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ أَفْضَلُ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا».

سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سەرلەبەیانییەک و سەرلەئێوارەیەک دەرچوون بۆ جیهاد لەپێناوی خوادا ﷻ چاکترە لە دونیا و ئەوەشی تێیدایە».

## بَابُ الْغُزَاةِ وَفْدُ اللَّهِ تَعَالَى



### باسی ئەوەی کە جەنگاوەران میوانی بەڕێزی خوای بەرزن

٣٣١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَفْدُ اللَّهِ ﷻ ثَلَاثَةٌ: الْغَازِي، وَالْحَاجُّ، وَالْمُعْتَمِرُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «میوانە بەڕێزەکانی خوا (لە گەشتیارەکان) سیانن: ئەو کەسەی غەزا دەکات، ئەو کەسەی حەج دەکات، ئەو کەسەی عومرە دەکات».

## مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ

### نموونەی ئەو کەسەی جیهاد دەکات لەپێناوی خوا ﷻ

٣٣٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِهِ، كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْخَاشِعِ الرَّاكِعِ السَّاجِدِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «وێنەی ئەو کەسەی جیهاد دەکات لەپێناو خوادا، خوا زاناترە بەوەی جیهاد دەکات لەپێناویدا، وەکوو ئەو کەسە وایە بە ڕۆژ بەڕۆژووە و بە شەو شەونوێژ دەکات بەگەردنکەچییەوە ڕکووع و سوجدە دەبات».

## مَا يَعْدِلُ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ

### ئەو کردەوەیەی دەگاتە ئاستی جیهادکردن لەپێناو خوا ﷻ

٣٣٣. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁: أَنَّهُ سَأَلَ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ الْعَمَلِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «إِيمَانٌ بِاللَّهِ، وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ».

ئەبو زەر ﵁ دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: چ کردەوەیەک چاکە؟ فەرمووی: «بڕواهێنان بە خوا و جیهادکردن لەپێناو خوادا ﷻ».

## مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا

### ئەو کەسەی دەجەنگێ لەپێناو بەرزکردنەوەی وشەی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)

٣٣٤. عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﵁ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ

الرَّجُلُ: يُقَاتِلُ لِيُذْكَرَ، وَيُقَاتِلُ لِيَغْنَمَ، وَيُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ، فَمَنْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ قَالَ: «مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ».

ئەبو مووسای ئەشعەری ﵁ دەڵێت: دەشتەکییەک هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پیاوەکە گوتی: کەسێک دەجەنگێت بۆ ئەوەی باس بکرێت و ناوبانگی هەبێت، کەسێکی دیکەش دەجەنگێت بۆ ئەوەی دەستکەوت وەربگرێت، کەسێکی دیکەش دەجەنگێت لەبەر ئەوەی خەڵکی ببینن چەندە بوێر و ئازایە، کامەیان لەپێناو خوادایە؟ فەرمووی: «هەر کەس بجەنگێت بۆ ئەوەی وشەی خوا: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) بەرز بێت، تەنها ئەوە لەپێناو خوایە ﷻ».

## مَنْ غَزَا يَلْتَمِسُ الْأَجْرَ وَالذِّكْرَ



### هەر کەسێک بجەنگێت بە مەبەستی بەدەستهێنانی ناوبانگ

٣٣٥. عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: أَرَأَيْتَ رَجُلًا غَزَا يَلْتَمِسُ الْأَجْرَ وَالذِّكْرَ، مَالَهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا شَيْءَ لَهُ»، فَأَعَادَهَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، يَقُولُ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا شَيْءَ لَهُ»، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبَلُ مِنَ الْعَمَلِ إِلَّا مَا كَانَ لَهُ خَالِصًا، وَابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ».

ئەبو ئومامەی باهیلی ﵁ دەڵێت: پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: هەواڵم بدەرێ دروستە کەسێک بجەنگێت مەبەستی پاداشت و ناوبانگ و ماڵ و سامان بێت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هیچ پاداشتی بۆ نییە»، سێ جار دووبارەی کردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: «هیچ پاداشتی بۆ نییە»، پاشان فەرمووی: «بێگومان خوا ﷻ هیچ کردەوەیەک وەرناگرێت مەگەر بەدڵسۆزی تەنها بۆ خوا بێت و لەپێناو ئەودا بێت».

## ثَوَابُ مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ ﷻ

## پاداشتی ئەو کەسەی لەپێناوی خوا ﷻ تیرێک دەهاوێژێت

٣٣٦. عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ شَابَ شَيْبَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى، كَانَتْ لَهُ نُورًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى بَلَغَ الْعَدُوَّ، أَوْلَمْ يَبْلُغْ، كَانَ لَهُ كَعِتْقِ رَقَبَةٍ، وَمَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُؤْمِنَةً، كَانَتْ لَهُ فِدَاءَهُ مِنَ النَّارِ عُضْوًا بِعُضْوٍ».

عەمرِی کوڕی عەبەسە ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەس بە گەنجێتی جیهاد بکات لەپێناو خوای بەرزدا تاکوو تاڵەمووەکانی سپی دەبن، ئەوە بۆی دەبێت بە ڕووناکی لە ڕۆژی دواییدا، هەر کەسێکیش تیرێک لەپێناوی خوای بەرزدا بهاوێژێت و دوژمن بپێکێت یان نەیپێکێت، وەکوو ئەوە وایە بەندەیەکی ئازاد کردبێت، هەر کەسیش بەندەیەکی بڕوادار ئازاد بکات، ئەوە دەبێتە مایەی ڕزگاربوونی ئەندام بە ئەندامی لاشەکەی لە ئاگر».



## بَابُ مَنْ كُلِمَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ

## باسی ئەو کەسەی بریندار دەبێت لەپێناو خوا ﷻ

٣٣٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ ثَعْلَبَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «زَمِّلُوهُمْ بِدِمَائِهِمْ، فَإِنَّهُ لَيْسَ كَلْمٌ يُكْلَمُ فِي اللَّهِ، إِلَّا أَتَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ جُرْحُهُ يَدْمَى، لَوْنُهُ لَوْنُ دَمٍ، وَرِيحُهُ رِيحُ الْمِسْكِ».

عەبدوڵڵای کوڕی سەعلەبە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «(شەهیدەکان) بە خوێنەکانیانەوە دایانپۆشن، چونکە هیچ بریندارێک نییە برینەکەی

خوێنی لێ بچۆڕێت لەبەر خوا، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا دێت برینەکەی خوێنی لێ دەڕوات، ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە و بۆنەکەی بۆنی میسکە».

## بَابُ تَمَنِّي الْقَتْلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى

### باسی ئاوات و خۆزگەی کوژران و شەهیدبوون لەپێناو خوای گەورە

٣٣٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَمْ أَتَخَلَّفْ عَنْ سَرِيَّةٍ، وَلَكِنْ لَا يَجِدُونَ حَمُولَةً، وَلَا أَجِدُ مَا أَحْمِلُهُمْ عَلَيْهِ، وَيَشُقُّ عَلَيْهِمْ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِّي، وَلَوَدِدْتُ أَنِّي قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، ثُمَّ أُحْيِيتُ، ثُمَّ قُتِلْتُ، ثُمَّ أُحْيِيتُ، ثُمَّ قُتِلْتُ»، ثَلَاثًا.

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ سێ جار فەرمووی: «ئەگەر قورسایی نەبووایە بۆ ئوممەتەکەم لە هیچ لەشکرێک دوا نەدەکەوتم، بەڵام ئەوان سواریان نییە (وشتر، یان ئێستر، یان گوێدرێژ) کەلوپەلی ڕێگاوبانیان بۆ هەڵبگرێت، منیش ئەوەندەم نییە لەئەستۆی بگرم، پێشیاننناخۆشە دوا بکەون لە من، ئاواتم دەخواست لەپێناو خوادا جەنگابام (و شەهید بوومایە)، پاشان زیندوو کرابامەوە، پاشان کوژرابام، پاشان زیندوو کرابامەوە، پاشان کوژرابام».



## مَنْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى وَعَلَيْهِ دَيْنٌ

### هەرکەس لەپێناو خوادا جەنگا و قەرزی لەسەربوو

٣٣٩. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ صَابِرًا مُحْتَسِبًا مُقْبِلًا غَيْرَ مُدْبِرٍ، أَيُكَفِّرُ اللَّهُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَعَمْ»، فَلَمَّا وَلَّى الرَّجُلُ، نَادَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ،

أَوْأَمَرَ بِهِ فَنُودِيَ لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَيْفَ قُلْتَ؟»، فَأَعَادَ عَلَيْهِ قَوْلَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَعَمْ، إِلَّا الدَّيْنَ، كَذَلِكَ قَالَ لِي جِبْرِيلُ عليه السلام».

ئەبو قەتادە رضي الله عنه دەڵێت: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەگەر من بکوژرێم لەپێناوی خوا سبحانه وتعالى بەخۆڕاگریی و چاوەڕوانی پاداشت و ڕووبەڕووی دوژمن بەبێ ئەوەی پشت هەڵبکەم، ئایا خوا گوناهەکانم دەسڕێتەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەڵێ»، کاتێك پیاوەکە پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد، یان فەرمانی کرد بۆی بانگ کرا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «چیت گوت؟»، قسەکەی دووبارە کردەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەڵێ، جگە لە قەرز، جیبریل بەم شێوەیەی پێ گوتم».

## مَا يَجِدُ الشَّهِيدُ مِنَ الْأَلَمِ

### ئەوەی شەهید دەیبینێت لە ئێش و ئازار

٣٤٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الشَّهِيدُ لَا يَجِدُ مَسَّ الْقَتْلِ إِلَّا كَمَا يَجِدُ أَحَدُكُمُ الْقَرْصَةَ يُقْرَصُهَا».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «شەهید ئازاری کوشتن نابینێت مەگەر وەکوو ئەوە نەبێت کە یەکێک قونجگێکی لێ بگیرێت».

## الِاسْتِنْصَارُ بِالضَّعِيفِ

### داواکردنی سەرکەوتن بە لاوازەوە

٣٤١. عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا يَنْصُرُ اللَّهُ

هَذِهِ الْأُمَّةَ بِضَعِيفِهَا، بِدَعْوَتِهِمْ وَصَلَاتِهِمْ وَإِخْلَاصِهِمْ».

موصعەبی کوڕی سەعد لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی خوا ئەم ئوممەتە سەر دەخات بەهۆی لاوازەکانیەوە، بە دوعا و نوێژ و دڵسۆزییان».

## فَضْلُ الصَّدَقَةِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ

### پێگە و پاداشتی بەخشین لەپێناو خوا ﷻ

٣٤٢. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﵁: أَنَّ رَجُلاً تَصَدَّقَ بِنَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيَأْتِيَنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِسَبْعِ مِائَةِ نَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ».



ئەبو مەسعوود ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێک وشترێکی جڵەوکراوی بەخشی لەپێناو خوادا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «لە ڕۆژی دواییدا بە حەود سەد وشتری جڵەوکراوەوە دێت (وەك پاداشت پێی دەدرێت)».

## حُرْمَةُ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ

### قەدەغەبوونی خێزان و هاوسەری موجاهیدەکان

٣٤٣. عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «حُرْمَةُ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ كَحُرْمَةِ أُمَّهَاتِهِمْ، وَمَا مِنْ رَجُلٍ يَخْلُفُ فِي امْرَأَةِ رَجُلٍ مِنَ الْمُجَاهِدِينَ فَيَخُونُهُ فِيهَا، إِلَّا وُقِفَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَأَخَذَ مِنْ عَمَلِهِ مَا شَاءَ، فَمَا ظَنُّكُمْ».

سولەیمانی کوڕی بوڕەیدە لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا

ﷺ فەرموویەتی: «قەدەغەبوونی هاوسەری موجاهیدان لەسەر نیشتەجێبووان وەکوو قەدەغەبوونی دایکانیان وایە، جا هەر کەس چاودێری هاوسەری موجاهیدەکان بکەوێتە ئەستۆی و ناپاکی لێ بکات، مسۆگەر لە ڕۆژی قیامەتدا دەوەستێنرێت، لە کردەوەکانی دەبات هەرچەندەی بوێت، جا گومانتان چۆنە (ئایا هیچ چاکەیەکی بۆ دەهێڵێتەوە)؟».

## مَنْ خَانَ غَازِيًا فِي أَهْلِهِ

### ئەو کەسەی ناپاکی لە خێزانی موجاهیدێک دەکات

٣٤٤. عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «جَاهِدُوا بِأَيْدِيكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ».

ئەنەس رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جیهاد بکەن بە دەستەکانتان و زمانتان و ماڵەکانتان».



# كِتَابُ النِّكَاحِ

# پەرتووكی هاوسەرگیری

## الْحَثُّ عَلَى النِّكَاحِ



### هاندان لەسەر هاوسەرگیری

٣٤٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَنْكِحْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَا، فَلْيَصُمْ، فَإِنَّ الصَّوْمَ لَهُ وِجَاءٌ».

عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: «ئەی كۆمەڵی گەنجان، هەر كەس لە ئێوە توانای هاوسەرگیری هەیە با ئەنجامی بدات، چونكە هاوسەرگیری بۆ چاوپارێزی و داوێنپارێزی چاكترین هۆكارە، هەر كەسیش توانای نەبوو با بەڕۆژوو بێت، چونكە ڕۆژوو بۆ ئەو قەڵغانە».

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ التَّبَتُّلِ

### باسی قەدەغەکردنی وازهێنان لە ئافرەتان

٣٤٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي رَجُلٌ شَابٌّ، قَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِيَ الْعَنَتَ، وَلَا أَجِدُ طَوْلاً أَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، أَفَأَخْتَصِي؟ فَأَعْرَضَ عَنْهُ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى قَالَ ثَلَاثًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، جَفَّ الْقَلَمُ بِمَا أَنْتَ لَاقٍ، فَاخْتَصِ عَلَى ذَلِكَ، أَوْ دَعْ».

ئەبو هوڕەیڕە ﵁ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من پیاوێکی گەنجم، دەترسم تووشی گوناه ببم، ژیانم باش نییە ژن بهێنم، ئایا خۆم بخەسێنم؟ پێغەمبەر ﷺ پشتی تێ کرد تاوەکوو سێ جار دووبارەی کردەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «ئەی ئەبو هوڕەیڕە! قەڵەم وشک بووەتەوە لەوەی تووشت دەبێت، ئەگەر ویستت ئەندامێکی جەستەت ببڕیت، یان نەیبڕیت، (تۆ هەر تووشی قەزا و قەدەری خوا دەبیت)».



## تَزَوُّجُ الْمَرْأَةِ مِثْلَهَا فِي السِّنِّ

### خوازبێنیی ئافرەتێکی هاوشێوەی خۆی لە تەمەندا

٣٤٧. عَنْ بُرَيْدَةَ ﵁ قَالَ: خَطَبَ أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ ﵄ فَاطِمَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّهَا صَغِيرَةٌ»، فَخَطَبَهَا عَلِيٌّ، فَزَوَّجَهَا مِنْهُ.

بوڕەیدە ﵁ دەڵێت: ئەبو بەکر و عومەر داوای فاتیمەیان کرد ﵄ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەو منداڵە»، بەڵام کە عەلی داوای کرد، پێغەمبەر ﷺ لێی مارە کرد.

## كَرَاهِيَةُ تَزْوِيجِ الْعَقِيمِ

### ژن مارەبڕین بۆ کەسی نەزۆک یان وەجاخکوێر باش نییە

٣٤٨. عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي أَصَبْتُ امْرَأَةً ذَاتَ حَسَبٍ وَمَنْصِبٍ، إِلَّا أَنَّهَا لَا تَلِدُ، أَفَأَتَزَوَّجُهَا؟ فَنَهَاهُ، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّانِيَةَ، فَنَهَاهُ، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّالِثَةَ، فَنَهَاهُ، فَقَالَ: «تَزَوَّجُوا الْوَلُودَ الْوَدُودَ، فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ».

مەعقیلی کوڕی یەسار ﵁ دەڵێت: پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: من ئافرەتێکی خاوەن بنەماڵە و پلەوپایەم بەدی کردووە، ئەوە نەبێت منداڵی نابێت، ئایا بیخوازم؟ پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی لێ کرد، پاشان جارێکی دیکە هاتەوە، بە هەمان شێوە قەدەغەی لێ کرد، پاشان جاری سێیەم هاتەوە، بە هەمان شێوە قەدەغەی لێ کرد، ئینجا فەرمووی: «ئافرەتانێک بخوازن منداڵیان بێت و خۆشتان بوێن، چونکە من بە ئێوەوە زۆر دەبم لە ڕۆژی دواییدا».



## أَيُّ النِّسَاءِ خَيْرٌ

### باشترین ئافرەت کامەیە

٣٤٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ النِّسَاءِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «الَّتِي تَسُرُّهُ إِذَا نَظَرَ، وَتُطِيعُهُ إِذَا أَمَرَ، وَلَا تُخَالِفُهُ فِي نَفْسِهَا وَمَالِهَا بِمَا يَكْرَهُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوترا: چی ژنێک چاکە؟ فەرمووی: «ئەوەی کاتێك دەیبینێت دڵت خۆش دەبێت، کاتێك فەرمانی پێ کرا گوێڕایەڵیی بکات، نە لە دەروون و نە لە ماڵیدا شتێك نەکات مێردەکەی پێیناخۆش بێت».

## الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ

### ژنی چاکەخواز و خواناس

٣٥٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵄ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الدُّنْيَا كُلَّهَا مَتَاعٌ، وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرى کوڕی عاص ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «دونیا هەمووی چێژ و لەزەتە، وە چاکترینی چێژ و لەزەتەکانی دونیا ژنێکی چاکە».

## عَرْضِ الْمَرْأَةِ نَفْسَهَا عَلَى مَنْ تَرْضَى



### باسی ئافرەت خۆی پیشان بدات بۆ ئەو کەسەی دێتە داوای

٣٥١. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ امْرَأَةً عَرَضَتْ نَفْسَهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَضَحِكَتِ ابْنَةُ أَنَسٍ، فَقَالَتْ: مَا كَانَ أَقَلَّ حَيَاءَهَا فَقَالَ أَنَسٌ: هِيَ خَيْرٌ مِنْكِ، عَرَضَتْ نَفْسَهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ.

ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک خۆی خستە ڕوو بۆ پێغەمبەر ﷺ، کچەکەی ئەنەس پێکەنی و گوتی: ئای کە چەندە بێشەرمە، ئەنەس گوتی: ئەوە لە تۆ چاکترە، خۆی خستووەتە ڕوو بۆ پێغەمبەر ﷺ.

## الصلاة المرأة إذا خطبت واستخارتها ربها

## ئافرەت كاتێك داوا كرا نوێژی ئیستیخاره بكات

٣٥٢. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ يَقُولُ: كَانَتْ زَيْنَبُ بِنْتُ جَحْشٍ تَفْخَرُ عَلَى نِسَاءِ النَّبِيِّ ﷺ، تَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ أَنْكَحَنِي مِنَ السَّمَاءِ، وَفِيهَا نَزَلَتْ آيَةُ الْحِجَابِ.

ئەنەسی كوڕی مالیك ﵁ دەڵێت: زەینەب شانازی دەكرد بەسەر خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ دەیگوت: بێگومان خوا ﷻ لە ئاسمانەوە منی مارە كردووە، (دەشیگوت:) ئایەتی حیجابیش لەبارەی ئەوەوە دابەزی.

## الثَّيِّبُ يُزَوِّجُهَا أَبُوهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ



## بێوەژن باوكی بەشووی بدات، لە كاتێكدا خۆی ناڕازی بێت

٣٥٣. عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ ﵂: أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ ثَيِّبٌ، فَكَرِهَتْ ذَلِكَ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَرَدَّ نِكَاحَهُ.

خەنسائی كچی خیزام ﵂ دەگێڕێتەوە: باوكی بەشووی دا و ئەو بێوەژن بوو، ئەوەی پێناخۆش بوو، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش مارەكردنەكەی هەڵوەشاندەوە.

## مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الْكَلَامِ عِنْدَ النِّكَاحِ

### ئەوەی پەسندە لە قسەکردن لە کاتی مارەکردندا

٣٥٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: عَلَّمَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ التَّشَهُّدَ فِي الصَّلَاةِ، وَالتَّشَهُّدَ فِي الْحَاجَةِ، قَالَ: «التَّشَهُّدُ فِي الْحَاجَةِ: أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ، نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّه مِنْ شُرُورِ أَنْفسِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ، فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ، فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»، وَيَقْرَأُ ثَلَاثَ آيَاتٍ.

عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری تەحیاتی کردین لە نوێژ (التَّشَهُّدَ) و لە کاتی وتاردان، گوتی: (التَّشَهُّدَ) لە کاتی وتاردان (ئەوەیە بڵێی): «بێگومان ستاییش هەر بۆ خوایە، پشتی پێ دەبەستین و داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەین، وە پەنا دەگرین بە خوا لە خراپی نەفس و دەروونمان، هەر کەس خوا هیدایەتی بدات، ئەوە کەس ناتوانێت گومڕای بکات، هەر کەسیش خوا گومڕای بکات، ئەوە هیچ کەسێک نییە هیدایەتی بدات، شایەتی دەدەم بەڕاستی هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوای تاک و تەنها، شایەتی دەدەم موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە»، سێ ئایەتیشی دەخوێند.

## الشُّرُوطُ فِي النِّكَاحِ

### مەرجەکان لە مارەکردندا

٣٥٥. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَحَقَّ الشُّرُوطِ أَنْ يُوَفَّى بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ».

عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی ڕەواترین مەرج کە وەفای پێ بکەن، مەرجی ئەو زەواجەیە کە دامێنتان بەهۆیەوە حەڵاڵ کردوە».

## الْجَمْعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا (وَخَالَتِهَا)

### هاوسەرگیریکردن لەگەڵ ژن و پوورەکەی (خوشکی باوکی) بە مەبەستی هاوسەرگیری

٣٥٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَلَا بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ژن و پوورەکەی پێکەوە کۆ ناکرێنەوە، جا خوشکی باوکی بێت، یا خوشکی دایکی».



## الْقَدْرُ الَّذِي يُحَرِّمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ

### ئەندازەی ئەو شیرخواردنەی کچ و کوڕەکە لەیەکدی حەرام دەکات

٣٥٧. عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ ﷺ: أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الرَّضَاعِ، فَقَالَ: «لَا تُحَرِّمُ الْإِمْلَاجَةُ وَلَا الْإِمْلَاجَتَانِ».

ئوم فەزل ﷺ دەگێڕێتەوە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی شیرپێدانەوە، فەرمووی: «یەک مژین، یان دوو مژین، حەرامی ناکات».

## بَابُ الشِّغَارِ

### باسی ژن بە ژنێ

٣٥٨. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا جَلَبَ، وَلَا جَنَبَ، وَلَا شِغَارَ فِي الْإِسْلَامِ، وَمَنْ انْتَهَبَ نُهْبَةً فَلَيْسَ مِنَّا».

عیمرانی کوڕی حوصەین ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نە (جَلَبُ) و نە (جَنَبَ) و نە (شِغَارَ) لە ئیسلامدا دروست نییە، هەر کەس ماڵێک داگیر بکات لە (سەر سوننەتی) ئێمە نییە».

✎ تێبینی:



(الْجَلَب): لە پێشبڕکێدا ئەوەیە پیاوێک شوێنی ئەسپەکەی بکەوێت و قامچی لێ بدات و هاواری بەسەردا بکات بۆ ئەوەی چاک غار بدات.

(الْجَنَب): پێشبڕکێکار لە تەنیشت ئەسپەکەیدا ئەسپێکی دیکە دادەنێت ئەگەر یەکەم خاو بوویەوە دەچێتە سەر ئەوی دیکە بۆ ئەوەی پێش بکەوێت.

(الشِّغَار): بریتییە لەوەی پیاوێک کچەکەی خۆی دەدات بە پیاوێکی دیکە، لەبری ئەوەی ئەویش کچەی خۆی بدات بە ئەم، هیچ مارەییەکەیش لە نێوانیاندا نییە، ئەم زەواجە لە ئیسلامدا دروست نییە.

## تَفْسِيرُ الشِّغَارِ

### ڕاڤەکردنی ژن بە ژنە (الشِّغَار)

٣٥٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الشِّغَارِ. وَالشِّغَارُ أَنْ يُزَوِّجَ الرَّجُلُ

الرَّجُلَ ابْنَتَهُ عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ ابْنَتَهُ، وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا صَدَاقٌ.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لە ژن بە ژنێکردن. جا (الشِّغَار): بریتییە لەوەی پیاوێک کچەکەی خۆی دەدات بە پیاوێک لەبری ئەوەی ئەویش کچەی خۆی بدات بە ئەم، هیچ مارەییەکیش لە نێوانیاندا نییە.

## عَتْقُ الرَّجُلِ جَارِيَتَهُ ثُمَّ يَتَزَوَّجُهَا

## ئازادکردنی کەنیزەک لەلایەن خاوەنەکەیەوە و پاشان خواستنی

٣٦٠. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ: رَجُلٌ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ فَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ أَدَبَهَا، وَعَلَّمَهَا فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، وَعَبْدٌ يُؤَدِّي حَقَّ اللَّهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ، وَمُؤْمِنُ أَهْلِ الْكِتَابِ».



ئەبو مووسا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سێ کەس هەن دوو جار پاداشت وەردەگرن: کەسێک کەنیزەکێکی هەبێت و بەچاکترین شێوە پەروەردەی کردبێت، بەچاکترین شێوەش فێری کردبێت، پاشان ئازادی بکات و خۆی بیخوازێت، بەندەیەک مافی خوا و مافی خاوەنەکەی بدات، هەروەها بڕوادارێکی خاوەن کتێبیش (کەسێک پێشتر جوولەکە بووە، یان نەصرانی بووە، دواتر ئیمانی بە ئیسلام هێناوە)».

## الْقِسْطُ فِي الْأَصْدِقَةِ

## دادپەروەری لە مارەییەکاندا

٣٦١. عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَتْ: فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

عَلَى اثْنَتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً وَنَشٍّ، وَذَلِكَ خَمْسُ مِائَةِ دِرْهَمٍ.

ئەبو سەلەمە دەڵێت: پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂ لەبارەی مارەییەوە، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوازدە ئوقیە و بیست درهەم کردی، ئەویش پێنج سەد درهەم بوو.



# كِتَابُ الطَّلَاقِ

## پەرتووكی تەڵاق (جیابوونەوە)

### بَابُ وَقْتِ الطَّلَاقِ لِلْعِدَّةِ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ



### باسی كاتی تەڵاق بۆ ئەو ماوەیەی كە خوا بڕیاری داوە ئافرەتی تێدا تەڵاق بدرێت

٣٦٢. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ، ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ، وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ ﷻ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: ئەو ژنەكەی تەڵاق دا لە حەیزدا بوو لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، عومەری كوڕی خەتتاب پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد دەربارەی ئەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «فەرمان بكە بە عەبدوڵڵا با بیهێنێتەوە، پاشان بیهێڵێتەوە تا پاك دەبێتەوە لە حەیزەكەی، پاشان جارێكی دیكە بكەوێتە حەیزەوە و پاكیش ببێتەوە، پاشان ئەگەر ویستی با لای خۆی بیهێڵێتەوە، ئەگەریش ویستی با تەڵاقی بدات پێش ئەوەی بچێتە لای، ئەمە ئەو ماوە دیاریكراوەیە

کە خوای باڵادەست فەرمانی کردووە ژنی تێدا تەڵاق بدرێت».

## بَابُ طَلَاقِ السُّنَّةِ

### باسی تەڵاقی سوننەت (ئەو تەڵاقەی بەپێی سوننەتە)

٣٦٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: طَلَاقُ السُّنَّةِ تَطْلِيقَةٌ وَهِيَ طَاهِرٌ فِي غَيْرِ جِمَاعٍ، فَإِذَا حَاضَتْ وَطَهُرَتْ طَلَّقَهَا أُخْرَى، فَإِذَا حَاضَتْ وَطَهُرَتْ طَلَّقَهَا أُخْرَى، ثُمَّ تَعْتَدُّ بَعْدَ ذَلِكَ بِحَيْضَةٍ. قَالَ الْأَعْمَشُ: سَأَلْتُ إِبْرَاهِيمَ فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ.

عەبدوڵڵا ﷺ گوتوویەتی: تەڵاقی سوننەت یەک دانەیە، لە کاتێکدایە پاک بێت و سەرجێیی لەگەڵدا نەکردبێت، جا کاتێك کەوتە حەیزەوە و پاک بوویەوە جارێکی دیکە تەڵاقی دەدات، ئینجا کاتێك کەوتە حەیزەوە و پاک بوویەوە جارێکی دیکە تەڵاقی دەدات، پاشان دوای ئەوە یەک حەیزی دیکە عیدە دەگرێتەوە، ئەعمەش (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) گوتی: پرسیارم لە ئیبراهیم کرد، ئەویش هەمان قسەی کرد.

## بَابُ مَا يَفْعَلُ إِذَا طَلَّقَ تَطْلِيقَةً وَهِيَ حَائِضٌ

### باسی ئەوەی دەکرێت ئەگەر لە کاتی حەیز ژنەکەی جارێك تەڵاق دا

٣٦٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُطَلِّقْهَا وَهِيَ طَاهِرٌ أَوْ حَامِلٌ».

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو ژنەکەی تەڵاق دا لە حەیزدا بوو، ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، فەرمووی: «فەرمانی پێ بکە با بیگەڕێنێتەوە، پاشان کاتێك

تەڵاقی بدات پاک بێت یان دووگیان بێت».

## الطَّلَاقُ لِلَّتِي تَنْكِحُ زَوْجًا، ثُمَّ لَا يَدْخُلُ بِهَا

### تەڵاقدانی ئەو ژنەی شوو دەکات بە پیاوێکی دیکە، پاشان ناچێتە لایەوە

٣٦٥. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي نَكَحْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ، وَاللَّهِ مَا مَعَهُ إِلَّا مِثْلُ هَذِهِ الْهُدْبَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ، لَا، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ وَتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ».

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: ژنەکەی ڕیفاعەی قوڕەزی هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من شووم کردووە بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زوبەیر، سوێند بە خوا ئەو (ئامێری جووتبوونی) وەکوو چمکی ئەم کراسە وایە (توانای سەرجێیی نییە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «(ئەگەر) دەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ لای ڕیفاعە، نابێت، تا تۆ چێژ لە ئەو (عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زوبەیر) وەردەگریت، ئەویش چێژ لە تۆ وەردەگرێت».



## بَابُ إِحْلَالِ الْمُطَلَّقَةِ ثَلَاثًا وَالنِّكَاحِ الَّذِي يُحِلُّهَا بِهِ

### باسی حەڵاڵکردنی ژنی سێ بە سێ تەڵاقدراو و ئەو خوازبێنییەش کە حەڵاڵی دەکاتەوە پێی

٣٦٦. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ ثَلَاثًا فَيَتَزَوَّجُهَا الرَّجُلُ، فَيُغْلِقُ الْبَابَ وَيُرْخِي السِّتْرَ، ثُمَّ يُطَلِّقُهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا؟ قَالَ: «لَا تَحِلُّ لِلْأَوَّلِ حَتَّى يُجَامِعَهَا الْآخَرُ».

ئیبن عومەر ڕَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەگێڕێتەوە: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی پیاوێک ژنەکەی سێ بە سێ تەڵاق دەدا، پاشان پیاوێکی دیکە مارەی کردووە، دەرگا دەگیرێت و پەردەش دادەنرێت (کەس نایانبینێت)، پاشان تەڵاقی دەدات پێش ئەوەی بچێتە لایەوە؟ فەرمووی: «حەڵاڵ نابێت بۆ پیاوی یەکەم هەتا ئەو پیاوەی دووەم جیماعی لەگەڵدا نەکات».

## بَابُ مَنْ لَا يَقَعُ طَلَاقُهُ مِنَ الْأَزْوَاجِ

### باسی ئەو پیاوەی کە تەڵاقی ناکەوێت

٣٦٧. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبُرَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ أَوْ يُفِيقَ».

عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «قەڵەم لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: لەسەر خەوتوو تا هەڵدەستێت، لەسەر بچووک تا گەورە دەبێت، لە سەر شێت تا ئاقڵ دەبێت یان چاک دەبێتەوە».

## بَابُ مَنْ طَلَّقَ فِي نَفْسِهِ

### باسی ئەو کەسەی لە ناخی خۆیدا ژنەکەی تەڵاق بدات

٣٦٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي مَا وَسْوَسَتْ بِهِ وَحَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، مَا لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَتَكَلَّمْ بِهِ».

ئەبو هورەیرە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی خوای بەرز چاوپۆشیی کردووە لە ئوممەتەکەم لە هەر شتێك بە خەیاڵیدا بێت، بە مەرجێك بە

قسه نەیڵێت، یان بە کردەوە ئەنجامی نەدات».

## بَابُ الظِّهَارِ

### باسی (الظِّهَارِ) (پیاو بە ژنی بڵێت: تۆ وەک پشتی دایکمی)

٣٦٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ الْأَصْوَاتَ، لَقَدْ جَاءَتْ خَوْلَةُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تَشْكُو زَوْجَهَا، فَكَانَ يَخْفَى عَلَيَّ كَلَامُهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: {قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا} المجادلة: ١.

عائیشە ﵂ دەڵێت: سوپاس و ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە هەموو دەنگەکان دەبیستێت، خەولە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای مێردەکەی دەکرد، جا زۆر بەنهێنی قسەی دەکرد لە منی دەشاردەوە، خوا ﷻ ئەم دەقەی دابەزاندە خوارەوە: {قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا}، واتە: بە ڕاستی خوا بیستی وتەی ئەو ژنەی کە لەبارەی مێردەکەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ دەکردیت و سکاڵای خۆی بۆ لای خوا دەبرد، خواش گوێبیستی وتووێژی هەردووکتان بوو.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْخُلْعِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خولع (خۆداڕنینی ژن لە پیاو)

٣٧٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ أَمَا إِنِّي مَا أَعِيبُ عَلَيْهِ فِي خُلُقٍ وَلَا دِينٍ، وَلَكِنِّي أَكْرَهُ الْكُفْرَ فِي

الْإِسْلَامِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ؟»، قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْبَلِ الْحَدِيقَةَ وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَةً».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: ژنەکەی سابیتی کوڕی قەیس هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من هیچ کەموکوڕییەک نابینم لە ڕەوشت و دینی سابیت، بەڵام بێبڕواییم پێناخۆشە دوای موسوڵمانبوون (دەترسێم هۆکار بێت بۆ هەڵگەڕانەوەم لە ئایین)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئایا باخچەکەی بۆ دەگێڕیتەوە (کە مارەییەکەی بوو)؟»، (ژنەکە) گوتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ (بە سابیتی کوڕی قەیسی) فەرموو: «باخچەکە وەربگرەوە و تەڵاقێکی بدە».

## بَابُ كَيْفَ اللِّعَانُ

## چۆنیەتی مولاعەنە و نەفرینکردن



٣٧١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ لِعَانٍ كَانَ فِي الْإِسْلَامِ أَنَّ هِلَالَ بْنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ شَرِيكَ بْنَ السَّحْمَاءِ بِامْرَأَتِهِ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ بِذَلِكَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «أَرْبَعَةَ شُهَدَاءَ وَإِلَّا فَحَدٌّ فِي ظَهْرِكَ»، يُرَدِّدُ ذَلِكَ عَلَيْهِ مِرَارًا، فَقَالَ لَهُ هِلَالٌ: وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ ﷻ لَيَعْلَمُ أَنِّي صَادِقٌ، وَلَيُنْزِلَنَّ اللَّهُ ﷻ عَلَيْكَ مَا يُبَرِّئُ ظَهْرِي مِنَ الْجَلْدِ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ نَزَلَتْ عَلَيْهِ آيَةُ اللِّعَانِ: {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ} النور: ٦، إِلَى آخِرِ الْآيَةِ، فَدَعَا هِلَالًا فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ، ثُمَّ دُعِيَتِ الْمَرْأَةُ فَشَهِدَتْ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ، فَلَمَّا أَنْ كَانَ فِي الرَّابِعَةِ أَوِ الْخَامِسَةِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَقِّفُوهَا فَإِنَّهَا مُوجِبَةٌ»، فَتَلَكَّأَتْ حَتَّى مَا شَكَكْنَا أَنَّهَا سَتَعْتَرِفُ، ثُمَّ قَالَتْ: لَا أَفْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ الْيَوْمِ، فَمَضَتْ عَلَى الْيَمِينِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «انْظُرُوهَا، فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَبْيَضَ سَبِطًا قَضِيءَ الْعَيْنَيْنِ فَهُوَ لِهِلَالِ بْنِ أُمَيَّةَ، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ آدَمَ جَعْدًا رَبْعًا حَمْشَ السَّاقَيْنِ فَهُوَ

لِشَرِيكِ بْنِ السَّحْمَاءِ»، فَجَاءَتْ بِهِ آدَمَ جَعْدًا رَبْعًا حَمْشَ السَّاقَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْلَا مَا سَبَقَ فِيهَا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأْنٌ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: یەکەم نەفرین لە ئیسلامدا کرا هیلالی کوڕی ئومەییە بوو شەریکی کوڕی سەحمائی تۆمەتبار کرد بەوەی چۆتە لای ژنەکەیەوە، هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئەوەی پێ دا، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «چوار شایەت بهێنە ئەگەرنا دار دەدەم لە پشتت»، چەند جارێک ئەوەی بۆ دووبارە کردەوە، هیلال پێی گوت: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خوا دەزانێت من ڕاست دەکەم، خوا ئایەت دادەبەزێنێت بۆئەوەی پشتی من بەری بکات لە دار، لە کاتێکدا ئەوان لەسەر ئەو حاڵە بوون، ئایەتی نەفرین دابەزی: {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ}، واتە: ئەوانەش ژنەکانیان تۆمەتبار کردووە، تا کۆتایی ئایەتەکە، هیلالی بانگ کرد چوار جار سوێندی خوارد کە بێگومان ئەو لە ڕاستگۆیانە (لەوەی گوتی: ژنەکەم بینیوە زینای کردووە)، لە پێنجەمین جاردا نەفرینی خوا لەسەر ئەو بێت ئەگەر درۆزن بێت، پاشان ئافرەتەکە بانگ کرا چوار جار سوێندی خوارد کە بێگومان مێردەکەی درۆ دەکات، جا لە چوارەم یان پێنجەمدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بیوەستێنن بەڕاستی سزا پێویست بوو بۆ سەر ئەوەی درۆی کرد»، وەستا تا گومانمان برد ئێستا دانی پێدا دەنێت، پاشان گوتی: قەومەکەم سەرشۆڕ ناکەم بەدرێژایی ڕۆژگار، بۆیە بەردەوام بوو لەسەر سوێندەکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «تەماشای بکەن، ئەگەر منداڵەکە دوای لەدایکبوون سپی و قژ خاو و برژانگی چاوی درێژ بوو، ئەوە هیی هیلالی کوڕی ئومەییەیە، ئەگەر چاوی ڕەش بوو لاقەکانیشی باریک بوو، ئەوە هیی شەریکی کوڕی سەحمائە»، ئینجا (ئافرەتەکە) منداڵەکەی هێنا چاوی ڕەش بوو لاقەکانیشی باریک بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەگەر قوڕئان پێش نەکەوتایە ئەوە دەمزانی چۆن مامەڵەی لەگەڵ دەکەم».

## اسْتِتَابَةُ الْمُتَلَاعِنَيْنِ بَعْدَ اللِّعَانِ

### داواکردنی تەوبە لە هەردوو نەفرینکەرەکە دوای نەفرینکردنەکەیان

٣٧٢. عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: رَجُلٌ قَذَفَ امْرَأَتَهُ، قَالَ: فَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَخَوَيْ بَنِي الْعَجْلَانِ، وَقَالَ: «اللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟»، قَالَ لَهُمَا ثَلَاثًا فَأَبَيَا، فَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا، فَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا قَالَ الرَّجُلُ: مَالِي؟ قَالَ: «لَا مَالَ لَكَ إِنْ كُنْتَ صَادِقًا فَقَدْ دَخَلْتَ بِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَهِيَ أَبْعَدُ مِنْكَ».

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: بە ئیبن عومەرم رضي الله عنهما گوت: پیاوێک ژنەکەی تۆمەتبار کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ژن و مێردەکەی بەنو عەجلانی لەیەکدی جیا کردەوە، فەرمووی: «خوا دەزانێت بێگومان یەکێکتان درۆ دەکەن، ئایا کەستان تەوبە دەکەن؟»، سێ جار ئەمەی پێ فەرموون، بەڵام ڕەتیان کردەوە (و کەسیان تەوبەیان نەکرد)، جا هەردووکیانی لەیەکدی جیا کردەوە، پیاوەکە گوتی:ماڵەکەم (کە بە مارەیی پێم داوە)؟ فەرمووی: «ماڵت ناکەوێت ئەگەر ڕاست بکەی، ئەوە بێگومان چوویتە لایەوە و لەزەتت لێ وەرگرتووە، ئەگەر درۆ بکەی ئەوە دوورترە لە تۆوە».



## بَابُ نَفْيِ الْوَلَدِ بِاللِّعَانِ وَإِلْحَاقِهِ بِأُمِّهِ

### باسی ڕەتکردنەوەی منداڵ بە نەفرین و گەڕاندنەوەی بۆ لای دایکی

٣٧٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: لَاعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ رَجُلٍ وَامْرَأَتِهِ، وَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا، وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالْأُمِّ.

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ مولاعەنەی لە نێوان پیاوێک و ژنەکەیدا کرد، لەیەکدیشی جیا کردنەوە، منداڵەکەشی دایەوە دایکی.

## بَابُ الْقُرْعَةِ فِي الْوَلَدِ إِذَا تَنَازَعُوا فِيهِ

### باسی تیروپشک بۆ منداڵێک ئەگەر ناکۆکییان لەسەری هەبوو

٣٧٤. عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: أُتِيَ عَلِيٌّ ﷺ بِثَلَاثَةٍ وَهُوَ بِالْيَمَنِ وَقَعُوا عَلَى امْرَأَةٍ فِي طُهْرٍ وَاحِدٍ، فَسَأَلَ اثْنَيْنِ: أَتُقِرَّانِ لِهَذَا بِالْوَلَدِ؟ قَالَا: لَا، ثُمَّ سَأَلَ اثْنَيْنِ: أَتُقِرَّانِ لِهَذَا بِالْوَلَدِ؟ قَالَا: لَا، فَأَقْرَعَ بَيْنَهُمْ فَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالَّذِي صَارَتْ عَلَيْهِ الْقُرْعَةُ، وَجَعَلَ عَلَيْهِ ثُلُثَيِ الدِّيَةِ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ.



زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێت: سێ کەسیان هێنا بۆ لای عەلی ﷺ کاتێک لە یەمەن بوو، چووبوونە لای ژنێکەوە لە یەک پاکبوونەوەدا، پرسیاری لە دووانیان کرد ئێوە ڕازین ئەم منداڵە بۆ ئەو پیاوە بێت؟ گوتیان: نەخێر، پاشان پرسیاری لە دووانەکە کرد ئێوە ڕازین ئەم منداڵە بۆ ئەو پیاوە بێت؟ گوتیان: نەخێر، تیروپشکی لە نێوانیاندا کرد، منداڵەکەی دایە ئەوەیان کە لە تیروپشکەکە دەرچوو، نرخی سێیەکی خوێنێکی لەسەری پێویست کرد، (چونکە هەرسێکیان بانگەشەی ئەوەیان کرد ئەو منداڵە هیی ئەوە)، ئەوە باس کرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێکەنی تا ددانەکانی دەرکەوت.

## إِسْلَامُ أَحَدِ الزَّوْجَيْنِ وَتَخْيِيرُ الْوَلَدِ

### موسوڵمانبوونی یەکێک لە ژن و مێرد و سەرپشککردنی منداڵ

٣٧٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: فِدَاكَ أَبِي

وَأُمِّي، إِنَّ زَوْجِي يُرِيدُ أَنْ يَذْهَبَ بِابْنِي وَقَدْ نَفَعَنِي وَسَقَانِي مِنْ بِئْرِ أَبِي عِنَبَةَ، فَجَاءَ زَوْجُهَا وَقَالَ: مَنْ يُخَاصِمُنِي فِي ابْنِي؟ فَقَالَ: «يَا غُلَامُ، هَذَا أَبُوكَ وَهَذِهِ أُمُّكَ فَخُذْ بِيَدِ أَيِّهِمَا شِئْتَ»، فَأَخَذَ بِيَدِ أُمِّهِ، فَانْطَلَقَتْ بِهِ.

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: دایک و باوکم بەقوربانت بن، مێردەکەم دەیەوێت کوڕەکەم ببات، سوودی پێ گەیاندووم و ئاوی پێ داوم لە بیری ئەبو عینەبە، مێردەکەی هات، گوتی: کێ ناکۆکیم لەگەڵ دەکات لەبارەی کوڕەکەمەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «ئەی منداڵ، ئەمە باوکتە ئەوەش دایکتە، هەر کامەیانت دەوێت دەستی بگرە»، دەستی دایکی گرت و لەگەڵیدا ڕۆیشت.



## عِدَّةُ الْمُخْتَلِعَةِ

## عیدەی ئەو ژنەی خولعی کردووە

٣٧٦. عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ بْنِ عَفْرَاءَ: أَنَّ ثَابِتَ بْنَ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ ضَرَبَ امْرَأَتَهُ فَكَسَرَ يَدَهَا، وَهِيَ جَمِيلَةُ بِنْتُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ، فَأَتَى أَخُوهَا يَشْتَكِيهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى ثَابِتٍ فَقَالَ لَهُ: «خُذِ الَّذِي لَهَا عَلَيْكَ وَخَلِّ سَبِيلَهَا»، قَالَ: نَعَمْ، فَأَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تَتَرَبَّصَ حَيْضَةً وَاحِدَةً، فَتَلْحَقَ بِأَهْلِهَا.

ڕوبەیعی کچی موعەویزی کوڕی عەفراء ﵂ دەڵێت: سابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس لە خێزانەکەی دا و دەستی شکاند، کە جەمیلەی کچی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بوو، براکەی هات سکاڵای کرد لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوای سابیت و پێی فەرموو: «ئەوەی لەسەرتە بیبە و وازی لێ بێنە»، گوتی: باشە، ئینجا فەرمانی پێ کرد: یەک حەیز چاوەڕوانی بکات

و بچێتەوە بۆ لای کەسوکارەکەی.

## بَابُ عِدَّةِ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا

## باسی عیدە و تازیەباریی ئەو ئافرەتەی کە مێردەی دەمرێت

٣٧٧. عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تَحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا».

ئوم حەبیبە ﵂ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «حەڵاڵ نییە بۆ هیچ ئافرەتێک بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت، تازیە بگێڕێت لەسەر مردوو لەدوای سێ ڕۆژەوە، مەگەر بۆ مێردەکەی کە چوار مانگ و دە ڕۆژە».



## عِدَّةُ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا

## عیدەی ئەو ئافرەتەی مێردەکەی مردووە پێش ئەوەی بچێتە لایەوە

٣٧٨. عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ ﵁ أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقًا وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا حَتَّى مَاتَ؟ قَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ ﵁: لَهَا مِثْلُ صَدَاقِ نِسَائِهَا لَا وَكْسَ وَلَا شَطَطَ، وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ وَلَهَا الْمِيرَاثُ، فَقَامَ مَعْقِلُ بْنُ سِنَانٍ الْأَشْجَعِيُّ، فَقَالَ: قَضَى فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ امْرَأَةٍ مِنَّا مِثْلَ مَا قَضَيْتَ، فَفَرِحَ ابْنُ مَسْعُودٍ.

ئیبن مەسعوود ﵁ پرسیاری لێ کرا لەبارەی پیاوێکەوە ژنێکی هێناوە نە مارەیی بۆ دیاری کردووە و نە چۆتە لایەوە تا مردووە؟ ئیبن مەسعوود وتی: مارەیی بۆ هەیە وەکوو ژنەکانی دیکەی، نە کەم و نە زۆر، عیدەی بۆ هەیە میراتیش دەبات، مەعقیلی کوڕی سینانی ئەشجەعی هەڵسا و گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا لە بارەی

بەڕووەعی کچی واشیقەوە کە ئافرەتێک بوو لە ئێمە هەر وەکوو ئەم بڕیارەی تۆ، ئیبن مەسعوود زۆر بەمە دڵخۆش بوو.

## بَابُ الْإِحْدَادِ

## باسی تازیەباری

٣٧٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تَحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ أَكْثَرَ مِنْ ثَلَاثٍ إِلَّا عَلَى زَوْجِهَا».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دروست نییە بۆ هیچ ژنێک بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت سێ ڕۆژ زیاتر تازیەبار بێت، مەگەر بۆ مێردەکەی».



## مَا تَجْتَنِبُ الْحَادَّةُ مِنَ الثِّيَابِ الْمُصَبَّغَةِ

## ئەوەی ژنی تازیەبار خۆی لێ بەدوور دەگرێت لە ڕەنگکردنی پۆشاك

٣٨٠. عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَحِدُّ امْرَأَةٌ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ إِلَّا عَلَى زَوْجٍ، فَإِنَّهَا تَحِدُّ عَلَيْهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا وَلَا تَلْبَسُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا، وَلَا ثَوْبَ عَصْبٍ، وَلَا تَكْتَحِلُ، وَلَا تَمْتَشِطُ، وَلَا تَمَسُّ طِيبًا إِلَّا عِنْدَ طُهْرِهَا، حِينَ تَطْهُرُ نُبَذًا مِنْ قُسْطٍ وَأَظْفَارٍ».

ئوم عەتییە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دروست نییە هیچ ژنێک لە سێ ڕۆژ زیاتر تازیە بۆ مردوو بگێڕێت مەگەر بۆ مێردەکەی، ئەویش چوار مانگ و دە ڕۆژە، وە نابێت پۆشاکی ڕەنگاوڕەنگ لەبەر بکات، پۆشاکی عەصەبیش (کە

پۆشاکێکی یەمەنی سپییە ڕەنگی ڕەش و سپی تێدایە)، نابێ چاوی ڕەش بکات و قژی شانە بکات، بۆنی خۆش لە خۆی نادات مەگەر دوای پاکبوونەوە، ئەویش کەمێک لە (قُسْط) یان (أَظْفَار) (کە دوو جۆر بۆنی خۆشی ئەو سەردەمە بوون)».

## بَابُ الرَّجْعَةِ

### باسی گەڕاندنەوە بۆ ژیانی هاوژینی

٣٨١. عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما إِذَا سُئِلَ عَنِ الرَّجُلِ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَيَقُولُ: أَمَّا إِنْ طَلَّقَهَا وَاحِدَةً أَوِ اثْنَتَيْنِ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا ثُمَّ يُمْسِكَهَا حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً أُخْرَى ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ يُطَلِّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، وَأَمَّا إِنْ طَلَّقَهَا ثَلَاثًا، فَقَدْ عَصَيْتَ اللَّهَ فِيمَا أَمَرَكَ بِهِ مِنْ طَلَاقِ امْرَأَتِكَ، وَبَانَتْ مِنْكَ امْرَأَتُكَ.



نافیع دەڵێت: ئیبن عومەر رضي الله عنهما ئەگەر پرسیاری لێ بکرایە لە بارەی پیاوێکەوە ژنەکەی تەڵاق بدایە لە کاتی حەیزدا، دەیگوت: ئەگەر یەک تەڵاقی دابێت یان دوو، ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە بیگەڕێنێتەوە، پاشان بیهێڵێتەوە تا حەیزێکی دیکە تەواو دەکات، پاشان پاک دەبێتەوە، پاشان تەڵاقی بدات پێش ئەوەی لەگەڵیدا جووت بێت، بەڵام ئەگەر سێ بە سێ تەڵاقی دا، بێگومان سەرپێچی خوات کردووە لەوەی فەرمانی پێ کردووی لە تەڵاقدانی ژنەکەتدا، ژنەکەت بەهەمیشەیی لێت جیا بۆتەوە.

# كِتَابُ الْخَيْلِ

## پەرتووکی ئەسپ

### بَابُ بَرَكَةِ الْخَيْلِ

باسی بەرەکەتی ئەسپ



٣٨٢. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْبَرَكَةُ فِي نَوَاصِي الْخَيْلِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەرەکەت لە نێوچاوانی ئەسپدایە».

### بَابُ فَتْلِ نَاصِيَةِ الْفَرَسِ

باسی بەستنەوەی نێوچاوانی ئەسپ

٣٨٣. عَنْ جَرِيرٍ ﵁ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْتِلُ نَاصِيَةَ فَرَسٍ بَيْنَ أُصْبُعَيْهِ، وَيَقُولُ: «الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الْأَجْرُ وَالْغَنِيمَةُ».

جەریر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی نێوچاوانی ئەسپی دەهۆنیەوە لە نێوان پەنجەکانی و دەیفەرموو: «لە نێوچاوانی ئەسپدا تا ڕۆژی دوایی خێر هەیە: پاداشت و دەستکەوتی جەنگی».

## عَلَفُ الْخَيْلِ

### ئالیک پێدانی ئەسپ

٣٨٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنِ احْتَبَسَ فَرَسًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِيمَانًا بِاللَّهِ وَتَصْدِيقًا لِوَعْدِ اللَّهِ كَانَ شِبَعُهُ وَرِيُّهُ وَبَوْلُهُ وَرَوْثُهُ حَسَنَاتٍ فِي مِيزَانِهِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس ئەسپێک لەپێناوی خوادا دابنێت وەک بڕوابوون بە خوا و بەڕاستدانانی بەڵێنەکانی، ئەوە تێرکردن و ئاودانی و میزکردنی و پیسییەکەی هەمووی دەبێتە خێر و چاکە بۆ سەر تەرازووەکەی».



## بَابُ السَّبَقِ

### باسی پێشبڕکێکردن

٣٨٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا سَبَقَ إِلَّا فِي نَصْلٍ، أَوْ حَافِرٍ، أَوْ خُفٍّ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دروست نییە وەرگرتنی ماڵ و سامان لە پێشبڕکێدا جگە لە پێشبڕکێکردنی یەکێک لەمانە: تیرهاوێشتن، یان پێشبڕکێی وشتر، یان پێشبڕکێی ئەسپ».

٣٨٦. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَاقَةٌ تُسَمَّى الْعَضْبَاءَ لَا تُسْبَقُ، فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ عَلَى قَعُودٍ فَسَبَقَهَا فَشَقَّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَلَمَّا رَأَى مَا فِي وُجُوهِهِمْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، سُبِقَتِ الْعَضْبَاءُ، قَالَ: «إِنَّ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ لَا يَرْتَفِعَ مِنَ الدُّنْيَا شَيْءٌ إِلَّا وَضَعَهُ».

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ وشترێکی هەبوو پێی دەگوترا (الْعَضْبَاءَ) (گوێبڕاو)، هیچ وشترێک پێشی نەدەکەوت، دەشتەکییەک هات بەسەر وشترێکی تازەپێگەیشتووەوە بوو، پێش وشترەکەی پێغەمبەر ﷺ کەوت، موسوڵمانان زۆریان پێناخۆش بوو، تەماشای ڕوخساری کردن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێشی وشتری (الْعَضْبَاءَ) درایەوە، فەرمووی: «بەڕاستی هەقە لەسەر خوا هەر شتێك خۆی بەرز بکاتەوە لە دونیادا، خوا دایبەزێنێت».



تێبینی:

(قَعُود): بریتییە لە هەر وشترێک تەمەنی دوو ساڵ تا پێنج ساڵ بێت.



# كِتَابُ الْأَحْبَاسِ

## پەرتووكی وەقفەكان

### بَابُ حَبْسِ الْمَشَاعِ

باسی وەقفكردنی (الْمَشَاعِ)
(پشكی خۆی لەو ماڵ و سامانانەی كە دابەش نەكراون)



٣٨٧. عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ عُمَرُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ الْمِائَةَ سَهْمٍ الَّتِي لِي بِخَيْبَرَ لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ أَعْجَبَ إِلَيَّ مِنْهَا، قَدْ أَرَدْتُ أَنْ أَتَصَدَّقَ بِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «احْبِسْ أَصْلَهَا، وَسَبِّلْ ثَمَرَتَهَا».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: عومەر بە پێغەمبەری ﷺ گوت: ئەو سەد پارچە زەوییەی كە پشكی منە لە خەیبەر هیچ ماڵێكم بەدەست نەهێناوە لەوە بەنرختر بێت بەلامەوە، دەمەوێت بیبەخشم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «زەوییەكە بكە بە وەقف و بەرهەمەكەی لەپێناو خوادا ببەخشە».



# كِتَابُ الْوَصَايَا

# پەرتووکی وەسییەتەکان

## الْكَرَاهِيَةُ فِي تَأْخِيرِ الْوَصِيَّةِ

### دواخستنی وەسییەت کەڕاهەتی هەیە



٣٨٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الصَّدَقَةِ أَعْظَمُ أَجْرًا؟ قَالَ: «أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ تَخْشَى الْفَقْرَ وَتَأْمُلُ الْبَقَاءَ، وَلَا تُمْهِلْ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ»، قُلْتَ: لِفُلَانٍ كَذَا وَقَدْ كَانَ لِفُلَانٍ.

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کام خێرکردن لای خوا پاداشتی مەزنی هەیە؟ فەرمووی: «کاتێك خێر بکەی لەشت ساغ بێت و لە هەژاری بترسیت و ئومێدی مانەوەت هەبێت، خاوەخاو نەکەیت تا گیانت دەگاتە قوڕقوڕاگەت»، وتم: ئەوەندە بۆ فڵان و ئەوەندە بۆ فڵان، فڵانیش ئەوەندەی هەبوو.

٣٨٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّكُمْ مَالُ وَارِثِهِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِهِ؟»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا مِنَّا مِنْ أَحَدٍ إِلَّا مَالُهُ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِ وَارِثِهِ، قَالَ

رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اعْلَمُوا أَنَّهُ لَيْسَ مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا مَالُ وَارِثِهِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِهِ، مَالُكَ مَا قَدَّمْتَ، وَمَالُ وَارِثِكَ مَا أَخَّرْتَ».

عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «کێ لە ئێوە ماڵی میراتگرەکەی خۆشەویستترە لای لە ماڵەکەی خۆی؟»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێک نییە لە ئێمە مەگەر ماڵەکەی خۆی خۆشەویستترە لای لە ماڵی میراتگرەکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بزانن کەسێک نییە لە ئێوە مەگەر ماڵی میراتگرەکەی خۆشەویستترە لای لە ماڵەکەی خۆی، ماڵی خۆت ئەوەیە پێشت خستووە، ماڵی میراتگرەکانت ئەوەیە بەجێی دێڵیت».

٣٩٠. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُوصَى فِيهِ أَنْ يَبِيتَ لَيْلَتَيْنِ، إِلَّا وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ».



ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «کەسێکی موسوڵمان شتێکی هەبێت پێویست بێت وەسییەتی پێ بکات، هەق نییە دوو شەو لەسەر یەک بمێنێتەوە، وەسییەتنامەکەی بە نووسراوی لای نەبێت».

## هَلْ أَوْصَى النَّبِيُّ ﷺ

### ئایا پێغەمبەر ﷺ وەسییەتی کردووە؟

٣٩١. عَنْ طَلْحَةَ ﵁ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ أَبِي أَوْفَى ﵁ أَوْصَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: لَا، قُلْتُ: كَيْفَ كَتَبَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ الْوَصِيَّةَ؟ قَالَ: أَوْصَى بِكِتَابِ اللَّهِ.

تەلحە ﵁ دەڵێت: پرسیارم لە ئیبن ئەبو ئەوفا ﵁ کرد، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ وەسییەتی کرد؟ گوتی: نەخێر، گوتم: چۆن نووسراوی وەسییەتی بۆ موسوڵمانان کرد؟

گوتی: وەسییەتی بۆ کردن بە (دەستگرتن بە) کتێبی خوا.

٣٩٢. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دِينَارًا وَلَا دِرْهَمًا وَلَا شَاةً وَلَا بَعِيرًا، وَلَا أَوْصَى بِشَيْءٍ.

عائیشە رَضِيَ اللهُ عَنْهَا دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی بەجێ نەهێشت، نە دینار و نە درهەم و نە مەڕ و نە وشتر، وەسییەتیشی نەکرد بە هیچ (شتێکی دونیایی).

## بَابُ الْوَصِيَّةِ بِالثُّلُثِ

### باسی وەسییەتکردن بە سێیەک

٣٩٣. عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: مَرِضْتُ مَرَضًا أَشْفَيْتُ مِنْهُ، فَأَتَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي مَالاً كَثِيرًا، وَلَيْسَ يَرِثُنِي إِلَّا ابْنَتِي، أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: «لَا»، قُلْتُ: فَالشَّطْرَ؟ قَالَ: «لَا»، قُلْتُ: فَالثُّلُثَ؟ قَالَ: «الثُّلُثَ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَتْرُكَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ لَهُمْ مِنْ أَنْ تَتْرُكَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ».

عامیری کوڕی سەعد لە باوکیەوە رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: نەخۆش کەوتم بە نەخۆشییەک چاک بوومەوە لێی، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ سەردانم، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا من ماڵ و دارایییەکی زۆرم هەیە، کەس نییە میراتم لێ بگرێت، جگە لە کچێکم، ئایا دەتوانم دوو لەسەر سێی ماڵەکەم بکەم بە خێر (لە سێ بەش دوو بەشی بکەم بە خێر)؟، فەرمووی: «نەخێر»، گوتم: ئەی نیوەی؟ فەرمووی: «نەخێر»، گوتم: ئەی سێیەک (بیکەم بە سێ بەشەوە و یەک بەشیان بکەم بە خێر)؟ فەرمووی: «سێیەک، (هەرچەندە) سێیەکیش زۆرە، تۆ ئەگەر منداڵەکانت بەدەوڵەمەندی بە جێ بهێڵیت چاکترە لەوەی بەهەژاری بەجێیان بهێڵیت دەست لە خەڵک پان بکەنەوە».

## بَابُ إِبْطَالِ الْوَصِيَّةِ لِلْوَارِثِ

### باسی هەڵوەشاندنەوەی وەسییەت بۆ میراتگر

٣٩٤. عَنْ عَمْرِو بْنِ خَارِجَةَ رضي الله عنه قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، وَلَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ».

عەمرِی کوڕی خاریجە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دا و فەرمووی: «خوا مافی هەموو خاوەن مافێکی داوە، وەسییەت نییە بۆ میراتگر».

## إِذَا مَاتَ الْفَجْأَةَ، هَلْ يُسْتَحَبُّ لِأَهْلِهِ أَنْ يَتَصَدَّقُوا عَنْهُ

### ئەگەر (کەسێك) لەناکاو مرد، دروستە خانەوادەکەی لەبری ئەو خێر بکەن



٣٩٥. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِرَسُولِ اللَّه ﷺ: إِنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسُهَا، وَإِنَّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ، أَفَأَتَصَدَّقُ عَنْهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَعَمْ، فَتَصَدَّقَ عَنْهَا».

عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە: پیاوێک بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوت: دایکم لەناکاو گیانی لەدەست دا، ئەو ئەگەر قسەی بکردایە خێری دەکرد، ئایا خێری بۆ بکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەڵێ، ئەویش لەجیاتی دایکی خێری کرد».

## فَضْلُ الصَّدَقَةِ عَنِ الْمَيِّتِ

### فەزڵ و گەورەیی بەخشین بۆ مردوو

٣٩٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلَّا

مِنْ ثَلَاثَةٍ: مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، وَعِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، وَوَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر مرۆڤ مرد کردەوەکانی دەپچڕێت، جگە لە سێ کردەوە: خێرێکی بەردەوام، زانستێك سوود بگەیەنێت، یان منداڵێکی چاک دوعای بۆ بکات».

## النَّهْيُ عَنِ الْوِلَايَةِ عَلَى مَالِ الْيَتِيمِ

### قەدەغەکردنی سەرپەرشتیاری لەسەر ماڵی هەتیو

٣٩٧. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أَبَا ذَرٍّ، إِنِّي أَرَاكَ ضَعِيفًا، وَإِنِّي أُحِبُّ لَكَ مَا أُحِبُّ لِنَفْسِي، لَا تَأَمَّرَنَّ عَلَى اثْنَيْنِ، وَلَا تَوَلَّيَنَّ عَلَى مَالِ يَتِيمٍ».



ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: «ئەی ئەبو زەڕ، من بە لاوازت دەبینم، ئەوەش کە بۆ خۆم پێمخۆشە بەهەمان شێوە بۆ تۆش پێمخۆشە، لێپرسراوێتی دوو کەس مەکە، سەرپەرشتیاریی ماڵی هەتیویش مەکە».

## اجْتِنَابُ أَكْلِ مَالِ الْيَتِيمِ

### دوورکەوتنەوە لە خواردنی ماڵی هەتیو

٣٩٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا هِيَ؟ قَالَ: «الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالشُّحُّ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «دوور بکەونەوە لە حەوت لەناوبەرەکە»، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چین؟ فەرمووی: «هاوبەشدانان بۆ خوا، ڕەزیلی، کوشتنی ئەو کەسەی خوا قەدەغەی کردووە مەگەر بە هەقی خۆی (کە کەسێکی کوشتبێت)، خواردنی ڕیبا، خواردنی ماڵی هەتیو، پشتکردن لە دوژمن لە جەنگدا، تۆمەتبارکردنی ئافرەتی داوێنپاکی ئیماندارى بێئاگا».



# كِتَابُ النُّحْلِ

## پەرتووکی بەخشین

### ذِكْرُ اخْتِلَافِ أَلْفَاظِ النَّاقِلِينَ لِخَبَرِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ فِي النُّحْلِ



### باسی جیاوازی بێژەی گێڕەرەوانی فەرموودەی نوعمانی کوڕی بەشیر دەربارەی بەخشین

٣٩٩. عَنِ النُّعْمَانِ ﵁: أَنَّ أَبَاهُ أَتَى بِهِ النَّبِيَّ ﷺ يُشْهِدُ عَلَى نُحْلٍ نَحَلَهُ إِيَّاهُ، فَقَالَ: «أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَ مِثْلَ مَا نَحَلْتَهُ؟»، قَالَ: لَا، قَالَ: «فَلَا أَشْهَدُ عَلَى شَيْءٍ، أَلَيْسَ يَسُرُّكَ أَنْ يَكُونُوا إِلَيْكَ فِي الْبِرِّ سَوَاءً؟»، قَالَ: بَلَى، قَالَ: «فَلَا إِذًا».

نوعمان ﵁ دەگێڕێتەوە: باوکی هێنای بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی بیکات بە شایەت لەسەر بەخشینێک پێی بەخشیبوو، فەرمووی: «ئایا هەمان شتت بەخشیوە بە منداڵەکانت؟»، گوتی: نەخێر، فەرمووی: «شایەتی نادەم لەسەر شتێکی وا، ئایا پێت خۆشە هەموویان وەکوو یەکدی چاک بن لەگەڵتدا؟»، گوتی: بەڵێ پێمخۆشە وا بن، فەرمووی: «کەواتە نابێت یەکێکیان هەڵبژێریت».

٤٠٠. عَنِ الْمُفَضَّلِ بْنِ الْمُهَلَّبِ قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ ﵁، يَخْطُبُ قَالَ: قَالَ

رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اعْدِلُوا بَيْنَ أَبْنَائِكُمْ، اعْدِلُوا بَيْنَ أَبْنَائِكُمْ».

موفەززەلی کوڕی موهەللەب دەڵێت: گوێم لە نوعمانی کوڕی بەشیر ﵁ بوو وتاری دەدا دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «دادپەروەر بن لە نێوان منداڵەکانتاندا، دادپەروەر بن لە نێوان منداڵەکانتاندا».

# كِتَابُ الْهِبَةِ

## پەرتووکی دیاری و خەڵات

### رُجوعُ الْوَالِدِ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ

### پەشیمانبوونەوەی دایباب لەوەی بە دیاری بە منداڵەکەی داوە



٤٠١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما وَابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما يَرْفَعَانِ الْحَدِيثَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِرَجُلٍ يُعْطِي عَطِيَّةً ثُمَّ يَرْجِعُ فِيهَا إِلَّا الْوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ، وَمَثَلُ الَّذِي يُعْطِي عَطِيَّةً ثُمَّ يَرْجِعُ فِيهَاكَمَثَلِ الْكَلْبِ أَكَلَ حَتَّى إِذَا شَبِعَ قَاءَ ثُمَّ عَادَ فِي قَيْئِهِ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما و ئیبن عەباس رضي الله عنهما فەرموودەکە بەرز دەکەنەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: «دروست نییە بۆ هیچ پیاوێک شتێک بکاتە دیاری و پاشان پەشیمان ببێتەوە جگە لە باوک کە دیاری دابێت بە کوڕەکەی، وێنەی ئەو کەسەی شتێک دەبەخشێت پاشان پەشیمان دەبێتەوە وەکوو سەگێک وایە دەخوات هەتا تێر دەبێت و دەڕشێتەوە، پاشان دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی (و دەیخواتەوە)».

٤٠٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَثَلُ الَّذِي يَتَصَدَّقُ بِالصَّدَقَةِ ثُمَّ يَرْجِعُ فِيهَا، كَمَثَلِ الْكَلْبِ قَاءَ ثُمَّ عَادَ فِي قَيْئِهِ فَأَكَلَهُ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «وێنەی ئەو کەسەی شتێك دەبەخشێت، پاشان پەشیمان دەبێتەوە، وەکوو سەگێک وایە بڕشێتەوە، پاشان بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی و بیخوات».



# كِتَابُ الرُّقْبَى

## پەرتووکی ڕوقبا

٤٠٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: لَا رُقْبَى، فَمَنْ أُرْقِبَ شَيْئًا فَهُوَ سَبِيلُ الْمِيرَاثِ.



ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێویست ناکات (ماڵ و سامانیان) بکەن بە ڕوقبا، هەر کەس شتێکی کرد بە ڕوقبا، ئەگەر مرد ئەوە دەبێتە هیی ئەو کەسەی پێی بەخشراوە.

تێبینی:

(الرُّقْبَى): بریتییە لەوەی کەسێک بە کەسێک بڵێت: ئەم خانووەم پێشکەشە بە تۆ، ئەگەر من لەپێش تۆدا مردم هەر بۆ خۆتە، ئەگەر تۆش لەپێشدا مردی دەگەڕێتەوە بۆ خۆم، لە چاوەڕوانی وەرگیراوە، وەکوو ئەوەی بڵێیت هەردووکیان چاوەڕوانی مردنی یەکدی دەکەن).

# كِتَابُ الْعُمْرَى

## پەرتووکی عومڕا

(سێ جۆرە: یەکەم: کەسێک بە کەسێک بڵێت: ئەم خانووەم پێشکەش کرد بە تۆ ئەگەر مردی ئەوە بۆ میراتگرەکانت، ئەمەش بەخشینە بەبێ جیاوازی، دووەم: دەڵێت: ئەم خانووەم پێشکەشت کرد بەهەمیشەیی، سێیەم: دەڵێت: ئەم خانووەم پێشکەشت کرد ئەگەر تۆ مردی بۆ من).



٤٠٤. عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْعُمْرَى هِيَ لِلْوَارِثِ».

زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «عومڕا بۆ میراتگرە».

٤٠٥. عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تُرْقِبُوا وَلَا تُعْمِرُوا، فَمَنْ أُرْقِبَ أَوْ أُعْمِرَ شَيْئًا فَهُوَ لِوَرَثَتِهِ».

جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نە ڕوقبا بکەن نە عومڕا، هەر کەس شتێک ببەخشێت بە ڕوقبا، یان عومڕا ئەوە بۆ میراتگری ئەو کەسەیە کە پێی بەخشراوە».

٤٠٦. عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، أَمْسِكُوا عَلَيْكُمْ -يَعْنِي أَمْوَالَكُمْ- لَا تُعْمِرُوهَا، فَإِنَّهُ مَنْ أَعْمَرَ شَيْئًا فَإِنَّهُ لِمَنْ أُعْمِرَهُ حَيَاتَهُ وَمَمَاتَهُ».

جابیر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەی کۆمەڵی ئەنصارِ! دەستبگرن -واتە: بە ماڵەکانتانەوە- بە عومڕا مەیبەخشن، چونکە هەرکەس شتێك بە عومڕا ببەخشێت ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە پێی بەخشیوە لە ژیان و مردنیدا».



# كِتَابُ الْأَيْمَانِ وَالنُّذُورِ

# پەرتووکی سوێندخواردن و نەزرکردن

## الْحَلِفُ بِمُصَرِّفِ الْقُلُوبِ

## سوێندخواردن بەو زاتەی دڵەکان دەگۆڕێت



٤٠٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَتْ يَمِينُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: الَّتِي يَحْلِفُ بِهَا: «لا وَمُصَرِّفِ الْقُلُوبِ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: ئەو سوێند خواردنەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی پێ دەخوارد (بەم شێوەیە بوو): «نەخێر سوێند بەو زاتەی دڵەکان ئەمدیو ئەودیو دەکات».

## الْحَلِفُ بِالْبَرَاءَةِ مِنَ الْإِسْلَامِ

## سوێندخواردن بە بەریبوون لە ئیسلام

٤٠٨. عَنْ بُرَيْدَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَالَ: إِنِّي بَرِيءٌ مِنَ الْإِسْلَامِ، فَإِنْ

كَانَ كَاذِبًا فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَإِنْ كَانَ صَادِقًا لَمْ يَعُدْ إِلَى الْإِسْلَامِ سَالِمًا».

بوڕەیدە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس بڵێت: من بەریم لە ئیسلام، ئەگەر بە درۆ بڵێت ئەوە پێی بێبڕوا دەبێت وەک چۆن گوتوویەتی، ئەگەر بە ڕاستیش بڵێت ئەوە بە سەلامەتی ناگەڕێتەوە بۆ نێو ئیسلام».

## مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا

## هەر کەس سوێند لەسەر شتێک بخوات دواتر ببینێت غەیری ئەوە بۆی چاکترە

٤٠٩. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا عَلَى الْأَرْضِ يَمِينٌ أَحْلِفُ عَلَيْهَا فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا إِلَّا أَتَيْتُهُ».



ئەبو مووسا ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر شتێک لەسەر زەویدا سوێندی لەسەر بخۆم، بەڵام غەیری ئەوە بە چاکتر بزانم حەتمەن ئەوە هەڵدەبژێرم کە خێری تێدایە».

## الْكَفَّارَةُ بَعْدَ الْحِنْثِ

## کەفارەتدان لەدوای شکاندنی سوێندە

٤١٠. عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَلْيَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ».

عەدی کوڕی حاتیم ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس سوێندی خوارد لەسەر شتێك، دواتر ببینێت غەیری ئەوە لەو کارە چاکترە کە سوێندی لەسەر

خواردووە، ئەوە با ئەو کارە بکات کە لەوە چاکترە و کەفارەتی سوێندەکەشی بدات».

## مَنْ حَلَفَ فَاسْتَثْنَى

### هەر کەس سوێند بخوا و شتێک لە سوێندەکەی جیا بکاتەوە

٤١١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَلَفَ فَاسْتَثْنَى فَإِنْ شَاءَ مَضَى، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ غَيْرَ حَنِثٍ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس سوێند بخوات و جیای بکاتەوە (بڵێ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ)، ئەگەر ویستی سوێندەکەی جێبەجێی دەکات، ئەگەر ویستی وازی لێ دێنێت سوێندەکەشی نەکەوتووە».



## فِي اللَّغْوِ وَالْكَذِبِ

### لەبارەی سوێندخواردن و درۆکردن بۆ کەسێک بە دڵ سوێند نەخوات

٤١٢. عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ رضي الله عنه قَالَ: أَتَانَا النَّبِيُّ ﷺ، وَنَحْنُ فِي السُّوقِ، فَقَالَ: «إِنَّ هَذِهِ السُّوقَ يُخَالِطُهَا اللَّغْوُ وَالْكَذِبُ، فَشُوبُوهَا بِالصَّدَقَةِ».

قەیسی کوڕی ئەبو غەرەزە رضي الله عنه دەڵێت: ئێمە لە بەقیع شتمان دەفرۆشت پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان، ئێمە پێمان دەگوترا (السَّمَاسِرَةَ) (دەلاڵ یاخود ڕێکخەر)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «ئەی کۆمەڵی بازرگانان، بە شتێك ناوی ناین لەوە چاکتر بوو»، پاشان فەرمووی: «بەڕاستی ئەم کڕین و فرۆشتنە سوێند و درۆی تێدەکەوێت، تێکەڵی بکەن بە بەخشین، (بێگومان سوێندی درۆ بەرەکەتی ماڵ و سامان ناهێڵێت، بەخشینیش خەشم و تووڕەیی خوا دادەمرکێنێت، چاکەکانیش

گوناهەكان لادەبەن))».

## النَّهْيُ عَنِ النَّذْرِ

### قەدەغەكردن لە نەزر

٤١٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﭭ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ النَّذْرِ وَقَالَ: «إِنَّهُ لَا يَرُدُّ شَيْئًا، إِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الشَّحِيحِ».

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﭭ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردووە لە نەزركردن، فەرموویەتی: «هیچ شتێک ڕەت ناكاتەوە، (لە قەزا و قەدەر) تەنها لە كەسی ڕەزیلەوە دەردەچێت».



## النَّذْرُ فِي الطَّاعَةِ

### نەزركردن لە گوێڕایەڵی جێبەجێ دەكرێت

٤١٤. عَنْ عَائِشَةَ ﭬ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ اللَّهَ فَلَا يَعْصِهِ».

عائیشە ﭬ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەوەی نەزری كرد لەسەر خۆی كە گوێڕایەڵیی خوا بكات (یان كارێكی خێر ئەنجام بدات) با گوێڕایەڵی بكات، ئەوەیشی نەزری كرد لەسەر خۆی كە سەرپێچیی خوا بكات با سەرپێچیی نەكات».

## إِذَا نَذَرَ ثُمَّ أَسْلَمَ قَبْلَ أَنْ يَفِيَ

### ئەگەر (کافرێک) نەزری کرد، پاشان موسوڵمان بوو پێش ئەوەی نەزرەکە ئەنجام بدات

٤١٥. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ عَلَى عُمَرَ نَذْرٌ فِي اعْتِكَافِ لَيْلَةٍ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَعْتَكِفَ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: عومەر شەوێک نەزری لەسەر بوو لە مزگەوتی حەڕام ئیعتیکاف بکات، پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەیەوە، فەرمانی پێ کرد ئیعتیکاف بکات.

## الِاسْتِثْنَاءُ

### جیاکردنەوە لە سوێندخواردن بە گوتنی: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ)



٤١٦. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَقَالَ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ فَهُوَ بِالْخِيَارِ، إِنْ شَاءَ أَمْضَى، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس سوێند بخوات لەسەر شتێك، بڵێت: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ)، ئەوە بە ویستی خۆیەتی ئەگەر ویستی بەجێی دێنێت، ئەگەریش ویستی وازی لێ دێنێت».

# كَفَّارَةُ النَّذْرِ

## کەفارەتی نەزر

٤١٧. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: « كَفَّارَةُ النَّذْرِ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ».

عوقبەی کوڕی عامیر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کەفارەتی نەزر کەفارەتی سوێندخواردنە».



# كِتَابُ الْمُزَارَعَةِ

## پەرتووکی کشتوکاڵ

٤١٨. عَنْ جَابِرٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، فَإِنْ عَجَزَ أَنْ يَزْرَعَهَا فَلْيَمْنَحْهَا أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، وَلَا يُزْرِعْهَا إِيَّاهُ».



جابیر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەرکەس زەوی هەیە با بیکات بە کشتوکاڵ، ئەگەر نەیتوانی بیکات بە کشتوکاڵ ئەوە با بیبەخشێت بە برا موسوڵمانەکەی، بەڵام با پێی نەدات بۆی بکات بە کشتوکاڵ».

### ذِكْرُ اخْتِلَافِ الْأَلْفَاظِ الْمَأْثُورَةِ فِي الْمُزَارَعَةِ

### باسی جیاوازی ئەو دەستەواژانەی هاتوون لەبارەی کشتوکاڵەوە

٤١٩. عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَفَعَ إِلَى يَهُودِ خَيْبَرَ نَخْلَ خَيْبَرَ، وَأَرْضَهَا عَلَى أَنْ يَعْمَلُوهَا بِأَمْوَالِهِمْ، وَأَنَّ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَطْرَ ثَمَرَتِهَا.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ باخی خورمای خەیبەری دا بە جوولەکەی خەیبەر، زەوییەکەش تا کاری تێدا بکەن بە ماڵ و سامانەکانیان، نیوەی

# كِتَابُ عِشْرَةِ النِّسَاءِ

## پەرتووکی تێکەڵاوی و هاوەڵیەتیی ئافرەتان

### بَابُ حُبِّ النِّسَاءِ

### باسی خۆشەویستی بۆ ئافرەتان



٤٢٠. عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «حُبِّبَ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا النِّسَاءُ وَالطِّيبُ، وَجُعِلَ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ».

ئەنەس رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لەم دونیایەدا ئافرەت و بۆنی خۆش لەلام خۆشەویست کراوە، ڕۆشنایی چاوەکانم لە نوێژدایە».

### مَيْلُ الرَّجُلِ إِلَى بَعْضِ نِسَائِهِ دُونَ بَعْضٍ

### جیاوازیکردن لە گرینگیدان بە هەندێك لە ژنەکان

٤٢١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَ لَهُ امْرَأَتَانِ يَمِيلُ لِإِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَحَدُ شِقَّيْهِ مَائِلٌ».

ئەبو هورەیرە ﷛ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس دوو ژنی هەبێت لە ڕەفتاریدا گرینگی بدات بە یەکێکیان بەسەر ئەوی دیکەدا، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا دێت یەکێک لە شانەکانی نزمە (بەلار و خواری دەڕوات)».

## بَابُ الْغَيْرَةِ

### باسی غیرەبردن

٤٢٢. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: افْتَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَظَنَنْتُ أَنَّهُ ذَهَبَ إِلَى بَعْضِ نِسَائِهِ، فَتَجَسَّسْتُ، ثُمَّ رَجَعْتُ، فَإِذَا هُوَ رَاكِعٌ أَوْ سَاجِدٌ، يَقُولُ: «سُبْحَانَكَ وَبِحَمْدِكَ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ»، فَقُلْتُ: بِأَبِي وَأُمِّي إِنَّكَ لَفِي شَأْنٍ، وَإِنِّي لَفِي آخَرَ.



عائیشە ﵂ دەڵێت: شەوێک پێغەمبەری خوا ﷺ لێم بزر بوو، گومانم برد چووبێت بۆ لای یەکێک لە خێزانەکانی، منیش چاودێریم کرد، کاتێك بینیم لە ڕکووع یان لە سوجدەدا بوو، دەیفەرموو: «پاک و بێگەردی و ستاییش بۆ تۆ، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە تۆ»، گوتم: دایک و باوکم بە قوربانت بن تۆ بە شتێکەوە سەرقاڵی و منیش بە شتێکی تر.

# كِتَابُ تَحْرِيمِ الدَّمِ

## پەرتووکی قەدەغەکردنی خوێنڕشتن

٤٢٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ الْمُشْرِكِينَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فَإِذَا شَهِدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَصَلَّوْا صَلَاتَنَا، وَاسْتَقْبَلُوا قِبْلَتَنَا، وَأَكَلُوا ذَبَائِحَنَا، فَقَدْ حَرُمَتْ عَلَيْنَا دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ، إِلَّا بِحَقِّهَا».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «فەرمانم پێ کراوە لەگەڵ هاوبەشدانەران بجەنگم تا شایەتی دەدەن بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، موحەممەدیش بەندە و پێغەمبەری خوایە، جا ئەگەر شایەتییان دا بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، موحەممەدیش بەندە و پێغەمبەری خوایە، وەکوو ئێمە نوێژیان کرد و ڕوویان کردە ڕووگەمان و سەربڕاویان خواردین، ئەوە خوێن و ماڵیان لەسەر من قەدەغە بووە مەگەر بە هەقی ئیسلام (ئەوە لە کاتێکدا بوو کە هاوبەشدانەران بڕیاری جەنگیان دابوو)».

٤٢٤. عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ ﵁ يَخْطُبُ -وَكَانَ قَلِيلَ الْحَدِيثِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ- قَالَ: سَمِعْتُهُ يَخْطُبُ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلُّ ذَنْبٍ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَغْفِرَهُ، إِلَّا الرَّجُلُ يَقْتُلُ الْمُؤْمِنَ مُتَعَمِّدًا، أَوِ الرَّجُلُ يَمُوتُ كَافِرًا».

ئەبو ئیدریس دەڵێت: گوێم لە موعاویە ﵁ بوو وتاری دەدا -جا زۆر کەم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموودەی باس دەکرد- گوتی: گوێم لێ بوو دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەموو گوناهێک ئومێدی لێخۆشبوونی لێ دەکرێت مەگەر ئەو پیاوەی ئیماندارێک بەئەنقەست بکوژێت، یان پیاوێک بەبێبڕوای بمرێت».

٤٢٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْمًا إِلَّا كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الْأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دَمِهَا، وَذَلِكَ أَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ».

عەبدوڵڵا ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر نەفسێک بەناهەق بکوژرێت ئیللا یەکەم کەس لە نەوەی ئادەم بەشێکی هەیە لە کوشتنەکەیدا، چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کوشتنی داهێنا».



## تَعْظِيمُ الدَّمِ

## گەورەیی تاوانی خوێنڕشتن (مرۆڤ کوشتن)

٤٢٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَقَتْلُ مُؤْمِنٍ أَعْظَمُ عِنْدَ اللهِ مِنْ زَوَالِ الدُّنْيَا».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاص ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە، کوشتنی بڕوادارێک گەورەترە لای خوا لە نەمانی هەموو دونیا».

٤٢٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَوَّلُ مَا يُحْكَمُ بَيْنَ النَّاسِ فِي الدِّمَاءِ».

عەبدوڵڵا ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «یەکەم شتێک دادوەری

لەسەر دەکرێت لەنێو خەڵکیدا لە بارەی خوێنڕشتنەکانەوەیە».

## ذِكْرُ الْكَبَائِرِ

## باسی گوناهە گەورەکان

٤٢٨. عَنْ أَبَا أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيَّ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ جَاءَ يَعْبُدُ اللَّهَ، وَلَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَيُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَيُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَيَجْتَنِبُ الْكَبَائِرَ كَانَ لَهُ الْجَنَّةُ»، فَسَأَلُوهُ عَنِ الْكَبَائِرِ، فَقَالَ: «الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الْمُسْلِمَةِ، وَالْفِرَارُ يَوْمَ الزَّحْفِ».

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەرکەس خوا بپەرستێت و هیچ هاوبەشی بۆ دانەنێت و نوێژ بکات و زەکات بدات و دوور بکەوێتەوە لە تاوانە گەورەکان، ئەوە بەهەشتی بۆ هەیە»، پرسیاریان لێ کرد لەبارەی تاوانە گەورەکانەوە، فەرمووی: «هاوبەشدانان بۆ خوا، کوشتنی موسوڵمان و پشتهەڵکردن لە ڕۆژی جەنگدا».

٤٢٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: «أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا، وَهُوَ خَلَقَكَ»، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مِنْ أَجْلِ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ»، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ أَنْ تُزَانِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ».

عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ گوناهێك گەورەترینە؟ فەرمووی: «هاوبەشێک بۆ خوا دابنێیت، لە کاتێکدا ئەو دروستی کردوویت»، گوتم: پاشان چی؟ فەرمووی: «منداڵەکەت بکوژیت لە ترسی ئەوەی نانت لەگەڵ بخوات»، گوتم: پاشان چی؟ فەرمووی: «زینا لەگەڵ دراوسێکەتدا بکەیت».

## ذِكْرُ مَا يَحِلُّ بِهِ دَمُ الْمُسْلِمِ

### باسی ئەو حاڵەتانەی خوێنی موسوڵمانی پێ حەڵاڵ دەبێت

٤٣٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ، لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَّا ثَلَاثَةُ نَفَرٍ: التَّارِكُ لِلْإِسْلَامِ، مُفَارِقُ الْجَمَاعَةِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ».

عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سوێند بەو خوایەی هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لەو، دروست نییە خوێنی موسوڵمانێک شایەتی بدات بە (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ) هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، منیش پێغەمبەری خوام، مەگەر سێ کەس: کەسێک واز لە ئیسلام بهێنێت، لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیا بێتەوە، بێوەژنێکی زیناکەریش، کەسێکیش کەسێکی دیکە بکوژێت».

تێبینی:

مامەڵە لەگەڵ هاوشێوەی ئەم فەرموودەدا زۆر هەستیارە، تەنها خوێندنەوە بەس نییە، بەڵکوو پێویستە بۆ هەر بابەتێک لە بابەتەکان پرسیاری خەڵکی پسپۆڕ بکرێت لەم بوارەدا.

## النَّهْيُ عَنِ الْمُثْلَةِ

### قەدەغەکردنی شێواندنی لاشەی مردوو

٤٣١. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَحُثُّ فِي خُطْبَتِهِ عَلَى الصَّدَقَةِ، وَيَنْهَى عَنِ الْمُثْلَةِ.

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتارەکەیدا هاوەڵانی هان دەدا لە سەر خێر و بەخشین، قەدەغەی دەکردن لە شێواندنی لاشەی مردوو.

## تَوْبَةُ الْمُرْتَدِّ

### پەشیمانبوونەوەی کەسی هەڵگەڕاوە لە ئایین

٤٣٢. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ أَسْلَمَ ثُمَّ ارْتَدَّ وَلَحِقَ بِالشِّرْكِ، ثُمَّ تَنَدَّمَ فَأَرْسَلَ إِلَى قَوْمِهِ، سَلُوا لِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: هَلْ لِي مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَجَاءَ قَوْمُهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا: إِنَّ فُلَانًا قَدْ نَدِمَ وَإِنَّهُ أَمَرَنَا أَنْ نَسْأَلَكَ: هَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَنَزَلَتْ: {كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ} آل عمران: ٨٦، إِلَى قَوْلِهِ: {غَفُورٌ رَحِيمٌ} البقرة: ١٧٣، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَأَسْلَمَ.

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پیاوێک لە ئەنصارەکان موسوڵمان بوو، پاشان هەڵگەڕایەوە و پەیوەندیی کرد بە هاوبەشدانانەوە، پاشان پەشیمان بوویەوە نامەی نارد بۆ لای قەومەکەی خۆی، پرسیارم بۆ بکەن لە پێغەمبەری خوا ﷺ: بزانن ئایا من تەوبەم بۆ هەیە؟ قەومەکەیشی هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتیان: فڵانە کەس پەشیمان بۆتەوە پێی ڕاگەیاندووین پرسیارت لێ بکەین: ئایا تەوبەی بۆ هەیە؟ پاشان ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: {كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ}، واتە: چۆن خوا ﷻ ڕێنمایی گەلێک دەکات بێبڕوا بوون دوای بڕواهێنانیان)، هەتا فەرمایشتی: {غَفُورٌ رَحِيمٌ}، واتە: لێخۆشبوو میهرەبانە. پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوایدا، ئەویش موسوڵمان بوو (دووبارە بڕوای هێنا).

## سَحَرَةُ أَهْلِ الْكِتَابِ

### جادووی خاوەن کتێبەکانی پێشوو

٤٣٣. عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: سَحَرَ النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ، فَاشْتَكَى لِذَلِكَ أَيَّامًا، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ فَقَالَ: إِنَّ رَجُلًا مِنَ الْيَهُودِ سَحَرَكَ، عَقَدَ لَكَ عُقَدًا فِي بِئْرِ كَذَا وَكَذَا، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَاسْتَخْرَجُوهَا، فَجِيءَ بِهَا، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ، فَمَا ذَكَرَ ذَلِكَ لِذَلِكَ الْيَهُودِيِّ، وَلَا رَآهُ فِي وَجْهِهِ قَطُّ.

زەیدی کوڕی ئەڕقەم ﷺ دەڵێت: پیاوێکی جوولەکە جادووی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، بەو هۆیەوە چەند ڕۆژێک نەخۆش کەوت، جبیریل هات سەلامی خوای لێ بێت بۆ لای پێی وت: پیاوێک لە جوولەکە جادووی لێ کردوویت، گرێیەکی بۆت گرێ داوە لە فڵان بیر و فڵانە شوێندا دایناوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك لە هاوەڵەکانی نارد دەریانهێنا، پاشان بۆی هێنرا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستایەوە و هەرچی ئەو نەخۆشییە هەیە لەسەری نەما، ئەوەی باس نەکرد بۆ ئەو جوولەکەیە و ڕوخساریشی نەبینی.

## مَا يَفْعَلُ مَنْ تَعَرَّضَ لِمَالِهِ

### ئەو کەسەی دەستدرێژی دەکرێتە سەر ماڵ و سامانەکەی چی بکات؟

٤٣٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ عُدِيَ عَلَى مَالِي، قَالَ: «فَانْشُدْ بِاللَّهِ»، قَالَ: فَإِنْ أَبَوْا عَلَيَّ؟ قَالَ: «فَانْشُدْ بِاللَّهِ»، قَالَ: فَإِنْ أَبَوْا عَلَيَّ؟ قَالَ: «فَانْشُدْ بِاللَّهِ»، قَالَ: فَإِنْ أَبَوْا عَلَيَّ؟ قَالَ: «فَقَاتِلْ، فَإِنْ قُتِلْتَ فَفِي الْجَنَّةِ، وَإِنْ قَتَلْتَ فَفِي النَّارِ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەگەر دەستدرێژی کرایە سەر ماڵم چی بکەم؟ فەرمووی: «داوای لێ بکە لەبەر خوا واز بهێنێت»، گوتی: ئەگەر وازی نەهێنا؟ فەرمووی: «داوای لێ بکە لەبەر خوا واز بهێنێت»، گوتی: ئەگەر وازی نەهێنا؟ فەرمووی: «داوای لێ بکە لەبەر خوا واز بهێنێت»، گوتی: ئەگەر وازی نەهێنا؟ فەرمووی: «بجەنگە، ئەگەر کوژرای تۆ لە بەهەشتی، ئەگەر ئەویشت کوشت ئەوە ئەو لە ئاگردایە».

## مَنْ قَاتَلَ دُونَ دِينِهِ

### ئەوەی بجەنگێت لەپێناو ئایینەکەیدا

٤٣٥. عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ».



سەعیدی کوڕی زەید ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس لەپێناو ماڵ و سامانیدا کوژرا ئەوە شەهیدە، هەر کەسیش جەنگا لەپێناو ماڵ و منداڵیدا ئەوە شەهیدە، هەر کەسیش جەنگا لەپێناو ئایینەکەیدا ئەوە شەهیدە، هەرکەسیش جەنگا لەپێناو خوێنیدا ئەوە شەهیدە».

## قِتَالُ الْمُسْلِمِ

### جەنگان لەگەڵ موسوڵمان

٤٣٦. عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قِتَالُ الْمُسْلِمِ كُفْرٌ،

وَسِبَابُهُ فُسُوقٌ».

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص ﷛ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جەنگ لەگەڵ موسوڵمان کوفرە (لە کردەوەی بێبڕوایەکانە)، جنێوپێدانیشی لادانە و دەرچوونە (لە سنووری شەرع)».

## تَحْرِيمُ الْقَتْلِ

### قەدەغەکردنی کوشتن

٤٣٧. عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷛ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَشَارَ الْمُسْلِمُ عَلَى أَخِيهِ الْمُسْلِمِ بِالسِّلَاحِ فَهُمَا عَلَى جُرُفِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا قَتَلَهُ خَرَّا جَمِيعًا فِيهَا».



ئەبو بەکرە ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر دوو موسوڵمان چەک بەرانبەر یەکدی هەڵبگرن، ئەوە هەردووکیان لە قەراغی دۆزەخن، جا ئەگەر کوشتی هەردووکیان دەخلیسکێنە نێویەوە».



# كِتَابُ قَسْمِ الْفَيْءِ

## پەرتووکی دابەشکردنی دەستکەوت

٤٣٨. عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَهْمَ ذِي الْقُرْبَى بَيْنَ بَنِي هَاشِمٍ، وَبَنِي الْمُطَّلِبِ أَتَيْتُهُ أَنَا وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَؤُلَاءِ بَنُو هَاشِمٍ لَا نُنْكِرُ فَضْلَهُمْ لِمَكَانِكَ الَّذِي جَعَلَكَ اللَّهُ بِهِ مِنْهُمْ، أَرَأَيْتَ بَنِي الْمُطَّلِبِ أَعْطَيْتَهُمْ، وَمَنَعْتَنَا، فَإِنَّمَا نَحْنُ وَهُمْ مِنْكَ بِمَنْزِلَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّهُمْ لَمْ يُفَارِقُونِي فِي جَاهِلِيَّةٍ وَلَا إِسْلَامٍ، إِنَّمَا بَنُو هَاشِمٍ، وَبَنُو الْمُطَّلِبِ شَيْءٌ وَاحِدٌ»، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ.

جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی خزمە نزیکەکانی دابەش کرد لە نێوان نەوەکانی هاشیم و نەوەکانی موتەلیبدا، من و عوسمانی کوڕی عەففان هاتین بۆ خزمەتی، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوانە نەوەکانی هاشیمن نکووڵی پێگە و پایەیان ناکەین کە خوا بۆی دیاری کردوون، بەڵام بە نەوەکانی عەبدولموتەلیبیت بەخشی و ئێمەت بێبەش کرد، ئێمە و ئەوان لای تۆ یەک پلەوپایەمان هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەوان نە لە ئیسلام و نە لە نەفامی لێم جیا نەبوونەتەوە، بەڵکوو نەوەکانی هاشیم و نەوەکانی موتەلیب یەک شتن»، دەستەکانی خستە نێو یەکدی.

تێبینی:

(الْفَيْء): بریتییە لەو ماڵ و سامانانەی بێبڕوایان، کە دەستی موسوڵمانان دەکەوێت بەبێ جەنگکردن.

٤٣٩. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁ قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ وَبَرَةً مِنْ جَنْبِ بَعِيرٍ، فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ لَا يَحِلُّ لِي مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ قَدْرُ هَذِهِ إِلَّا الْخُمُسُ، وَالْخُمُسُ مَرْدُودٌ عَلَيْكُمْ».

عوبادەی کوڕی صامیت ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی حونەیندا تاڵێك مووی کردەوە لە تەنیشتی وشترێک، فەرمووی: «ئەی خەڵکینە، بەڕاستی دروست نییە بۆ من لەوەی خوا دەستی خستووم بەبێ جەنگ بەئەندازەی پێنجیەک نەبێت، پێنجیەکیش دەگەڕێتەوە بۆ خۆتان».

# كِتَابُ الْبَيْعَةِ

## پەرتووکی بەڵێندان

### الْبَيْعَةُ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ

### بەڵێندان لە سەر گوێڕایەڵی و ملکەچی



٤٤٠. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁ قَالَ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي الْيُسْرِ وَالْعُسْرِ، وَالْمَنْشَطِ وَالْمَكْرَهِ، وَأَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ، وَأَنْ نَقُومَ بِالْحَقِّ حَيْثُ كُنَّا لَا نَخَافُ لَوْمَةَ لَائِمٍ.

عوبادەی کوڕی صامیت ﵁ دەڵێت: بەڵێنمان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر گوێڕایەڵی و ملکەچی لە خۆشی و دەوڵەمەندی و تەنگانە و هەژاریدا و لە خۆشی و ناخۆشیدا، ناکۆکی دروست نەکەین لەگەڵ ئەو کەسەی شیاوە بە دەسەڵات و بەڕێوەبردن، هەروەها وتەی هەق بڵێین، یان پێی هەڵسین لە هەر شوێنێک بووین، لە لۆمەی لۆمەکار نەترسین.

## الْبَيْعَةُ عَلَى النُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ

### بەڵێندان لەسەر دڵسۆزبوون بۆ گشت موسوڵمانێک

٤٤١. عَنْ جَرِيرٍ ﵁ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى النُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ.

جەریر ﵁ دەڵێت: بەڵێنم دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر دڵسۆزبوون بۆ هەموو موسوڵمانێک.

## الْبَيْعَةُ عَلَى الْمَوْتِ

### بەڵێندان لەسەر مردن



٤٤٢. عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ قَالَ: قُلْتُ لِسَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﵁ عَلَى أَيِّ شَيْءٍ بَايَعْتُمُ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ؟ قَالَ: عَلَى الْمَوْتِ.

یەزیدی کوڕی عوبەید دەڵێت: بە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعم ﵁ گوت، لەسەر چی بەڵێنتان دا بە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی حودەیبیە؟ گوتی: لەسەر مردن (چونکە کۆمەڵێک بەڵێنیان دا لەسەر مردن، کۆمەڵێکیش لەسەر شتی دیکە بەڵێنیان دا).

## الْبَيْعَةُ عَلَى الْهِجْرَةِ

### بەڵێندان لەسەر کۆچکردن (لەپێناو خوا)

٤٤٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄: أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي جِئْتُ أُبَايِعُكَ عَلَى الْهِجْرَةِ، وَلَقَدْ تَرَكْتُ أَبَوَيَّ يَبْكِيَانِ، قَالَ: «ارْجِعْ إِلَيْهِمَا فَأَضْحِكْهُمَا كَمَا أَبْكَيْتَهُمَا».

عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﵄ دەگێڕێتەوە: پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: من هاتووم بەڵێنت پێ بدەم لەسەر کۆچکردن، بەدڵنیاییەوە دایک و باوکم بەجێ هێشت دەگریان، فەرمووی: «بگەڕێوە بۆ لایان و بیانخە پێکەنینەوە وەکوو چۆن خستیانتە گریانەوە».

## الْحَثُّ عَلَى الْهِجْرَةِ

## هاندان لەسەر کۆچکردن

٤٤٤. عَنْ كَثِيرِ بْنِ مُرَّةَ، أَنَّ أَبَا فَاطِمَةَ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، حَدِّثْنِي بِعَمَلٍ أَسْتَقِيمُ عَلَيْهِ وَأَعْمَلُهُ، قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكَ بِالْهِجْرَةِ، فَإِنَّهُ لَا مِثْلَ لَهَا».



کەسیری کوڕی موڕڕە دەگێڕێتەوە، باوکی فاتیمە ﵁ بۆی باس کرد، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، باسی شتێکم بۆ بکە بەردەوام بم لەسەری و کاری پێ بکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: «لەسەرتە کۆچ بکەی، هیچ شتێک وەکوو ئەو نییە».

## ذِكْرُ الِاخْتِلَافِ فِي انْقِطَاعِ الْهِجْرَةِ

## باسی جیاوازی لە نەمانی هیجرەت

٤٤٥. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْفَتْحِ: «لَا هِجْرَةَ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، فَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا فەرمووی: «کۆچ نییە، بەڵام جیهاد و نیەت هەیە، ئەگەر داوای دەرچوونتان لێ کرا بۆ جیهادکردن دەربچن».

## اسْتِقَالَةُ الْبَيْعَةِ

### پەشیمانبوونەوە لە بەیعەت و بەڵێندان

٤٤٦. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄: أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَايَعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْإِسْلَامِ، فَأَصَابَ الْأَعْرَابِيَّ وَعْكٌ بِالْمَدِينَةِ، فَجَاءَ الْأَعْرَابِيُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى، فَخَرَجَ الْأَعْرَابِيُّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا الْمَدِينَةُ كَالْكِيرِ تَنْفِي خَبَثَهَا وَتَنْصَعُ طِيبَهَا».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەگێڕێتەوە: دەشتەکییەک بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئیسلام، کابرای دەشتەکی لە مەدینە تووشی تا و نەخۆشی بوو، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بەیعەتەکەم لێ دابڕنە (پێی وا بوو ئەوەی تووشی بووە بەهۆی شوومی بەیعەتەکەوەیە)، پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو، پاشان هاتەوە خزمەتی و گوتی: بەیعەتەکەم لێ دابڕنە، پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو، دەشتەکییەکە دەرچوو لە مەدینە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «مەدینە (بۆ کەسە خراپەکان) وەکوو ئامرازی ئاگر خۆشکردنی ئاسنگەرە، پیسیی ئاسنەکە ناهێڵێت و پاکییەکەی جیا دەکاتەوە».

## التَّرْغِيبُ فِي طَاعَةِ الْإِمَامِ

### هاندان بۆ گوێڕایەڵیکردنی پێشەوا (ئیمام)

٤٤٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ أَطَاعَ أَمِيرِي فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ عَصَى أَمِيرِي فَقَدْ عَصَانِي».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس گوێڕایەڵیم بکات ئەوە گوێڕایەڵیی خوای کردووە، هەر کەسیش سەرپێچیم بکات ئەوە سەرپێچیی خوای کردووە، هەر کەسیش گوێڕایەڵیی ئەمیرەکەم بکات ئەوە گوێڕایەڵیی منی کردووە، هەر کەسیش سەرپێچیی ئەمیرەکەم بکات ئەوە سەرپێچیی منی کردووە».

## ذِكْرُ مَا يَجِبُ لِلْإِمَامِ وَمَا يَجِبُ عَلَيْهِ

### باسی ئەوەی پێویستە بۆ پێشەوا پێی هەڵسێت و ئەوەشی پێویستە لەسەری

٤٤٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا الْإِمَامُ جُنَّةٌ يُقَاتَلُ مِنْ وَرَائِهِ وَيُتَّقَى بِهِ، فَإِنْ أَمَرَ بِتَقْوَى اللَّهِ وَعَدَلَ فَإِنَّ لَهُ بِذَلِكَ أَجْرًا، وَإِنْ أَمَرَ بِغَيْرِهِ فَإِنَّ عَلَيْهِ وِزْرًا».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پێشەوا قەڵغانە لە پشتیەوە جەنگ دەکرێت و خۆشی پێ دەپارێزرێت و دەبێتە پەناگە، ئەگەر فەرمانی بە خۆپارێزی کرد و دادپەروەر بوو، ئەوە بەو هۆیەوە پاداشتی بۆ هەیە، ئەگەر بە غەیری ئەوە فەرمانی کرد، ئەوە بۆی دەبێتە بارگرانی (لە ڕۆژی دوایی)».



## بِطَانَةُ الْإِمَامِ

### هاوەڵی پێشەوا (ئیمام)

٤٤٩. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا بَعَثَ اللَّهُ مِنْ نَبِيٍّ، وَلَا اسْتَخْلَفَ مِنْ خَلِيفَةٍ، إِلَّا كَانَتْ لَهُ بِطَانَتَانِ: بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْخَيْرِ، وَبِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالشَّرِّ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، وَالْمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللَّهُ ﷻ».

ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا ﷻ هیچ

پێغەمبەرێکی نەناردووە، هیچ کەسێکیشی نەکردووە بە جێنشین، ئیللا دوو هاوەڵی هەن: هاوەڵێک فەرمانی پێ دەکات بە خێر و چاکە، هاوەڵێک فەرمانی پێ دەکات بە خراپە و هانی دەدات لەسەری، پارێزراویش ئەو کەسەیە خوا پاراستوویەتی».

## وَزِيرُ الْإِمَامِ

## وەزیری پێشەوا (ئیمام)

٤٥٠. عَنْ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَمَّتِي تَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ وَلِيَ مِنْكُمْ عَمَلاً فَأَرَادَ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا جَعَلَ لَهُ وَزِيرًا صَالِحًا، إِنْ نَسِيَ ذَكَّرَهُ، وَإِنْ ذَكَرَ أَعَانَهُ».

قاسیمی کوڕی موحەممەد دەڵێت: گوێم لە پوورم بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس لە ئێوە دەسەڵاتێکی پێ بدرێت، خوا ﷻ خێری بۆ بوێت وەزیرێکی خواناسی بۆ دادەنێت، ئەگەر بیری چوو یادی دەخاتەوە، ئەگەر لەیادی بوو پشتیوانی لێ دەکات».



## ذِكْرُ الْوَعِيدِ لِمَنْ أَعَانَ أَمِيرًا عَلَى الظُّلْمِ

## باسی هەڕەشە لەو کەسەی یارمەتی ئەمیرێکی ستەمکار دەدات

٤٥١. عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ تِسْعَةٌ، فَقَالَ: «إِنَّهُ سَتَكُونُ بَعْدِي أُمَرَاءُ مَنْ صَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ، فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ، وَلَيْسَ بِوَارِدٍ عَلَيَّ الْحَوْضَ، وَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ، فَهُوَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ، وَهُوَ وَارِدٌ عَلَيَّ الْحَوْضَ».

کەعبی کوڕی عوجرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ نێومان ئێمەیش نۆ

کەس بووین، فەرمووی: «بێگومان ماوەیەکی کەم لەدوای من دەسەڵاتدارانێک پەیدا دەبن، هەر کەس بەڕاستیان دابنێت لەوەی درۆ دەکەن، وە پشتیوانییان بکات لەسەر ستەمکردنیان، نە ئەو لە منە و نە منیش لە ئەوم، هەرگیز نایەت بۆ لای من لەسەر حەوزەکە، هەر کەسیش درۆکانیان بەڕاست دانەنێت و پشتیوانییان لێ نەکات لەسەر ستەمەکانیان، ئەوە لە منە و منیش لە ئەوم، ئەو کەسە دێتە لای من لەسەر حەوزەکە».

## فَضْلُ مَنْ تَكَلَّمَ بِالْحَقِّ عِنْدَ إِمَامٍ جَائِرٍ

## پێگە و گەورەیی کەسی هەقبێژ بەرانبەر پێشەوایەکی ستەمکار



٤٥٢. عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ ﵁: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ وَقَدْ وَضَعَ رِجْلَهُ فِي الْغَرْزِ، أَيُّ الْجِهَادِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «كَلِمَةُ حَقٍّ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ».

تاریقی کوڕی شیهاب ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێک کاتێك قاچی خستە نێو ئاوزەنگی وشترەکەی، پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ: گەورەترین و باشترین جیهاد کامەیە؟ فەرمووی: «گوتنی وشەیەکی هەق بەرانبەر دەسەڵاتدارێکی ستەمکار».

تێبینی:

ئاوزەنگ: ئەو شتەیە کە پێ دەخرێتە نێوی بە مەبەستی سواربوون بۆ سەر پشتی وڵاخ.

## مَا يُكْرَهُ مِنَ الْحِرْصِ عَلَى الْإِمَارَةِ

### سوربوون لەسەر وەرگرتنی پلەوپایە و دەسەڵات ناپەسندە

٤٥٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَحْرِصُونَ عَلَى الْإِمَارَةِ، وَإِنَّهَا سَتَكُونُ نَدَامَةً وَحَسْرَةً فَنِعْمَتِ الْمُرْضِعَةُ، وَبِئْسَتِ الْفَاطِمَةُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان ئێوە لە داهاتوویەکی نزیکدا زۆر پێداگری دەکەن لەسەر وەرگرتنی دەسەڵات، بێگومان ئەو بەرپرسیارێتییەش دەبێتە مایەی پەشیمانی، جا گەیشتن بە دەسەڵات خۆشترین ژیانە (لە دونیادا)، وە نەمانیشی ناخۆشترین شتە (ئەویش مردنە)».

# كِتَابُ الْعَقِيقَةِ

## پەرتووکی هۆزەبانە

٤٥٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَقَّ عَنِ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ.



عەبدوڵڵای کوڕی بوڕەیدە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هۆزەبانەی بۆ حەسەن و حوسێن کرد.

تێبینی:

(العقیقة): بە کوردی (هۆزەبانە)ی پێ دەگوترێت، بریتییە لەو ئاژەڵ سەربڕینەی کە بۆ منداڵی تازە لەدایکبوو ئەنجام دەدرێت.

### الْعَقِيقَةُ عَنِ الْغُلَامِ

### هۆزەبانە بۆ کوڕ

٤٥٥. عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ الضَّبِّيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «فِي الْغُلَامِ عَقِيقَةٌ فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا، وَأَمِيطُوا عَنْهُ الْأَذَى».

سەلمانی کوڕی عامیری زەببی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «منداڵ هۆزەبانەی بۆ هەیە، لەبری ئەو خوێنەکەی بڕێژن و پیسیی لێ بکەنەوە (قژی بتاشن)».

٤٥٦. عَنْ أُمِّ كُرْزٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «فِي الْغُلَامِ شَاتَانِ مُكَافَأَتَانِ، وَفِي الْجَارِيَةِ شَاةٌ».

ئوم کوڕز ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بۆ کوڕ دوو مەڕی هاوشێوەی یەکدی سەر دەبڕدرێت، بۆ کچیش یەک دانە».

## مَتَى يُعَقُّ؟

### کەی هۆزەبانە ئەنجام دەدرێت؟



٤٥٧. عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كُلُّ غُلَامٍ رَهِينٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سَابِعِهِ وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ وَيُسَمَّى».

سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەموو منداڵێک بارمتەیە بە هۆزەبانەکەیەوە، (هەر دەبێت هۆزەبانەی بۆ بکرێت تا بتوانێت شەفاعەت بۆ دایک و باوکی بکات) لە ڕۆژی حەوتەمدا بۆی سەر دەبڕدرێت و سەری دەتاشرێت، ناویشی لێ دەنرێت».



# كِتَابُ الْفَرَعِ وَالْعَتِيرَةِ

## پەرتووكی فەرەع و عەتیرە

٤٥٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا فَرَعَ وَلَا عَتِيرَةَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نە فەرەع (واجبە) و نە عەتیرەیش (واجبە)».

تێبینی:

(الْفَرَع): یەکەم سکی وشترە کە لەدایک دەبوو، لە سەردەمی پێشی ئیسلام سەریان دەبڕی دەیانکرد بە خێر بە مەبەستی فەڕ و بەرەکەت.

(الْعَتِيرَة): ئەو ئاژەڵەیە لە دەی مانگی ڕەجەبدا خەڵکی بەر لە ئیسلام بە مەبەستی نزیکبوونەوە لە خوا سەریان دەبڕی.

# تَفْسِيرُ الْعَتِيرَةِ

## شیکردنەوەی (الْعَتِيرَة)

٤٥٩. عَنْ نُبَيْشَةَ ﷺ قَالَ: ذُكِرَ لِلنَّبِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَعْتِرُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، قَالَ: «اذْبَحُوا لِلَّهِ ﷻ فِي أَيِّ شَهْرٍ مَا كَانَ، وَبَرُّوا اللَّهَ ﷻ وَأَطْعِمُوا».

نوبەیشە ﷺ دەڵێت: باس کرا بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا عەتیرەمان دەکرد، فەرمووی: «لەپێناوی خوا ﷻ سەری ببڕن لە هەر مانگێکدا بێت، چاکە بکەن لەپێناوی خوادا و خواردنیش ببەخشنەوە».

# كِتَابُ الصَّيْدِ وَالذَّبَائِحِ

## پەرتووکی ڕاوکردن و سەربڕینەکان

### النَّهْيُ عَنْ أَكْلِ مَا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ

### ڕێگریکردن لە خواردنی ئەو نێچیرەی ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە



٤٦٠. عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رضي الله عنه قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَيْدِ الْمِعْرَاضِ، فَقَالَ: «مَا أَصَبْتَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَمَا أَصَبْتَ بِعَرْضِهِ فَهُوَ وَقِيذٌ». وَسَأَلْتُهُ عَنِ الْكَلْبِ فَقَالَ: «إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَأَخَذَ، وَلَمْ يَأْكُلْ، فَكُلْ، فَإِنَّ أَخْذَهُ ذَكَاتُهُ، وَإِنْ كَانَ مَعَ كَلْبِكَ كَلْبٌ آخَرُ، فَخَشِيتَ أَنْ يَكُونَ أَخَذَ مَعَهُ فَقَتَلَ، فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّكَ إِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ، وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى غَيْرِهِ».

عەدی کوڕی حاتیم رضي الله عنه دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی ڕاوکردن بە نەقیزە، فەرمووی: «ئەگەر بە سەرە نەقیزەکە پێکات ئەوە بیخۆ، ئەگەر بە باری پانی پێکات و مردار بوویەوە، ئەوە پیسە و مەیخۆ»، پرسیارم لێ کرد دەربارەی ڕاوکردن بە سەگ، فەرمووی: «ئەگەر سەگەکەت نارد بۆ ڕاوکردن، نێچیرەکەی گرت و لێی نەخوارد، بیخۆ، چونکە گرتنی سەربڕینیەتی، ئەگەر لەگەڵ سەگەکەتدا

سەگێکی دیکە ڕاوی کرد، ترسای لەوەی پێکەوە گرتبێتیان، نێچیرەکەیش مردار بووبوویەوە، مەیخۆ، چونکە تۆ ناوی خوات لەسەر سەگەکەی خۆت هێناوە، لەسەر غەیری ئەو نەتهێناوە».

## امْتِنَاعُ الْمَلَائِكَةِ مِنْ دُخُولِ بَيْتٍ فِيهِ كَلْبٌ

### نەچوونە ژوورەوەی فریشتەکان بۆ نێوماڵێک سەگی تێدابێت

٤٦١. عَنْ أَبِي طَلْحَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ، وَلَا صُورَةٌ».

ئەبو تەلحە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە سەگ یان وێنەی تێدابێت».



## النَّهْيُ عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ

### قەدەغەکردن لە وەرگرتنی نرخی سەگ

٤٦٢. عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «شَرُّ الْكَسْبِ مَهْرُ الْبَغِيِّ، وَثَمَنُ الْكَلْبِ، وَكَسْبُ الْحَجَّامِ».

ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خراپترین دەستکەوت پارەی ئافرەتی زیناکەر و پارەی سەگ و دەستخستنی پارەی ئەوانەیە کەڵەشاخ دەکەن».

## فِي الَّذِي يَرْمِي الصَّيْدَ فَيَقَعُ فِي الْمَاءِ

### لە بارەی ئەو کەسەی نێچیر دەپێکێت و دەکەوێتە نێو ئاوەوە

٤٦٣. عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّيْدِ، فَقَالَ: «إِذَا رَمَيْتَ سَهْمَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ ﷻ، فَإِنْ وَجَدْتَهُ قَدْ قُتِلَ فَكُلْ، إِلَّا أَنْ تَجِدَهُ قَدْ وَقَعَ فِي مَاءٍ، وَلَا تَدْرِي الْمَاءُ قَتَلَهُ أَوْ سَهْمُكَ».

عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی ڕاوکردنەوە، فەرمووی: «ئەگەر تیرەکەت هاویشت ناوی خوا بێنە، ئەگەر دۆزیتەوە کوژرابوو، بیخۆ، بەڵام ئەگەر کەوتبووە نێو ئاوەوە، مەیخۆ، چونکە تۆ نازانی ئاوەکە خنکاندوویەتی یان تیرەکەت».



## اتِّبَاعُ الصَّيْدِ

### شوێنکەوتنی ڕاوکردن

٤٦٤. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ سَكَنَ الْبَادِيَةَ جَفَا، وَمَنِ اتَّبَعَ الصَّيْدَ غَفَلَ، وَمَنِ اتَّبَعَ السُّلْطَانَ افْتُتِنَ».

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس لە دەشت دابنیشێت وشک و دڵڕەق دەردەچێت (چونکە تێکەڵی زانایان ناکات، وە بەرگەی ئازاری خەڵکی ناگرێت)، هەر کەس شوێنی ڕاوکردن بکەوێت ئەوە (سەرقاڵی دەکات و) بێئاگا دەبێت (لە زیکر و یادی خوا)، وە هەر کەس شوێنی دەسەڵاتدار بکەوێت تووشی فیتنە و بەڵا دەبێت».

## بَابُ مَيْتَةِ الْبَحْرِ

### باسی خواردنی مردارەوەبووی دەریا

٤٦٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي مَاءِ الْبَحْرِ: «هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحَلَالُ مَيْتَتُهُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە بارەی ئاوی دەریاوە (فەرموویەتی): «ئاوی دەریا پاکە، مردارەوەبووشی حەڵاڵە».

٤٦٦. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: بَعَثَنَا النَّبِيُّ ﷺ مَعَ أَبِي عُبَيْدَةَ فِي سَرِيَّةٍ فَنَفِدَ زَادُنَا، فَمَرَرْنَا بِحُوتٍ قَدْ قَذَفَ بِهِ الْبَحْرُ، فَأَرَدْنَا أَنْ نَأْكُلَ مِنْهُ، فَنَهَانَا أَبُو عُبَيْدَةَ، ثُمَّ قَالَ: نَحْنُ رُسُلُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، كُلُوا، فَأَكَلْنَا مِنْهُ أَيَّامًا، فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَخْبَرْنَاهُ، فَقَالَ: «إِنْ كَانَ بَقِيَ مَعَكُمْ شَيْءٌ فَابْعَثُوا بِهِ إِلَيْنَا».



جابیر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ ئێمەی نارد لەگەڵ ئەبو عوبەیدە لە سوپایەکدا، خوردنمان پێ نەما، تێپەڕین بەلای نەهەنگێکدا دەریاکە خستبوویە کەنار، ویستمان لێی بخۆین، ئەبو عوبەیدە قەدەغەی لێ کردین، پاشان گوتی: ئێمە نێردراوی پێغەمبەری خواین ﷺ و لەپێناو خواشدا نێردراوین، پاشان گوتی: بخۆن، چەند ڕۆژێک لێیمان خوارد، کاتێك گەڕاینەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵمان پێ دا، فەرمووی: «ئەگەر شتێکتان لەلا ماوەتەوە بۆمانی بنێرن».

## الضِّفْدَعُ

### (دەربارەی کوشتنی) بۆق

٤٦٧. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ ﵁: أَنَّ طَبِيبًا ذَكَرَ ضِفْدَعًا فِي دَوَاءٍ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ

ﷺ، فَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ قَتْلِهِ.

عەبدورڕەحمانی کوڕی عوسمان ﷺ دەگێڕێتەوە: پزیشکێک بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ باس کرد کە بۆق بۆ چارەسەری نەخۆش بەسوودە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کوشتنی کرد.

## قَتْلُ النَّمْلِ

### کوشتنی مێرووله

٤٦٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «أَنَّ نَمْلَةً قَرَصَتْ نَبِيًّا مِنَ الْأَنْبِيَاءِ، فَأَمَرَ بِقَرْيَةِ النَّمْلِ، فَأُحْرِقَتْ، فَأَوْحَى اللَّهُ ﷻ إِلَيْهِ أَنْ قَدْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةٌ أَهْلَكْتَ أُمَّةً مِنَ الْأُمَمِ تُسَبِّحُ».



ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مێروولەیەک پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرانی گەست، ئەویش فەرمانی کرد شارە مێروولەکە سووتێنرا، خوا ﷻ وەحی بۆ نارد، تۆ یەک مێرووله گازی لێ گرتیت، ئوممەتێک لە ئوممەتەکانت لەناو برد یادی خوایان دەکرد».

تێبینی:

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت سووتاندن لە شەریعەتی ئەو پێغەمبەرەدا دروست بووە، بۆیە خوا سەرزەنشتی نەکرد لەسەر سووتاندنەکە، بەڵکوو بەوە سەرزەنشتی کرد لەبری یەکێک کۆمەڵێکی سووتاند، خوا زاناترە.



# كِتَابُ الضَّحَايَا

## پەرتووكی قوربانییەكان

٤٦٩. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ رَأَى هِلَالَ ذِي الْحِجَّةِ، فَأَرَادَ أَنْ يُضَحِّيَ، فَلَا يَأْخُذْ مِنْ شَعْرِهِ، وَلَا مِنْ أَظْفَارِهِ حَتَّى يُضَحِّيَ».



ئوم سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر كەس مانگی (ذِي الْحِجَّةِ)ی بینی، ویستی قوربانی بكات، با هیچ لە قژ و نینۆكی نەكاتەوە تا قوربانییەكە دەكات».

### بَابُ ذَبْحِ النَّاسِ بِالْمُصَلَّى

### باسی قوربانیكردنی خەڵك لە شوێنی نوێژی جەژندا

٤٧٠. عَنْ جُنْدُبِ بْنِ سُفْيَانَ ﵁ قَالَ: شَهِدْتُ أَضْحًى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ رَأَى غَنَمًا قَدْ ذُبِحَتْ، فَقَالَ: «مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلَاةِ فَلْيَذْبَحْ شَاةً مَكَانَهَا، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ ذَبَحَ فَلْيَذْبَحْ عَلَى اسْمِ اللَّهِ ﷻ».

جوندوبی كوڕی سوفیان ﵁ دەڵێت: ئامادەی قوربانی بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا

ﷺ، نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، کاتێك نوێژی تەواو کرد، مەڕی بینی سەر بڕابوو، فەرمووی: «کێ پێش نوێژ ئاژەڵی سەر بڕیوە با لەدوای نوێژ مەڕێک لە جێگای سەر ببڕێت، هەر کەسیش پێش نوێژ سەری نەبڕیوە، با بە ناوی خواوە سەری ببڕێت».

## الْكَبْشُ

### بەران (بۆ سەربڕین)

٤٧١. عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ، وَأَنَا أُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ.

ئەنەس رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەرانی شاخداری کرد بە قوربانی، ئەنەس گوتی: منیش دوو بەرانم کرد بە قوربانی.



٤٧٢. عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: ضَحَّى النَّبِيُّ ﷺ بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ، وَسَمَّى، وَكَبَّرَ، وَوَضَعَ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا.

ئەنەس رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دوو بەرانی بۆری شاخداری بە دەستی خۆی سەر بڕی، ناوی خوای هێنا و تەکبیر (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی کرد، قاچیشی خستە سەر ملیان.

## بَابُ مَا تُجْزِئُ عَنْهُ الْبَقَرَةُ فِي الضَّحَايَا

### باسی ئەوەی کە دروستە مانگایەک بکرێتە قوربانی لەبری چەند کەسێک

٤٧٣. عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا نَتَمَتَّعُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَنَذْبَحُ الْبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ، وَنَشْتَرِكُ فِيهَا.

جابیر رضي الله عنه دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ مانگایەکمان بۆ حەوت کەس سەر دەبڕی و هەموومان بەشدار دەبووین تیایدا.

## بَابُ حُسْنِ الذَّبْحِ

### باسی سەربڕین بەچاکترین شێوە

٤٧٤. عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ».

شەددادی کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا ﷻ چاکەی پێویست کردووە لەسەرتان لە هەموو شتێکدا، جا ئەگەر شتێکتان کوشت بەچاکترین شێوە بیکوژن، ئەگەر سەرتان بڕی بەچاکترین شێوە سەری ببڕن، با یەکێکتان چەقۆکە تیژ بکات (بۆئەوەی زوو سەری ببڕێت)، با وازی لێ بهێنێت تا لاشەی سەربڕاوەکە سارد دەبێتەوە».



## ذَبِيحَةُ مَنْ لَمْ يَعْرِفْ

### قوربانیکردن لەلایەن کەسێکەوە نازانرێت ئەو کەسە ناوی خوای لەسەر قوربانییەکە هێناوە یان نەیهێناوە

٤٧٥. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ نَاسًا مِنَ الْأَعْرَابِ كَانُوا يَأْتُونَا بِلَحْمٍ، وَلَا نَدْرِي أَذَكَرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ ﷻ عَلَيْهِ وَكُلُوا».

عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: خەڵکانێکی دەشتەکی گۆشتیان بۆ دەهێناین، نەماندەزانی ناوی خوای لەسەر هێنراوە یان نا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ناوی خوای لەسەر بهێنە و بیخۆ».

## النَّهْيُ عَنِ الْمُجَثَّمَةِ

### قەدەغەکردنی خواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵەی دەکرێت بە نیشانە

٤٧٦. عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَحِلُّ الْمُجَثَّمَةُ».

ئەبو سەعلەبە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «گۆشتی ئەو ئاژەڵەی دەکرێت بە نیشانە حەڵاڵ نییە».

٤٧٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﵁ قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى أُنَاسٍ وَهُمْ يَرْمُونَ كَبْشًا بِالنَّبْلِ، فَكَرِهَ ذَلِكَ، وَقَالَ: «لَا تَمْثُلُوا بِالْبَهَائِمِ».

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بە لای خەڵکێکدا بەرانێکیان تیرباران دەکرد، ئەو کردەوەی پێناخۆش بوو، فەرمووی: «ئاژەڵەکان مەشێوێنن و (بەزیندوویی) پەلپەلیان مەکەن».





# كِتَابُ الْبُيُوعِ

## پەرتووکی کڕین و فرۆشتنەکان

### بَابُ الْحَثِّ عَلَى الْكَسْبِ

### باسی هاندان لە سەر کار و کەسابەتکردن

٤٧٨. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ مِنْ كَسْبِهِ، وَإِنَّ وَلَدَ الرَّجُلِ مِنْ كَسْبِهِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «چاکترین و پاکترین خواردنێک کە پیاو بیخوات ڕەنجی شانی خۆیەتی، بێگومان منداڵەکەیشی لە ڕەنجی شانی خۆیەتی».

### بَابُ اجْتِنَابِ الشُّبُهَاتِ فِي الْكَسْبِ

### باسی دوورکەوتنەوە لەو شتانەی گومانی تێدایە لە کار و پیشەدا

٤٧٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ مَا يُبَالِي

الرَّجُلُ مِنْ أَيْنَ أَصَابَ الْمَالَ مِنْ حَلَالٍ أَوْ حَرَامٍ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕۆژگارێک بەسەر خەڵکدا دێت پیاو کێشەی نییە و گرینگی نادات بەوەی لەکوێوە ماڵی بەدەست هێناوە بە حەرامی یان بە حەڵاڵی».

## الْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ

### ئەو کەسەی بە سوێندی درۆماڵەکەی ساغ دەکاتەوە

٤٨٠. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ»، فَقَرَأَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَالَ أَبُو ذَرٍّ: خَابُوا وَخَسِرُوا، قَالَ: «الْمُسْبِلُ إِزَارَهُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ، وَالْمَنَّانُ عَطَاءَهُ».



ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «سێ کەس هەن خوا لە ڕۆژی دواییدا نە قسەیان لەگەڵدا دەکات نە سەیریان دەکات و نە پاکیان دەکاتەوە، سزایەکی بەئێشیشیان بۆ هەیە»، پێغەمبەری خوا ﷺ (ئایەتەکەی) خوێندەوە، جا ئەبو زەڕ ﷺ گوتی: ڕیسوا و زەرەرمەند بوون، فەرمووی: «ئەو کەسەی کە دەرقاچەکەی درێژە و دەخشێت بە زەویدا، (بەهۆی فیز و خۆبەزلزانیەوە)، ئەو کەسەی ماڵ و سامانەکەی دەفرۆشێت بە سوێندی درۆ، ئەو کەسەی کە منەت دەکات بەسەر خەڵکی (هەژاردا دوای ئەوەی چاکەی لەگەڵ کردوون)».

٤٨١. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِيَّاكُمْ وَكَثْرَةَ الْحَلِفِ فِي الْبَيْعِ، فَإِنَّهُ يُنَفِّقُ، ثُمَّ يَمْحَقُ».

ئەبو قەتادەی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ

بوو دەیفەرموو: «ئاگادار بن زۆر سوێند مەخۆن لە کڕین و فرۆشتندا، چونکە سوێندخواردن کەلوپەلی پێ دەفرۆشرێت، دواتر بەرەکەت ناهێڵێت».

## الْخَدِيعَةُ فِي الْبَيْعِ

### فێڵ و هەڵخەڵەتاندن لە کڕین و فرۆشتندا

٤٨٢. عَن ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَجُلاً ذَكَرَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ يُخْدَعُ فِي الْبَيْعِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا بِعْتَ فَقُلْ: لَا خِلَابَةَ »، فَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا بَاعَ يَقُولُ: لَا خِلَابَةَ.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پیاوێک باسی ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە لە کڕین و فرۆشتندا دەخەڵەتێت، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: «ئەگەر مامەڵەت کرد بڵێ: بەبێ فڕت و فێڵ»، جا ئەو پیاوە ئەگەر مامەڵەی بکردایە دەیگوت: بەبێ فڕت و فێڵ.



## بَيْعُ الرَّجُلِ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ

### مامەڵەکردنی پیاوێک بەسەر مامەڵەی براکەیدا

٤٨٣. عَن ابْنِ عُمَرَ ﵄ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَبِيعُ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ حَتَّى يَبْتَاعَ أَوْ يَذَرَ».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «یەکێکتان مامەڵە بەسەر مامەڵەی براکەیدا نەکات، هەتا دەیکڕێت یاخود وازی لێ دەهێنێت».

## بَيْعُ الثَّمَرِ قَبْلَ أَنْ يَبْدُوَ صَلَاحُهُ

### فرۆشتنی بەروبووم پێش ئەوەی پێبگات

٤٨٤. عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﵄ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَبِيعُوا الثَّمَرَ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهُ»، نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەروبووم مەفرۆشن هەتا پێدەگات»، قەدەغەی کرد لە فرۆشیار و کڕیار.

## بَيْعُ التَّمْرِ بِالتَّمْرِ مُتَفَاضِلاً

### فرۆشتنی خورما بە خورما بەزیادە



٤٨٥. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِتَمْرٍ رَيَّانَ، وَكَانَ تَمْرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَعْلاً فِيهِ يُبْسٌ، فَقَالَ: «أَنَّى لَكُمْ هَذَا؟»، قَالُوا: ابْتَعْنَاهُ صَاعًا بِصَاعَيْنِ مِنْ تَمْرِنَا، فَقَالَ: «لَا تَفْعَلْ، فَإِنَّ هَذَا لَا يَصِحُّ، وَلَكِنْ بِعْ تَمْرَكَ، وَاشْتَرِ مِنْ هَذَا حَاجَتَكَ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە: خورمایەکیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا زۆر ئاو درابوو، جا باخە خورماکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاوی ڕووبار ئاو نەدەدرا، بۆیە هیی وشکی تێدا بوو، فەرمووی: «ئەمەتان لە کوێ هێناوە؟»، گوتیان: صاعێکمان بە دوو صاعی خورمای خۆمان کڕیوە، فەرمووی: «کاری وا مەکە، چونکە ئەمە دروست نییە، بەڵکوو خورماکەت بفرۆشە و بە پارەکەی پێویستییەکەت بکڕە».

## بَيْعُ التَّمْرِ بِالتَّمْرِ

### فرۆشتنی خورما به خورما

٤٨٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «التَّمْرُ بِالتَّمْرِ، وَالْحِنْطَةُ بِالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ، وَالْمِلْحُ بِالْمِلْحِ يَدًا بِيَدٍ، فَمَنْ زَادَ أَوِ ازْدَادَ فَقَدْ أَرْبَى، إِلَّا مَا اخْتَلَفَتْ أَلْوَانُهُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «خورما بە خورما، گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، خوێ بە خوێ، دەست بە دەست، هەرکەس زیادە بدات یان زیادە وەربگرێت، ئەوە ڕیبای کردووە، مەگەر جۆرەکانیان لە یەکدی جیاواز بێت».

## بَيْعُ الطَّعَامِ قَبْلَ أَنْ يُسْتَوْفَى

### فرۆشتنەوەی خواردن پێش ئەوەی وەربگیرێت

٤٨٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلَا يَبِيعُهُ حَتَّى يَقْبِضَهُ»، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﵄: فَأَحْسَبُ أَنَّ كُلَّ شَيْءٍ بِمَنْزِلَةِ الطَّعَامِ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس خواردنێك بکڕێت با نەیفرۆشێت تا وەریدەگرێت». ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێم وایە هەموو شتێک وەکوو خواردن وایە.

## الرَّهْنُ فِي الْحَضَرِ

### ڕەهنکردن لە شوێنی نیشتەجێ

٤٨٨. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّهُ مَشَى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِخُبْزِ شَعِيرٍ، وَإِهَالَةٍ سَنِخَةٍ، قَالَ: وَلَقَدْ رَهَنَ دِرْعًا لَهُ عِنْدَ يَهُودِيٍّ بِالْمَدِينَةِ وَأَخَذَ مِنْهُ شَعِيرًا لِأَهْلِهِ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: چووە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ نانی جۆی بۆی برد لەگەڵ ڕۆنێک ئەوەندە مابوویەوە بۆنی گۆڕابوو، گوتی: زرێیەکی هەبوو لای جوولەکەیەک داینا لە مەدینە، لە بەرانبەریدا جۆی وەرگرت بۆ خانەوادەکەی.



## بَيْعُ الْحَيَوَانِ بِالْحَيَوَانِ نَسِيئَةً

### فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ بەقەرز

٤٨٩. عَنْ سَمُرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: نَهَى عَنْ بَيْعِ الْحَيَوَانِ بِالْحَيَوَانِ نَسِيئَةً.

سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵی قەدەغە کرد بە شێوەی قەرز.

## مُبَايَعَةُ أَهْلِ الْكِتَابِ

### کڕین و فرۆشتن لەگەڵ خاوەن کتێبەکان

٤٩٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَدِرْعُهُ مَرْهُونَةٌ عِنْدَ يَهُودِيٍّ

بِثَلَاثِينَ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ لِأَهْلِهِ.

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد زرێیەکەی بەبارمتە دانرابوو لەلای جوولەکەیەک، لەبری سی صاع لە جۆ بۆ خانەوادەکەی.

## بَيْعُ الْخَمْرِ

### فرۆشتنی ئارەق

٤٩١. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ آيَاتُ الرِّبَا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَتَلَاهُنَّ عَلَى النَّاسِ، ثُمَّ حَرَّمَ التِّجَارَةَ فِي الْخَمْرِ.

عائیشە ﷺ دەڵێت: کاتێك کە ئایەتەکانی ڕیبا دابەزین، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسایە سەر مینبەر و ئەو ئایەتانەی بەسەر خەڵکیدا خوێندەوە، پاشان بازرگانیکردنی بە ئارەق قەدەغە کرد.



## الِاسْتِقْرَاضُ

### قەرزوەرگرتن

٤٩٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ ﷺ قَالَ: اسْتَقْرَضَ مِنِّي النَّبِيُّ ﷺ أَرْبَعِينَ أَلْفًا، فَجَاءَهُ مَالٌ فَدَفَعَهُ إِلَيَّ، وَقَالَ: «بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ، إِنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ الْحَمْدُ وَالْأَدَاءُ».

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕەبیعە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ چل هەزاری بەقەرز لێ وەرگرتم، دواتر ماڵ و سامانی بۆ هات، قەرزەکەی پێ دامەوە و فەرمووی: «خوا

بەرەکەت بخاتە نێو خانەوادە و ماڵ و سامانت، بەڕاستی پاداشتی قەرز سوپاسکردن و دانەوەیەتی».

## التَّسْهِيلُ فِيهِ

## ئاسانکاری لە قەرزدا

٤٩٣. عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ مَيْمُونَةَ رضي الله عنها زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ اسْتَدَانَتْ فَقِيلَ لَهَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، تَسْتَدِينِينَ وَلَيْسَ عِنْدَكِ وَفَاءٌ، قَالَتْ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَخَذَ دَيْنًا وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يُؤَدِّيَهُ، أَعَانَهُ اللَّهُ ﷻ».

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە دەگێڕێتەوە، مەیموونەی رضي الله عنها خێزانی پێغەمبەر ﷺ قەرزی کرد، پێی گوترا: ئەی دایکی ئیمانداران قەرز دەکەیت و هیچت نییە بیدەیتەوە، گوتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەس قەرزێك بکات مەبەستی ئەوە بێت بیداتەوە، خوا ﷻ یارمەتی دەدات لەسەر دانەوەی قەرزەکەی».



## حُسْنُ الْمُعَامَلَةِ وَالرِّفْقُ فِي الْمُطَالَبَةِ

## هەڵسوکەوتی جوان لە کاتی داواکردنی قەرز

٤٩٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه يَقُولُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَجُلٌ يُدَايِنُ النَّاسَ، وَكَانَ إِذَا رَأَى إِعْسَارَ الْمُعْسِرِ قَالَ لِفَتَاهُ: تَجَاوَزْ عَنْهُ، لَعَلَّ اللَّهَ تَعَالَى يَتَجَاوَزُ عَنَّا، فَلَقِيَ اللَّهَ فَتَجَاوَزَ عَنْهُ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «پیاوێک هەبوو قەرزی دەدا بە

خەڵکی ئەگەر هەستی کردبا کەسەکە ناتوانێت قەرزەکەی بداتەوە بە نێردراوەکەی دەگوت: چاوپۆشیی لێ بکە، بەڵکوو خوا چاوپۆشیمان لێ بکات، کاتێك گەیشتەوە خزمەتی خوا، (خوای گەورە) چاوپۆشیی لە (گوناهەکانی) کرد».

## ذِكْرُ الشُّفْعَةِ وَأَحْكَامِهَا

### باسی (الشُّفْعَةِ) و حوکمەکانی

٤٩٥. عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الشُّفْعَةُ فِي كُلِّ مَالٍ لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ، وَعُرِفَتِ الطُّرُقُ فَلَا شُفْعَةَ».

ئەبو سەلەمە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «شوفعە لە هەموو ماڵێکدا هەیە کە بەش نەکرابێت، ئەگەر سنوور دیاری کرا، ڕێگا دانرا، ئەوە شوفعە نییە».



تێبینی:

(الشُّفْعَة): بریتییە لەوەی یەکێک لە هاوبەشەکان بەشەکەی خۆی بفرۆشێت، ئینجا هاوبەشەکەی دیکە بچێت شتەکە لە کڕیارەکە بکڕێتەوە بەو پارەیەی پێی کڕیوە، هەرچەندە پێشیخۆش نەبێت.



# كِتَابُ الْقَسَامَةِ

## پەرتووكی قەسامە

### الْقَسَامَةِ

### (دەربارەی) قەسامە



٤٩٦. عَنْ رَجُلٍ، مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْأَنْصَارِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَقَرَّ الْقَسَامَةَ عَلَى مَا كَانَتْ عَلَيْهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ.

پیاوێكی ئەنصاڕی لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دانی نا بە قەسامەدا، بەو شێوەیەی كە خەڵكانی سەردەمی نەفامی لەسەری دەڕۆیشتن (ئەویش بریتییە لەوەی پەنجا كەس لە خێڵی بكوژەكە سوێند دەخۆن كە ئەوان دەستیان لە كوشتنی ئەو كەسەدا نییە، یان پەنجا وشتر دەدەن بە هەقی خوێنی كوژراوەكە بە كەسوكارەكەی).

تێبینی:

(القسامة): بریتییە لەوەی خاوەنی كوژراوەكە سوێند دەخۆن كە فڵانە خێڵ

کوشتوویانە، بەو شێوەیە پەنجا وشتر وەردەگرن، ئەگەرنا پەنجا کەس لە خێڵی بکوژەکە سوێند دەخۆن کە ئەوان دەستیان لە کوشتنی ئەو کەسەدا نەبووە، یان پەنجا وشتر دەدەن بە هەقی خوێنی کوژراوەکە بە کەسوکارەکەی.

## بَابُ الْقَوَدِ

### باسی تۆڵەسەندنەوە

٤٩٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ، النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالتَّارِكُ دِينَهُ الْمُفَارِقُ».

عەبدوڵڵا رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «حەڵاڵ نییە خوێنی هیچ کەسێکی موسوڵمان بڕژێت بە یەکێک لەم سێیانە نەبێت: کەسێکی بەناهەق کوشتبێت، ژنێکی هاوسەردار یان پیاوێکی هاوسەردار زینا بکات، کەسێک واز لە ئایینی خۆی بهێنێت و جیا بێتەوە لە کۆمەڵی موسوڵمانان (دژایەتییان بکات)».

٣٢٥

٤٩٨. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلًا أَتَى بِقَاتِلِ وَلِيِّهِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اعْفُ عَنْهُ»، فَأَبَى. فَقَالَ: «خُذِ الدِّيَةَ»، فَأَبَى. قَالَ: «اذْهَبْ فَاقْتُلْهُ، فَإِنَّكَ مِثْلُهُ»، فَذَهَبَ فَلَحِقَ الرَّجُلَ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اقْتُلْهُ فَإِنَّكَ مِثْلُهُ»، فَخَلَّى سَبِيلَهُ، فَمَرَّ بِي الرَّجُلُ وَهُوَ يَجُرُّ نِسْعَتَهُ.

ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پیاوێک بکوژی خزمەکەی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «لێی خۆش بە»، لێی خۆش نەبوو، فەرمووی: «خوێنبایی وەربگرە»، ڕازی نەبوو، فەرمووی: «بیبە و بیکوژە، تۆش وەکوو ئەو وایت»، پیاوەکە ڕۆیشت و پیاوێکی پێ گەیشت پێی گوترا: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بیبە و بیکوژە، تۆش وەکوو ئەو وایت»، ئەویش وازی لێ هێنا،

جا پیاوەکە تێپەڕی بەلامدا پەتەکەی ڕادەکێشا (کە لە ملی بکوژەکەی کردبوو).

## الْقَوَدُ مِنَ الرَّجُلِ لِلْمَرْأَةِ

## کوشتنەوەی پیاو بە ژن

٤٩٩. عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ يَهُودِيًّا قَتَلَ جَارِيَةً عَلَى أَوْضَاحٍ لَهَا، فَأَقَادَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِهَا.

ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: جوولەکەیەک کەنیزەکێکی کوشت لەسەر ملوانکەیەکی زیو کە هی کەنیزەکەکە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە تۆڵەیدا کوشتیەوە.

## سُقُوطُ الْقَوَدِ مِنَ الْمُسْلِمِ لِلْكَافِرِ

## هەڵگرتنی تۆڵەسەندنەوە لە موسوڵمانێک کە کەسێکی بێبڕوای کوشتبێت



٥٠٠. عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «لَا يَحِلُّ قَتْلُ مُسْلِمٍ إِلَّا فِي إِحْدَى ثَلَاثِ خِصَالٍ: زَانٍ مُحْصَنٌ فَيُرْجَمُ، وَرَجُلٌ يَقْتُلُ مُسْلِمًا مُتَعَمِّدًا، وَرَجُلٌ يَخْرُجُ مِنَ الْإِسْلَامِ فَيُحَارِبُ اللَّهَ ﷻ وَرَسُولَهُ، فَيُقْتَلُ أَوْ يُصَلَّبُ، أَوْ يُنْفَى مِنَ الْأَرْضِ».

عائیشە دایکی ئیمانداران ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «حەڵاڵ نییە کوشتنی هیچ موسوڵمانێک مەگەر بە یەکێک لەم سێ شتە نەبێت: زیناکەرێکی ژن یان پیاو بەردباران دەکرێت، یان پیاوێک بەئەنقەست پیاوێکی دیکە بکوژێت ئەوە دەکوژرێتەوە، یان پیاوێک لە ئیسلام دەربچێت و دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات، جا یان دەکوژرێت، یان هەڵدەواسرێت، یان لەو خاکە دوور دەخرێتەوە».

## تَعْظِيمُ قَتْلِ الْمُعَاهِدِ

## گەورەیی کوشتنی بێبڕوای خاوەن پەیمان

٥٠١. عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَتَلَ نَفْسًا مُعَاهِدَةً بِغَيْرِ حِلِّهَا، حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ أَنْ يَشُمَّ رِيحَهَا».

ئەبو بەکرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هەرکەسێك هاوپەیانێک بکوژێت لە غەیری کاتی خۆی بەناهەق، خوا بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات لەوەی بۆنیشی بکات».

## الْقِصَاصُ فِي السِّنِّ



## تۆڵەسەندنەوە لە ددانددا

٥٠٢. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ أُخْتَ الرُّبَيِّعِ أُمَّ حَارِثَةَ جَرَحَتْ إِنْسَانًا، فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْقِصَاصَ الْقِصَاصَ». فَقَالَتْ أُمُّ الرَّبِيعِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُقْتَصُّ مِنْ فُلَانَةَ؟ لَا وَاللَّهِ لَا يُقْتَصُّ مِنْهَا أَبَدًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سُبْحَانَ اللَّهِ، يَا أُمَّ الرَّبِيعِ، الْقِصَاصُ كِتَابُ اللَّهِ»، قَالَتْ: لَا وَاللَّهِ لَا يُقْتَصُّ مِنْهَا أَبَدًا، فَمَا زَالَتْ حَتَّى قَبِلُوا الدِّيَةَ، قَالَ: «إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ».

ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: خوشکی ڕەبیع دایکی حاریسە کەسێکی بریندار کرد، کێشەکەیان برد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «تۆڵەسەندنەوە، تۆڵەسەندنەوە»، دایکی ڕەبیع گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا فلانە کەس تۆڵەی لێ دەکرێتەوە؟ نە سوێند بە خوا هەرگیز تۆڵەی لێ ناکرێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «پاك و بێگەردی بۆ خوا، ئەی دایکی ڕەبیع، تۆڵەسەندنەوە لە قورئاندا

هەیە»، دایکی ڕەبیع گوتی: نە سوێند بە خوا هەرگیز تۆڵەی لێ ناکرێتەوە، بەردەوام دووبارەی دەکردەوە تا خوێنباییان قبووڵ کرد، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «لەنێو بەندەکانی خوا کەسی وا هەیە ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات (بۆ ئەنجامدانی کارێک، یان بۆ ئەنجامنەدانی) سوێندەکەی ناشکێنێت بۆی جێبەجێ دەکات».

## الرَّجُلُ يَدْفَعُ عَنْ نَفْسِهِ

### باسی پیاوێک بەرگری لە خۆی بکات

٥٠٣. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رضي الله عنه قَالَ: قَاتَلَ يَعْلَى رَجُلاً فَعَضَّ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، فَانْتَزَعَ يَدَهُ مِنْ فِيهِ، فَنَدَرَتْ ثَنِيَّتُهُ، فَاخْتَصَمَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «يَعَضُّ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ كَمَا يَعَضُّ الْفَحْلُ؟ لَا دِيَةَ لَهُ».

عیمڕانی کوڕی حوسەین رضي الله عنه دەڵێت: یەعلا لەگەڵ پیاوێك شەڕی کرد یەکێکیان گازی گرت لە دەستی ئەوی دیکە، ئەویش دەستی دەرهێنا لە دەمی دوو ددانی سەرەوەی کەوت، ئاژاوەکەیان برد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: «یەکێك لە ئێوە گاز لە براکەی دەگرێت، هەروەك چۆن وشتری نێرە گاز لە وشترێکی دیکە دەگرێت، هیچ خوێنبایی بۆ نییە».

## الْأَمْرُ بِالْعَفْوِ عَنِ الْقِصَاصِ

### فەرمانکردن بە لێخۆشبوون لە تۆڵەکردنەوە

٥٠٤. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: مَا أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ فِي شَيْءٍ فِيهِ قِصَاصٌ إِلَّا أَمَرَ فِيهِ بِالْعَفْوِ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: کەسێک هێنرا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تۆڵەی لێ بکرێتەوە، فەرمانی کرد لێی ببورێت.

## كَمْ دِيَةُ شِبْهِ الْعَمْدِ

## خوێنبایی کوشتنی نیمچە هەڵە چەندە

٥٠٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «قَتِيلُ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ بِالسَّوْطِ أَوِ الْعَصَا، مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ أَرْبَعُونَ مِنْهَا فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «خوێنبایی کوشتنی نیمچە هەڵە بە قامچی یان گۆچان، سەد وشترە، چل دانەیان دەبێت ئاوس بن».



## هَلْ يُؤْخَذُ أَحَدٌ بِجَرِيرَةِ غَيْرِهِ؟

## ئایا کەسێک گوناهی غەیری خۆی هەڵدەگرێت؟

٥٠٦. عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ زَهْدَمٍ الْيَرْبُوعِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ فِي أُنَاسٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَؤُلَاءِ بَنُو ثَعْلَبَةَ بْنِ يَرْبُوعٍ قَتَلُوا فُلَانًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ وَهَتَفَ بِصَوْتِهِ: «أَلَا لَا تَجْنِي نَفْسٌ عَلَى الْأُخْرَى».

سەعلەبەی کوڕی زەهدەمی یەڕبووعی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو کۆمەڵێک لە ئەنصارەکان وتاری دەدا، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمانە نەوەی سەعلەبەی کوڕی یەڕبووعن لە سەردەمی نەفامیدا فلانە کەسیان کوشت، پێغەمبەر ﷺ بە دەنگی بەرز فەرمووی: «ئاگادار بن هیچ کەسێک گوناهی کەسێکی دیکە هەڵناگرێت».

## بَابُ عَقْلِ الْأَصَابِعِ

### باسی خوێنبایی پەنجەکان

٥٠٧. عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «فِي الْأَصَابِعِ عَشْرٌ عَشْرٌ».

ئەبو مووسا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «خوێنبایی لە پەنجەکاندا دە وشتر دە وشترە (بۆ هەر پەنجەیەک دە وشترە، کە دەکاتە سەد سەر مەڕ)».

## الْمَوَاضِحُ

### خوێنبایی ئەو برینەی کە گەیشتۆتە سەر ئێسقان و ئێسقانەکەی بەدەرکەوتووە



٥٠٨. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: لَمَّا افْتَتَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ قَالَ فِي خُطْبَتِهِ: «وَفِي الْمَوَاضِحِ خَمْسٌ خَمْسٌ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ مەککەی ڕزگار کرد، لە وتارەکەیدا فەرمووی: «خوێنبایی ئەو برینەی گەیشتۆتە سەر ئێسقان پێنج وشترە».

## مَنْ اقْتَصَّ وَأَخَذَ حَقَّهُ دُونَ السُّلْطَانِ

### باسی ئەو کەسەی تۆڵەی سەندووە بەبێ گەڕانەوە بۆ دەسەڵات

٥٠٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنِ اطَّلَعَ فِي بَيْتِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ فَفَقَئُوا عَيْنَهُ، فَلَا دِيَةَ لَهُ، وَلَا قِصَاصَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك تەماشای نێو ماڵی خەڵکێکی کرد بەبێ ئەوەی مۆڵەتی لێیان وەرگرتبێت، ئەوانیش چاوی کوێر بکەن، ئەوە نە خوێنبایی بۆ هەیە نە تۆڵەکردنەوە».

مَا جَاءَ فِي كِتَابِ الْقِصَاصِ مِنَ الْمُجْتَبِي مِمَّا لَيْسَ فِي السُّنَنِ تَأْوِيلُ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: {وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا} النساء: ٩٣

ئەوەی هاتووە دەربارەی پەرتووکی تۆڵەکردنەوە لە (سُنَن الْمُجْتَبى) و لە سونەنەکاندا نەهاتووە، وە مانای فەرمایشتی خوا ﷻ: {وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا}



٥١٠. عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: هَلْ لِمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا مِنْ تَوْبَةٍ؟ قَالَ: لَا. وَقَرَأْتُ عَلَيْهِ الْآيَةَ الَّتِي فِي الْفُرْقَانِ: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ} الفرقان: ٦٨، قَالَ: هَذِهِ آيَةٌ مَكِّيَّةٌ نَسَخَتْهَا آيَةٌ مَدَنِيَّةٌ: {وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ} النساء: ٩٣.

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: بە ئیبن عەبباسم ﷺ گوت: ئایا کەسێک بڕوادارێک بەئەنقەست بکوژێت تەوبەی بۆ هەیە؟ گوتی: نەخێر، ئەو ئایەتەم بەسەریدا خوێندەوە کە لە فورقاندا هاتووە: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ}، واتە: وە کەسانێکن کە لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی دیکە ناپەرستن و هیچ کەسێك ناکوژن کە خوا کوشتنی قەدەغە کردووە بەهەق و ڕەوا نەبێت. گوتی: ئەم ئایەتە لە مەککە دابەزیوە ئەو ئایەتەی کە لە مەدینە دابەزیوە نەسخی کردۆتەوە: {وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ}، واتە: هەر

کەسیش ئیماندارێک بەئەنقەست بکوژێت ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە.

٥١١. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَزْنِي الْعَبْدُ حِينَ يَزْنِي، وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا، وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَقْتُلُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زیناکەر زینا ناکات لە کاتی زیناکردنەکەدا بڕوادار بێت، مەیخۆر مەی ناخواتەوە لە کاتی مەیخواردنەوەکەیدا بڕوادار بێت، دز دزی ناکات لە کاتی دزیکردنەکەیدا بڕوادار بێت».

# كِتَابُ قَطْعِ السَّارِقِ

# پەرتووكی بڕینی دەستی دز



## تَعْظِيمُ السَّرِقَةِ

### بەگەورەدانانی دزیكردن

٥١٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَعَنَ اللَّهُ السَّارِقَ يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ، وَيَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نەفرەتی خوا لەو دزەی كە هێلكە دەدزێت، ئینجا دەستی دەبڕدرێت، وە حەبل دەدزێت و دەستی دەبڕدرێت».

## مَا يَكُونُ حِرْزًا وَمَا لَا يَكُونُ

## کامە شوێن دەبێتە شوێنی شایستەی هەڵگرتنی ماڵ و سامان و کامەیش شایستە نییە

٥١٣. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ امْرَأَةً سَرَقَتْ فَأُتِيَ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ فَقَالُوا: مَنْ يَجْتَرِئُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ أُسَامَةَ، فَكَلَّمُوا أُسَامَةَ فَكَلَّمَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أُسَامَةُ، إِنَّمَا هَلَكَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ حِينَ كَانُوا إِذَا أَصَابَ الشَّرِيفُ فِيهِمُ الْحَدَّ، تَرَكُوهُ وَلَمْ يُقِيمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا أَصَابَ الْوَضِيعُ أَقَامُوا عَلَيْهِ، لَوْ كَانَتْ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ لَقَطَعْتُهَا».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک دزی کرد هێنرا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتیان: کێ بوێری ئەوە دەکات بچێت بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ مەگەر ئوسامە، جا قسەیان لەگەڵ ئوسامەدا کرد، ئەویش قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «ئەی ئوسامە، بێگومان نەوەکانی ئیسرائیل بەهۆی ئەوەوە لەناو چوون کاتێك کە کەسێکی بەڕێز کارێکی خراپی بکردایە حەددیان بەسەردا جێبەجێ نەدەکرد و وازیان لێ دەهێنا، وە ئەگەر کەسێکی لاواز و بێکەس کارێکی خراپی بکردایە حەددیان بەسەردا جێبەجێ دەکرد، ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد بووایە دەستیم دەبڕی».

٥١٤. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يُقْطَعُ السَّارِقُ إِلَّا فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «دەستی دز دەبڕدرێت لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرە و سەرەوە».

## بَابُ مَا لَا قَطْعَ فِيهِ

### باسی دزینی ئەو شتەی دەستبڕینی تێدا نییە

٥١٥. عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ».

ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «دەستبڕین لە بەرووبوومی هەڵواسراودا نییە (کە بەسەر دارەکەوە بێت پێش ئەوەی لە شوێنی تایبەت بە خۆی هەڵبگیرێت)، وە لە ئەو شتە سپییەی کە لە نێوەڕاستی دارخورمادایە و دەخورێت».

# كِتَابُ الْإِيمَانِ وَشَرَائِعِهِ

## پەرتووكی بڕوا (ئیمان) و یاسا و ڕێساكانی



### ذِكْرُ أَفْضَلِ الْأَعْمَالِ

### باسی چاكترینی كردەوەكان

٥١٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُبْشِيٍّ الْخَثْعَمِيِّ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ: أَيُّ الْأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ: «إِيمَانٌ لَا شَكَّ فِيهِ، وَجِهَادٌ لَا غُلُولَ فِيهِ، وَحَجَّةٌ مَبْرُورَةٌ».

عەبدوڵڵای كوڕی حوبشی خەسعەمی ﵁ دەگێڕێتەوە: پرسیار كرا لە پێغەمبەر ﷺ كام لە كردەوەكان چاكترینە؟ فەرمووی: «بڕواهێنانێك هیچ گومانێكی تێدا نەبێت، وە جیهادێك هیچ دزییەكی تێدا نەبێت، هەروەها حەجێكی وەرگیراویش».

# صِفَةُ الْإِيمَانِ وَالْإِسْلَامِ

## سیفاتی ئیمان و ئیسلام

٥١٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَأَبِي ذَرٍّ رضي الله عنهما قَالَا: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجْلِسُ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ أَصْحَابِهِ، فَيَجِيءُ الْغَرِيبُ فَلَا يَدْرِي أَيُّهُمْ هُوَ حَتَّى يَسْأَلَ، فَطَلَبْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَجْعَلَ لَهُ مَجْلِساً يَعْرِفُهُ الْغَرِيبُ إِذَا أَتَاهُ، فَبَنَيْنَا لَهُ دُكَّاناً مِنْ طِينٍ، كَانَ يَجْلِسُ عَلَيْهِ، وَإِنَّا لَجُلُوسٌ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَجْلِسِهِ، إِذْ أَقْبَلَ رَجُلٌ أَحْسَنُ النَّاسِ وَجْهاً، وَأَطْيَبُ النَّاسِ رِيحاً، كَأَنَّ ثِيَابَهُ لَمْ يَمَسَّهَا دَنَسٌ، حَتَّى سَلَّمَ فِي طَرَفِ الْبِسَاطِ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا مُحَمَّدُ، فَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلَامُ، قَالَ: أَدْنُو يَا مُحَمَّدُ، قَالَ: «ادْنُهْ»، فَمَا زَالَ يَقُولُ: أَدْنُو مِرَاراً، وَيَقُولُ لَهُ: «ادْنُ»، حَتَّى وَضَعَ يَدَهُ عَلَى رُكْبَتَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَخْبِرْنِي مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ: «الْإِسْلَامُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ، وَلَا تُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ»، قَالَ: إِذَا فَعَلْتُ ذَلِكَ فَقَدْ أَسْلَمْتُ؟ قَالَ: «نَعَمْ»، قَالَ: صَدَقْتَ. فَلَمَّا سَمِعْنَا قَوْلَ الرَّجُلِ صَدَقْتَ أَنْكَرْنَاهُ، قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَخْبِرْنِي مَا الْإِيمَانُ؟ قَالَ: «الْإِيمَانُ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَالْكِتَابِ، وَالنَّبِيِّينَ، وَتُؤْمِنُ بِالْقَدَرِ»، قَالَ: فَإِذَا فَعَلْتُ ذَلِكَ فَقَدْ آمَنْتُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَعَمْ»، قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَخْبِرْنِي مَا الْإِحْسَانُ؟ قَالَ: «أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ»، قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَخْبِرْنِي مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: فَنَكَسَ فَلَمْ يُجِبْهُ شَيْئاً، ثُمَّ أَعَادَ، فَلَمْ يُجِبْهُ شَيْئاً، ثُمَّ أَعَادَ فَلَمْ يُجِبْهُ شَيْئاً، وَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: «مَا الْمَسْؤُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، وَلَكِنْ لَهَا عَلَامَاتٌ تُعْرَفُ بِهَا، إِذَا رَأَيْتَ الرِّعَاءَ الْبُهُمَ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ، وَرَأَيْتَ الْحُفَاةَ الْعُرَاةَ مُلُوكَ الْأَرْضِ، وَرَأَيْتَ الْمَرْأَةَ تَلِدُ رَبَّهَا، خَمْسٌ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا اللَّهُ: {إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ}، إِلَى قَوْلِهِ: {إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ} لقمان: ٣٤»، ثُمَّ قَالَ: «لَا وَالَّذِي بَعَثَ مُحَمَّداً بِالْحَقِّ هُدًى وَبَشِيراً، مَا كُنْتُ بِأَعْلَمَ بِهِ مِنْ رَجُلٍ مِنْكُمْ، وَإِنَّهُ لَجِبْرِيلُ عليه السلام نَزَلَ فِي صُورَةِ دِحْيَةَ الْكَلْبِيِّ».

ئەبو هورەیرە و ئەبو زەر رضي الله عنهما دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان هاوەڵەکانیدا

دادەنیشت، کەسێکی نەناسراو دەهات نەیدەزانی کامەیان ئەوە هەتا پرسیاری لێ بکات، داوامان کرد شوێنێک بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابنێین کاتێك کەسێکی نەناسراو دێت بیناسێتەوە، جێگایەکمان بۆی دروست کرد لە قوڕ لەسەری دادەنیشت، ئێمە دادەنیشتین پێغەمبەری خوا ﷺ لە شوێنەکەی خۆی دادەنیشت، لەناکاو پیاوێک هات جوانترین ڕوخساری هەبوو، خۆشترین بۆنیشی لێ دەهات، جلەکانی هیچ پیسییەکی پێوە دیار نەبوو، هەتا لە تەنیشت ڕاخەرەکە جێگیر بوو، گوتی: سڵاوی خوات لێ بێت ئەی موحەممەد، وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە، گوتی: نزیک بەرەوە ئەی موحەممەد، فەرمووی: «نزیکی بکەنەوە»، بەردەوام چەند جارێک گوتی: نزیک بەرەوە، ئەویش پێی دەفەرموو: «نزیک بەرەوە»، هەتا دەستی خستە سەر ئەژنۆی پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی موحەممەد هەواڵم بدەرێ ئیسلام چییە؟ فەرمووی: «ئیسلام ئەوەیە خوا بپەرستیت و هاوەڵی بۆ دانەنێیت، نوێژەکانیشت بەچاکی ئەنجام بدەیت و زەکاتی ماڵەکەیشت دەربکەیت و حەجی ماڵی خوا بکەیت و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیش بگریت»، گوتی: ئەگەر ئەوەم کرد ئەوا موسوڵمان دەبم؟ فەرمووی: «بەڵێ»، گوتی: ڕاستت فەرموو. کاتێ بیستمان پیاوەکە گوتی: ڕاستت فەرموو، سەرمان لێی سووڕ ما، گوتی: هەواڵم بدەرێ بڕواهێنان چییە؟ فەرمووی: «بڕوا بە خوا بهێنیت، وە بە فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی، وە بڕوا بهێنیت بە قەزا و قەدەر»، گوتی: ئەگەر ئەوەم کرد ئەوا بڕوام هێناوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەڵێ»، گوتی: ڕاستت فەرموو، گوتی: ئەی موحەممەد هەواڵم بدەرێ ئیحسان چییە؟ فەرمووی: «خوا بپەرستیت هەر وەک ئەوەی دەیبینیت، ئەگەر تۆش ئەو نەبینیت بێگومان ئەو تۆ دەبینێت»، گوتی: ڕاستت فەرموو، گوتی: ئەی موحەممەد هەواڵم بدەرێ کەی ڕۆژی دوایی دێت؟ (ڕاوی) گوتی: سەری داخست و هیچ وەڵامی نەدایەوە، پاشان دووبارەی کردەوە، هیچ وەڵامی نەدایەوە، پاشان دووبارەی کردەوە، هیچ وەڵامی نەدایەوە، ئینجا سەری بەرز کردەوە و فەرمووی: «پرسیارلێکراو هەر ئەوەندەی پرسیارکەری لێ دەزانێت، بەڵام چەند نیشانەیەکی هەیە پێی دەناسرێتەوە، ئەگەر بینیت شوانی ئاژەڵ خانووەکانیان بەرز دەکەنەوە قات لە سەر قات، خەڵکانی پێخاوس و پێپەتی و ڕووتوقووتیش بوون بە

پاشای سەر زەوی، بینیشت کەنیزەک منداڵی دەبێت لە گەورەکەی و منداڵەکەی دەبێتە سەید و گەورەی دایکی، پێنج شت هەن کەس نایانزانێت جگە لە خوا: {إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ}، واتە: بەڕاستی لای خوایە زانیاری کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی. هەتا فەرمایشتی خوا ﷻ: {إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ}، واتە: بەڕاستی خوا زانا و ئاگادارە». پاشان فەرمووی: «نەخێر، سوێند بەو خوایەی موحەممەدی بەهەق ناردووە بۆ ڕێنمایی و مژدەدان، منیش هەر ئەوەندەی یەکێک لە ئێوەی لێ دەزانم، بەڕاستی ئەوە جیبریل عليه السلام بوو دابەزیی لەسەر شێوەی پیاوێک بە ناوی دیحیەی کەلبی».

تَأْوِيلُ قَوْلِهِ ﷻ: {قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا} الحجرات: ١٤



## تەفسیری فەرمایشتی خوا ﷻ: {قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا}

٥١٨. عَنْ سَعْدٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَسَمَ قَسْماً، فَأَعْطَى نَاساً، وَمَنَعَ آخَرِينَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَعْطَيْتَ فُلَاناً، وَمَنَعْتَ فُلَاناً، وَهُوَ مُؤْمِنٌ؟ قَالَ: «لَا تَقُلْ مُؤْمِنٌ، وَقُلْ مُسْلِمٌ»، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: {قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا} الحجرات: ١٤.

سەعد رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستکەوتێکی دابەش کرد، بە خەڵکانێکی بەخشی و بە خەڵکانێکی دیکەی نەبەخشی، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، بە فڵانە کەست بەخشی و بە فڵانت نەبەخشی، ئەویش بڕوادارە، فەرمووی: «مەڵێ بڕوادارە، بڵێ موسوڵمانە، (چونکە ئیمان پەیوەستە بە دڵەوە، بەڵام ئیسلام پەیوەستە بە ڕواڵەتەوە، بۆیە هیچ کەس ناتوانێت حوکم بدات بەسەر دڵی کەسێکی دیکەدا)». ئیبن شیهاب دەڵێت: {قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا}، واتە: دەشتەکییەکان گوتیان: بڕوامان هێنا.

## صِفَةُ الْمُؤْمِنِ

### سیفەتی بڕوادار

٥١٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ النَّاسُ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ عَلَى دِمَائِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «موسوڵمان ئەو کەسەیە خەڵکی پارێزراو بن لە زمان و دەستی، بڕواداریش ئەو کەسەیە خەڵکی دڵنیا بن لێی لە خوێن و ماڵ و سامانیان».

## صِفَةُ الْمُسْلِمِ

### سیفەتی موسوڵمان

٥٢٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «موسوڵمان ئەو کەسەیە موسوڵمانان پارێزراو بن لە زمان و دەستی، کۆچکەریش ئەو کەسەیە لەو شتە کۆچ بکات کە خوا قەدەغەی کردوە».

٥٢١. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى صَلَاتَنَا، وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا، وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا فَذَلِكُمُ الْمُسْلِمُ».

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك وەکوو ئێمە نوێژی کرد و ڕووی لە قیبلەکەمان کرد و سەربڕاوەکانمانی خوارد، ئەوە موسوڵمانە».

## حُسْنُ إِسْلَامِ الْمَرْءِ

## چاکی و جوانیی ئیسلامەتیی مرۆڤ

٥٢٢. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَسْلَمَ الْعَبْدُ فَحَسُنَ إِسْلَامُهُ، كَتَبَ اللَّهُ لَهُ كُلَّ حَسَنَةٍ كَانَ أَزْلَفَهَا، وَمُحِيَتْ عَنْهُ كُلُّ سَيِّئَةٍ كَانَ أَزْلَفَهَا، ثُمَّ كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ الْقِصَاصُ، الْحَسَنَةُ بِعَشْرَةِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ، وَالسَّيِّئَةُ بِمِثْلِهَا إِلَّا أَنْ يَتَجَاوَزَ اللَّهُ ﷻ عَنْهَا».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر بەندە موسوڵمان بوو، بە شێوەیەکی چاک هەم بە دڵ و هەم بە لاشە، خوا هەموو چاکەیەکی بۆ دەنووسێت کە لە سەردەمی بێبڕواییدا کردوویەتی، وە هەموو گوناهێکی بۆ دەسڕێتەوە کە پێشتر ئەنجامی دابێت، پاشان دوای ئەوە بە هاوشێوەبوونە، چاکەیەک بەرانبەرە بە دە ئەوەندە هەتا حەود سەد ئەوەندە، خراپەیەکیش بە وێنەی خۆی مەگەر خوا ﷻ چاوپۆشی لێ بکات».



## ذِكْرُ شُعَبِ الْإِيمَانِ

## باسی بەش و پلەکانی ئیمان

٥٢٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئیمان حەفتا و ئەوەندە بەشە، شەرم و حەیاش بەشێکە لە ئیمان».

تێبینی:

(بِضْع): لە زمانی عەرەبیدا ژمارە سێ (٣) بۆ نۆ (٩)، واتە: (٣،٤،٥،٦،٧،٨،٩) هەمووی دەگرێتەوە.

٥٢٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً، أَفْضَلُهَا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَوْضَعُهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئیمان حەفتا و ئەوەندە بەشە، چاکترین و باڵاترینیان (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه)یە، کەمترینیشیان لابردنی ئاستەنگێکە لەسەر ڕێگا، شەرم و حەیاش بەشێکە لە ئیمان».

## تَفَاضُلُ أَهْلِ الْإِيمَانِ

### جیاوازیی بڕواداران لە پلەکانی بڕوادا

٥٢٥. عَنْ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مُلِئَ عَمَّارٌ إِيمَانًا إِلَى مُشَاشِهِ».

عەمری کوڕی شورەحبیل دەگێڕێتەوە: لە پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «عەممار ئیمانی پڕ بووە لە نووکی پێیەوە تا سەری».

## زِيَادَةُ الْإِيمَانِ

### زیادبوونی ئیمان

٥٢٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مُجَادَلَةُ أَحَدِكُمْ فِي الْحَقِّ، يَكُونُ لَهُ فِي الدُّنْيَا بِأَشَدَّ مُجَادَلَةً مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لِرَبِّهِمْ فِي إِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ

أُدْخِلُوا النَّارَ». قَالَ: «يَقُولُونَ: رَبَّنَا إِخْوَانُنَا كَانُوا يُصَلُّونَ مَعَنَا، وَيَصُومُونَ مَعَنَا وَيَحُجُّونَ مَعَنَا، فَأَدْخَلْتَهُمُ النَّارَ؟»، قَالَ: «فَيَقُولُ: اذْهَبُوا فَأَخْرِجُوا مَنْ عَرَفْتُمْ مِنْهُمْ»، قَالَ: «فَيَأْتُونَهُمْ فَيَعْرِفُونَهُمْ بِصُوَرِهِمْ فَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ النَّارُ إِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ إِلَى كَعْبَيْهِ، فَيُخْرِجُونَهُمْ فَيَقُولُونَ: رَبَّنَا قَدْ أَخْرَجْنَا مَنْ أَمَرْتَنَا». قَالَ: «وَيَقُولُ: أَخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ دِينَارٍ مِنَ الْإِيمَانِ، ثُمَّ قَالَ: مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ نِصْفِ دِينَارٍ حَتَّى يَقُولَ: مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ ذَرَّةٍ». قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْ فَلْيَقْرَأْ هَذِهِ الْآيَةَ: {إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ}، إِلَى: {عَظِيمًا} النساء: ٤٨.

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «یەکێک لە ئێوە چەندە مشتومڕ و داکۆکی لە هەق دەکات لە دونیادا، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا سەختتر داکۆکی دەکەن لە پەروەردگاریان لەبارەی ئەو برایانەیان کە چوونەتە نێو ئاگرەوە»، فەرمووی: «دەڵێن: پەروەردگارمان براکانمان لەگەڵ ئێمەدا نوێژیان دەکرد و ڕۆژوویان لەگەڵمان دەگرت و حەجیان لەگەڵماندا ئەنجام دەدا، تۆیش ئەوانت خستۆتە نێو ئاگرەوە؟»، فەرمووی: «دەفەرموێت: بڕۆن کێ دەناسن لێیان دەریانبهێنن»، فەرمووی: «دەچن بۆ لایان بە شێوەیان دەیانناسنەوە، هەندێکیان ئاگر تا نیوەی قاچی ڕۆیشتووە، هەندێکیان تا پاژنەی پێی، جا دەریاندەهێنن و دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان دەرمانبهێنە لەو شوێنەی فەرمانت پێ کردووین»، فەرمووی: «خوا ﷻ دەفەرموێت: دەربچن ئەوەی بەئەندازەی کێشی دینارێک ئیمان لە دڵیدایە، پاشان فەرمووی: هەر کەس بەئەندازەی کێشی نیو دینار، هەتا دەفەرموێت: هەر کەس بەئەندازەی کێشی دانەوێڵەیەک لە دڵیدایە». ئەبو سەعید دەڵێ: هەر کەس بڕوا ناکات با ئەم ئایەتە بخوێنێتەوە: {إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ}، واتە: بێگومان خوا خۆش نابێت هاوبەشی بۆ دابنرێت، جگە لەوە لە هەموو تاوانەکانی دیکە خۆش دەبێت بۆ هەر کەس ویستی لەسەر بێت. هەتا: {عَظِيمًا}.

## عَلَامَةُ الْإِيمَانِ

### نيشانەی بڕواداری

٥٢٧. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَلَدِهِ، وَوَالِدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ».

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ یەکێک لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێت هەتا من لەلای خۆشەویستتر نەبم لە ماڵ و منداڵ و دایك و باوك و خەڵکی بەگشتی».

٥٢٨. عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ مِنَ الْخَيْرِ».

ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سوێند بەو خوایەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، هیچ یەکێک لە ئێوە ئیمانی تەواو نییە هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێیخۆشە لە خێر و چاکە بۆ براکەشی پێیخۆش نەبێت».

٥٢٩. عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: إِنَّهُ لَعَهْدُ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ ﷺ إِلَيَّ: «أَنَّهُ لَا يُحِبُّكَ إِلَّا مُؤْمِنٌ، وَلَا يَبْغُضُكَ إِلَّا مُنَافِقٌ».

عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری نەخوێندەوار ﷺ پەیمانی پێ دام: «هیچ کەسێك تۆی خۆش ناوێت جگە لە بڕوادار، هیچ کەسێکیش ڕقی لە تۆ نابێت جگە لە دووڕوو».

## أَحَبُّ الدِّينِ إِلَى اللَّهِ ﷻ

### خۆشەویستترین (شێوەی) ئاییندارى لای خوا ﷻ

٥٣٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا امْرَأَةٌ، فَقَالَ: «مَنْ هَذِهِ؟»، قَالَتْ: فُلَانَةُ، لَا تَنَامُ تَذْكُرُ مِنْ صَلَاتِهَا. فَقَالَ: «مَهْ، عَلَيْكُمْ مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ، فَوَاللَّهِ لَا يَمَلُّ اللَّهُ ﷻ حَتَّى تَمَلُّوا»، وَكَانَ أَحَبَّ الدِّينِ إِلَيْهِ مَا دَامَ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لای ئافرەتێکی لەلا بوو، فەرمووی: «ئەمە کێیە؟»، گوتی: فڵانە کەس، بەردەوام خەریکی نوێژکردنە، فەرمووی: «بێدەنگ بە و وەسفی مەکە، ئەوەی لە توانا‌تاندایە ئەوە ئەنجام بدەن، سوێند بە خوا، بەڕاستی خوا بێزار نابێت تا ئێوە بێزار دەبن»، خۆشەویستترین پەرستش لای پێغەمبەر ﷺ ئەوە بووە کە خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام بێت.



## مَثَلُ الْمُنَافِقِ

### نموونەی (مرۆڤی) دووڕوو

٥٣١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَثَلُ الْمُنَافِقِ كَمَثَلِ الشَّاةِ الْعَائِرَةِ بَيْنَ الْغَنَمَيْنِ، تَعِيرُ فِي هَذِهِ مَرَّةً، وَفِي هَذِهِ مَرَّةً، لَا تَدْرِي أَيَّهَا تَتْبَعُ».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نموونەی دووڕوو وەکوو نموونەی کاوڕێکە بیەوێت بەران بگرێت لە نێوان دوو ڕانەمەڕدا، جارێك دەچێت بۆ لای ئەم ڕانەمەڕە جارێکی دیکە بۆ لای ئەو ڕانەمەڕەکە، نازانێت شوێنی کامەیان بکەوێت. (دووڕووش بە ڕواڵەت لەگەڵ موسوڵمانانە، بە دڵیش لەگەڵ بێبڕوایانە)».

## مَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مِنْ مُؤْمِنٍ وَمُنَافِقٍ

### نموونەی قورئانخوێندنی (مرۆڤی) بڕوادار و (مرۆڤی) دووڕوو

٥٣٢. عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، مَثَلُ الْأُتْرُجَّةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَرِيحُهَا طَيِّبٌ، وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، كَمَثَلِ التَّمْرَةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَلَا رِيحَ لَهَا، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، كَمَثَلِ الرَّيْحَانَةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ، وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ طَعْمُهَا مُرٌّ، وَلَا رِيحَ لَهَا».

ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نموونەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان دەخوێنێت، وەکوو پرتەقاڵ وایە تامی خۆشە و بۆنیشی خۆشە، وە نموونەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان ناخوێنێت، وەکوو خورما وایە تامی خۆشە و بۆنی نییە، وە نموونەی ئەو دووڕووەی کە قورئان دەخوێنێت وەکوو ڕەیحانە وایە بۆنی خۆشە و تامی تاڵە، وە نموونەی ئەو دووڕووەی کە قورئان ناخوێنێت، وەکوو گوژاڵک وایە تامی تاڵە و بۆنی نییە».

# كِتَابُ الزِّينَةِ

## پەرتووکی خۆڕازاندنەوە



### التَّرَجُّلُ غِبًّا

#### شانەکردنی قژ ڕۆژ نا ڕۆژێک

٥٣٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ التَّرَجُّلِ إِلَّا غِبًّا.

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لە سەرشانەکردن (بەبەردەوامی) مەگەر ڕۆژێک سەر شانە بکات و ڕۆژێک شانەی نەکات.

### الْإِذْنُ بِالْخِضَابِ

#### ڕێگەدان بە بۆیەکردنی قژ

٥٣٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْيَهُودُ، وَالنَّصَارَى لَا تَصْبُغُ فَخَالِفُوهُمْ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جوولەکە و گاور قژ بۆیە ناکەن، ئێوە پێچەوانەیان بکەن (قژتان بۆیە بکەن)».

## الْخِضَابُ بِالْحِنَّاءِ وَالْكَتَمِ

### بۆیەکردن بە خەنە و ئوزمە

٥٣٥. عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَفْضَلُ مَا غَيَّرْتُمْ بِهِ الشَّمَطَ الْحِنَّاءُ وَالْكَتَمُ».

ئەبو زەڕ رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «چاکترین شتێک کە پیری پێ بگۆڕن خەنە و ئوزمەیە».



## الْوَاصِلَةُ

### قژبەستەر

٥٣٦. عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَعَنَ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ.

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردووە لەو کەسەی قژێکی دروستکراو دەبەستێ بە قژێکی دیکەوە، ئەو کەسەش بۆی دەبەسترێت (یان بۆ دەچێنرێت).

✎ تێبینی:

(الْوَاصِلَة): ئەو کەسەیە قژێکی دروستکراو دەبەستێت بە قژێکی دیکەوە، یەکسانە بیبەستێت بە قژی خۆیەوە یان قژی کەسێکی دیکە.

## الدُّهْنُ

قژ چەورکردن

٥٣٧. عَنْ سِمَاكٍ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ ﵁ سُئِلَ عَنْ شَيْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ إِذَا ادَّهَنَ رَأْسَهُ لَمْ يُرَ مِنْهُ، وَإِذَا لَمْ يُدَّهَنْ رُئِيَ مِنْهُ.

سیماک دەڵێت: گوێم لە جابیری کوڕی سەموڕە ﵁ بوو، پرسیاری لێ کرا لەبارەی مووی سپی پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: کاتێك قژی چەور بکردایە پێیەوە دیار نەبوو، وە ئەگەر چەوری نەکردایە پێیەوە دیار بوو.

## النَّهْيُ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَشْهَدَ الصَّلَاةَ إِذَا أَصَابَتْ مِنَ الْبَخُورِ

ڕێگریکردنی ئافرەت لە ئامادەبوونی نوێژی بەکۆمەڵ
ئەگەر بۆنی خۆشی لە خۆی دابوو

٥٣٨. عَنْ زَيْنَبَ الثَّقَفِيَّةِ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا خَرَجَتِ الْمَرْأَةُ إِلَى الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ، فَلَا تَمَسَّ طِيبًا».

زەینەب سەقەفییە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێک لە ئێوە ئامادەی نوێژی عیشا بوو با بۆنی خۆش لە خۆی نەدات».

## تَحْرِيمُ الذَّهَبِ عَلَى الرِّجَالِ

قەدەغەکردنی زێڕ لەسەر پیاوان

٥٣٩. عَنْ عَلِيِّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﵁ يَقُولُ: إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ أَخَذَ حَرِيرًا، فَجَعَلَهُ فِي يَمِينِهِ،

وَأَخَذَ ذَهَبًا فَجَعَلَهُ فِي شِمَالِهِ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ هَذَيْنِ حَرَامٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ حەریرێکی گرت بەدەستەوە و لەلای ڕاستی داینا، زێڕێکیشی گرت بەدەستەوە و لە لای چەپی داینا، پاشان فەرمووی: «بەڕاستی ئەم دووانە خوا قەدەغەی کردووە لەسەر نێرینەی ئوممەتەکەم».

## خَاتَمُ الذَّهَبِ

### ئەنگوستیلەی زێڕ



٥٤٠. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَمَ الذَّهَبِ، فَلَبِسَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَاتَّخَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَ الذَّهَبِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي كُنْتُ أَلْبَسُ هَذَا الْخَاتَمَ، وَإِنِّي لَنْ أَلْبَسَهُ أَبَدًا»، فَنَبَذَهُ، فَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی لە زێڕ پێ بوو لە دەستی کرد، خەڵکیش ئەنگوستیلەی زێڕیان لەدەست کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەم ئەنگوستیلەیەم لەدەست کرد، بەڵام ئیدی هەرگیز لەدەستی ناکەم، لەدەستی دایکەند، خەڵکەکەش لەدەستیان دایانکەند».

## النَّهْيُ عَنِ الْخَاتَمِ فِي السَّبَّابَةِ

### ڕێگریکردن لە لەدەستکردنی ئەنگوستیلە لە پەنجەی شایەتومان و نێوەڕاست

٥٤١. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْخَاتَمِ فِي هَذِهِ وَهَذِهِ -يَعْنِي السَّبَّابَةَ وَالْوُسْطَى-.

عەلی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێ کردم ئەنگوستیلە بکەمە ئەم پەنجە و ئەو پەنجەمە، -واتە: پەنجەی شایەتومان و نێوەڕاست-.

٥٤٢. عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فِي ثَوْبٍ دُونٍ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «أَلَكَ مَالٌ؟»، قَالَ: نَعَمْ، مِنْ كُلِّ الْمَالِ، قَالَ: «مِنْ أَيِّ الْمَالِ؟»، قَالَ: قَدْ آتَانِي اللَّهُ مِنَ الْإِبِلِ، وَالْغَنَمِ، وَالْخَيْلِ، وَالرَّقِيقِ، قَالَ: «فَإِذَا آتَاكَ اللَّهُ مَالاً، فَلْيُرَ عَلَيْكَ أَثَرُ نِعْمَةِ اللَّهِ وَكَرَامَتِهِ».

ئەبو ئەحوەص لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ پۆشاکێکی کۆن و بێنرخی لەبەر کردبوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «ئایا ماڵ و سامانت هەیە؟»، گوتی: بەڵێ لە هەموو جۆرە ماڵ و سامانێکم هەیە، فەرمووی: «لە چی ماڵێکت هەیە؟»، گوتی: خوا ماڵ و سامانی پێ بەخشیوم لە وشتر و مەڕوماڵات و ئەسپ و کۆیلە، فەرمووی: «ئەگەر خوا ماڵ و سامانێکی پێ بەخشیت با شوێنەواری نیعمەت و ڕێزگرتنی خوا پێتەوە دەربکەوێت، (پۆشاکێکی جوان بپۆشە هەتا خەڵکی بزانن خوا ناز و نیعمەتی خۆی ڕشتووە بەسەرتدا)».



## تَسْكِينُ الشَّعْرِ

## ڕێکخستنی قژ

٥٤٣. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَتَانَا النَّبِيُّ ﷺ فَرَأَى رَجُلاً ثَائِرَ الرَّأْسِ فَقَالَ: «أَمَا يَجِدُ هَذَا مَا يُسَكِّنُ بِهِ شَعْرَهُ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان پیاوێکی بینی قژی بژ و ئاڵۆز بوو، فەرمووی: «ئایا ئەمە شتێکی لا نەبووە قژی پێ ڕێک بخات».

## وَصْلُ الشَّعْرِ بِالْخِرَقِ

### لکاندنی پەڕۆ بە قژەوە (بۆئەوەی قژی زۆر دەربکەوێت)

٥٤٤. عَنْ مُعَاوِيَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الزُّورِ، وَالزُّورُ الْمَرْأَةُ تَلُفُّ عَلَى رَأْسِهَا.

موعاویە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لەوەی ئافرەت لە دواوە قژی دەکات بە تۆپەڵە (وەکوو کۆپانەی وشتر دەردەکەوێت).

## تَحْرِيمُ لُبْسِ الذَّهَبِ

### قەدەغەکردنی پۆشینی زێڕ



٥٤٥. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ أَحَلَّ لِإِنَاثِ أُمَّتِي الْحَرِيرَ وَالذَّهَبَ، وَحَرَّمَهُ عَلَى ذُكُورِهَا».

ئەبو مووسا ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا حەریر و زێڕی حەڵاڵ کردووە بۆ مێینەی ئوممەتەکەم، قەدەغەی کردووە لەسەر نێرینەکانی».

## طَرْحُ الْخَاتَمِ وَتَرْكُ لُبْسِهِ

### فڕێدانی ئەنگوستیلە و وازهێنان لە لەدەستکردنی

٥٤٦. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اتَّخَذَ خَاتَمًا فَلَبِسَهُ قَالَ: «شَغَلَنِي هَذَا عَنْكُمْ مُنْذُ الْيَوْمَ، إِلَيْهِ نَظْرَةٌ، وَإِلَيْكُمْ نَظْرَةٌ ثُمَّ أَلْقَاهُ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەیەکی دروست کرد،

پاشان لەدەستی کرد، فەرمووی: «ئەمە بەدرێژایی ئەمڕۆ منی سەرقاڵ کرد لە ئێوە، جارێک تەماشای ئەمەم دەکرد و جارێکیش تەماشای ئێوە، پاشان دایکەند».

## لُبْسُ الْحُلَلِ

## پۆشینی (پۆشاکی) حولەل

٥٤٧. عَنِ الْبَرَاءِ ﵁ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ مُتَرَجِّلاً لَمْ أَرَ قَبْلَهُ، وَلَا بَعْدَهُ أَحَدًا هُوَ أَجْمَلُ مِنْهُ.

بەڕاء ﵁ دەڵێت: پێغەمبەرم ﷺ بینی تاخمە جلێکی سووری پۆشیبوو، قژیشی شانە کردبوو، هەرگیز نە لەپێش ئەو نە لەدوای ئەو لەو جوانترم نەبینیبوو.



تێبینی:

(الْحُلَل): بریتییە لەو پۆشاکەی کە هەموو لاشە سەرتاپا دادەپۆشێت.

## الْأَمْرُ بِلُبْسِ الْبِيضِ مِنَ الثِّيَابِ

## فەرمانکردن بە پۆشینی پۆشاکی سپی

٥٤٨. عَنْ سَمُرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِالْبَيَاضِ مِنَ الثِّيَابِ فَلْيَلْبَسْهَا أَحْيَاؤُكُمْ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ، فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ».

سەمورە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پێویستە پۆشاکی سپی بەکار بهێنن، با زیندووەکانتان بیپۆشن، مردووەکانتانیشی پێ کفن بکەن، چونکە پۆشاکی سپی چاکترینی نێو پۆشاکەکانتانە».

## إِسْبَالُ الْإِزَارِ

### درێژکردنی دەرقاچە

٥٤٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ مِنَ الْخُيَلَاءِ لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»، قَالَ أَبُو بَكْرٍ رضي الله عنه: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَحَدَ شِقَّيْ إِزَارِي يَسْتَرْخِي إِلَّا أَنْ أَتَعَاهَدَ ذَلِكَ مِنْهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّكَ لَسْتَ مِمَّنْ يَصْنَعُ ذَلِكَ خُيَلَاءَ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك پۆشاکی شۆڕ بکات لەبەر لووتبەرزی، خوا لە ڕۆژی دواییدا تەماشای ناکات»، ئەبو بەکر رضي الله عنه گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من لایەکی پۆشاکەکەم شۆڕ دەبێتەوە، مەگەر هەمیشە ئاگام لێ بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «تۆ لەو کەسانە نیت بەلووتبەرزی ئەو کارە بکەی».



## إِرْخَاءُ طَرَفِ الْعِمَامَةِ بَيْنَ الْكَتِفَيْنِ

### شۆڕکردنەوەی لایەکی مێزەر بە نێوان هەردوو شاندا

٥٥٠. عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ السَّاعَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ قَدْ أَرْخَى طَرَفَهَا بَيْنَ كَتِفَيْهِ.

جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەییە لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: هەر وەکوو ئەوە وایە ئێستا تەماشای ئەو کاتە بکەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر بوو، مێزەرێکی ڕەشی لەسەردا بوو، تەنیشتی مێزەرەکەی شۆڕ کردبووەوە لە نێوان هەردوو شانیدا.

# كِتَاب آدَابِ الْقُضَاةِ

# پەرتووکی هەڵسوکەوتی دادوەرەکان



## فَضْلُ الْحَاكِمِ الْعَادِلِ فِي حُكْمِهِ

### فەزڵ و چاکەی حاکمی دادپەروەر لە حوکم و بڕیاریدا

٥٥١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَ اللَّهِ تَعَالَى عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ، عَلَى يَمِينِ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَأَهْلِيهِمْ وَمَا وَلُوا».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی دادپەروەران لای خوا لەسەر مینبەری نوورینن، لەلای ڕاستی خوای بەڕەحمن ئەوانەی دادپەروەرن لە حوکم و بڕیاریاندا، لە خانەوادەیاندا، ئەوەشی لەژێر دەستیاندایە».

## الْإِمَامُ الْعَادِلُ

### پێشەوا و سەرکردەی دادپەروەر

٥٥٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ ﷻ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ: إِمَامٌ عَادِلٌ، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ اللَّهِ ﷻ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ فِي خَلَاءٍ فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، وَرَجُلٌ كَانَ قَلْبُهُ مُعَلَّقًا فِي الْمَسْجِدِ، وَرَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ ﷻ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ إِلَى نَفْسِهَا فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ ﷻ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ، فَأَخْفَاهَا حَتَّى لَا تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا صَنَعَتْ يَمِينُهُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «حەوت کۆمەڵە هەن خوا ﷻ لە سێبەری خۆیدا دەیانپارێزێت، ڕۆژێک هیچ سێبەرێک نییە جگە لە سێبەری خۆی، (ئەوانیش): پێشەوایەکی دادپەروەر، گەنجێک پێگەیشتبێت لە پەرستشی خوادا، پیاوێک لە چۆڵیدا یادی خوا بکات و فرمێسک لە چاوانی بێنە خوارەوە، پیاوێک دڵی پەیوەست بێت بە مزگەوتەوە، دوو کەسیش لەپێناو خوادا یەکدییان خۆش بوێت، پیاوێک ئافرەتێکی خاوەن پلەوپایە و جوان بانگی بکات بۆ ڕابواردن، بڵێت: من لە خوا دەترسم، پیاوێک خێر و بەخشینێک بکات، بیشارێتەوە دەستی چەپی بە دەستی ڕاستی نەزانێت».



## الْإِصَابَةُ فِي الْحُكْمِ

### پێکانی هەق لە حوکم و بڕیاردا

٥٥٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ فَأَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا اجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر دادوەر لە بڕیار و دادوەریدا کۆششی کرد بۆ ئەوەی ڕاستی بپێکێت، پاشان ڕاستیی پێکا، ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، ئەگەر کۆششی کرد و هەڵەی کرد، ئەوە یەک پاداشتی بۆ هەیە».

## بَابُ تَرْكِ اسْتِعْمَالِ مَنْ يَحْرِصُ عَلَى الْقَضَاءِ

### باسی نەبەخشینی پۆست و پلە بە کەسێك پێداگرە و داوای دەکات

٥٥٤. عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: أَتَانِي نَاسٌ مِنَ الْأَشْعَرِيِّينَ فَقَالُوا: اذْهَبْ مَعَنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَإِنَّ لَنَا حَاجَةً، فَذَهَبْتُ مَعَهُمْ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اسْتَعِنْ بِنَا فِي عَمَلِكَ؟ قَالَ أَبُو مُوسَى: فَاعْتَذَرْتُ مِمَّا قَالُوا، وَأَخْبَرْتُ أَنِّي لَا أَدْرِي مَا حَاجَتُهُمْ، فَصَدَّقَنِي، وَعَذَرَنِي، فَقَالَ: «إِنَّا لَا نَسْتَعِينُ فِي عَمَلِنَا بِمَنْ سَأَلَنَا».



ئەبو مووسا ﷺ دەڵێت: خەڵکێک لە ئەشعەرییەکان هاتن بۆ لام گوتیان: لەگەڵمان وەرە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پێویستییەکمان هەیە، منیش لەگەڵیاندا ڕۆیشتم، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بمانکە بە بەرپرس لە کاروبارەکانتدا، ئەبو مووسا گوتی: منیش داوای لێبووردنم کرد لەوەی کە گوتیان: پێم ڕاگەیاند من ئاگاداری داواکارییەکەیان نەبووم، پێغەمبەر ﷺ بڕوای پێ کردم و بیانووی بۆ هێنامەوە، پاشان فەرمووی: «ئێمە پۆست و پلە نادەین بە کەسێک داوامان لێ بکات».

## النَّهْيُ عَنِ اسْتِعْمَالِ النِّسَاءِ فِي الْحُكْمِ

### ناپەسندی بەکارهێنانی ئافرەتان بۆ دەسەڵات لە حوکم و بڕیاردا

٥٥٥. عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: عَصَمَنِي اللَّهُ بِشَيْءٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَمَّا هَلَكَ

كِسْرَى قَالَ: «مَنِ اسْتَخْلَفُوا؟»، قَالُوا: بِنْتَهُ، قَالَ: «لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمُ امْرَأَةً».

ئەبو بەکرە ﵁ دەڵێت: خوای گەورە پاراستمی (کاتێك ویستم لەبەرەی عائیشە بجەنگم دژ بە عەلی خوا لە هەموویان ڕازی بێت) بە شتێک لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستبووم، کاتێك کیسڕا لەناو چوو، فەرمووی: «کێیان کردووە بە جێنشین؟»، گوتیان: کچەکەی، فەرمووی: «گەلێک سەرکەوتوو نابێت کاروباریان بخەنە ژێر دەستی ئافرەتێک».

## الْحُكْمُ بِالتَّشْبِيهِ وَالتَّمْثِيلِ، وَذِكْرُ الِاخْتِلَافِ عَلَى الْوَلِيدِ بْنِ مُسْلِمٍ فِي حَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ



حوکم و بڕیاردان بە هاوشێوە و لەیەکچواندن، (وەک لێکچواندنی حەج بە قەرز لە ڕوانگەی ئەوەی کەسێکی نزیک لەجیاتی خاوەنەکەی جێبەجێی بکات)، وە باسی جیاوازی لەسەر وەلیدی کوڕی موسلیم لە فەرموودەی ئیبن عەبباس

٥٥٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ تَسْتَفْتِيهِ، فَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا، وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ، وَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصْرِفُ وَجْهَ الْفَضْلِ إِلَى الشِّقِّ الْآخَرِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ ﷻ عَلَى عِبَادِهِ فِي الْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا، لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَثْبُتَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: «نَعَمْ»، وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ دەڵێت: فەزلی کوڕی عەبباس لەپشت پێغەمبەری خواوە ﷺ بوو بەسەر وڵاخێکەوە، ئافرەتێک لە خەسعەم هات بۆ لای پرسیاری لێ دەکرد، لەو کاتەدا فەزل تەماشای ئافرەتەکەی دەکرد، ئافرەتەکەش تەماشای ئەوی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی فەزلی وەرچەرخاند بەلایەکی دیکەدا، ئافرەتەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، حەج فەڕزی خوایە ﷻ لەسەر بەندەکانی، لەسەر

باوكیشم فەڕز بووە، زۆر پیرە و خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێت، ئایا من حەجی بۆ بكەم؟ فەرمووی: «بەڵێ». ئەوەش لە حەجی ماڵئاواییدا بوو.

## الْحُكْمُ بِاتِّفَاقِ أَهْلِ الْعِلْمِ

## حوكم و بڕیار بە یەكدەنگیی زانایان

٥٥٧. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: أَكْثَرُوا عَلَى عَبْدِ اللَّهِ ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهُ قَدْ أَتَى عَلَيْنَا زَمَانٌ وَلَسْنَا نَقْضِي، وَلَسْنَا هُنَالِكَ، ثُمَّ إِنَّ اللَّهَ ﷻ قَدَّرَ عَلَيْنَا أَنْ بَلَغْنَا مَا تَرَوْنَ، فَمَنْ عَرَضَ لَهُ مِنْكُمْ قَضَاءٌ بَعْدَ الْيَوْمِ، فَلْيَقْضِ بِمَا فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَإِنْ جَاءَ أَمْرٌ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَلْيَقْضِ بِمَا قَضَى بِهِ نَبِيُّهُ ﷺ، فَإِنْ جَاءَ أَمْرٌ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، وَلَا قَضَى بِهِ نَبِيُّهُ ﷺ، فَلْيَقْضِ بِمَا قَضَى بِهِ الصَّالِحُونَ، فَإِنْ جَاءَ أَمْرٌ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، وَلَا قَضَى بِهِ نَبِيُّهُ ﷺ، وَلَا قَضَى بِهِ الصَّالِحُونَ، فَلْيَجْتَهِدْ رَأْيَهُ، وَلَا يَقُولُ: إِنِّي أَخَافُ، وَإِنِّي أَخَافُ، فَإِنَّ الْحَلَالَ بَيِّنٌ، وَالْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَ ذَلِكَ أُمُورٌ مُشْتَبِهَاتٌ، فَدَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لَا يَرِيبُكَ.

عەبدوڕڕەحمانی كوڕی یەزید دەڵێت: ڕۆژێك پرسیاری زۆریان كرد لە عەبدوڵڵا، عەبدوڵڵا ﷺ گوتی: سەردەمانێكی زۆرمان بەسەر برد بڕیار و فتوامان نەدەدا و لەوێ نەبووین، (چونكە خەڵك هیچ پێویستیی بە ئێمە نەبوو هاوەڵەكان هەموویان شارەزا بوون)، بەڵام خوای پەروەردگار ﷻ قەدەری وا بوو گەیشتین بەو سەردەمەی كە دەیبینن (واتە گەیشتین بە زەمانێك كە جۆرەها خەڵك و بابەت دروست بووە و پرسیاری زۆر دەكرێت)، هەر كەس لە ئێوە حوكمێكی بۆ هاتە پێش لەدوای ئەمڕۆ، با بەوە بڕیار بدات كە لە كتێبی خوادا هەیە، ئەگەر كارێك هاتە پێش لە كتێبی خوادا نەبوو، ئەوە با بەوە دادوەری بكات كە پێغەمبەری خوا ﷺ دادوەریی پێ كردووە، وە ئەگەر كارێك هاتە پێش نە لە كتێبی خوادا هاتبوو نە پێغەمبەری خواش ﷺ دادوەریی پێ كردبوو، ئەوا با بەوە بڕیار بدات كە پیاوچاكان بڕیاریان لەسەر

داوە، وە ئەگەر کارێک هاتە پێش نە لە کتێبی خوادا هاتبوو نە پێغەمبەرەکەشی ﷺ دادوەریی پێ کردبوو و نە پیاوچاکانیش بڕیاریان پێ دابوو، ئەوە با بە بۆچوونی خۆی ئیجتیهاد بکات و نەڵێت من دەترسم من دەترسم، چونکە حەڵاڵ دیارە و حەرامیش دیارە، لە نێوانی ئەو دووانەیشدا کۆمەڵە کارێکی گوماناوی هەیە، واز لەوە بهێنە کە گومانی لێ دەکەیت، وە بڕۆ بۆ لای ئەوەی گومانت لێی نییە.

## الْحُكْمُ بِالظَّاهِرِ

### حوکمدان بە ڕواڵەت

٥٥٨. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ؓ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَلْحَنُ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا، فَلَا يَأْخُذْهُ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُهُ بِهِ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ».



ئوم سەلەمە ؓ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئێوە ناکۆکییەکانتان دەهێنن بۆ لام، بێگومان منیش مرۆڤم، پێدەچێت هەندێکتان زمانی بۆ بەڵگەهێنانەوە بەهێزتر بێت لەوی دیکە، جا هەر کەس هەق و مافی براکەیم دا بە ئەو، ئەوە با وەرینەگرێت، چونکە بێگومان بەشێک لە ئاگری بۆ دەبڕم».

## حُكْمُ الْحَاكِمِ بِعِلْمِهِ

### حوکم و بڕیاری دادوەر بەپێی ئەو زانستەی کە هەیەتی

٥٥٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ؓ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «خَرَجَتِ امْرَأَتَانِ مَعَهُمَا صَبِيَّانِ لَهُمَا، فَعَدَا الذِّئْبُ عَلَى إِحْدَاهُمَا، فَأَخَذَ وَلَدَهَا فَأَصْبَحَتَا تَخْتَصِمَانِ فِي الصَّبِيِّ الْبَاقِي إِلَى دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَقَضَى بِهِ لِلْكُبْرَى مِنْهُمَا، فَمَرَّتَا عَلَى سُلَيْمَانَ فَقَالَ: كَيْفَ أَمْرُكُمَا؟

فَقَصَّتَا عَلَيْهِ، فَقَالَ: ائْتُونِي بِالسِّكِّينِ أَشُقُّ الْغُلَامَ بَيْنَهُمَا، فَقَالَتِ الصُّغْرَى: أَتَشُقُّهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَتْ: لَا تَفْعَلْ، حَظِّي مِنْهُ لَهَا، قَالَ: هُوَ ابْنُكِ فَقَضَى بِهِ لَهَا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دوو ئافرەت هەبوون دوو منداڵیان پێ بوو، گورگ هات و منداڵی یەکێکیانی برد، یەکێکیان بە ئەوی دیکەی گوت: ئەو گورگە کوڕەکەی تۆی بردووە، ئەوی دیکەشیان گوتی: کوڕەکەی تۆی برد، کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەر داود، ئەویش منداڵەکەی دا بە ئافرەتە گەورەکەیان، پاشان چوون بۆ لای پێغەمبەر سولەیمانی کوڕی داود، هەواڵیان پێ دا، ئەویش گوتی: چەقۆیەکم بۆ بێنن، منداڵەکە دەکەم بە دوو لەتەوە لە نێوانتاندا، ئافرەتە بچوکەکە گوتی: کاری وا مەکە ڕەحمەتی خوات لێ بێت، چونکە ئەوە منداڵی ئەو بوو، داودیش منداڵەکەی دا بە ئافرەتە بچووکەکە، (ڕاوی دەڵێ:) ئەبو هورەیرە ﵁ وتی: ناوی (بالسِّكِّينِ)م نەبیستبوو هەتا ئەو ڕۆژە، ئێمە پێمان دەگوت: (الْمُدْيَةَ)».



## السَّعَةُ لِلْحَاكِمِ فِي أَنْ يَقُولَ لِلشَّيْءِ الَّذِي لَا يَفْعَلُهُ: أَفْعَلُ لِيَسْتَبِينَ الْحَقُّ

### دروستە بۆ دادوەر شتێک بڵێت و ئەنجامیشی نەدات، بۆئەوەی حەق دەربکەوێت

٥٦٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «خَرَجَتِ امْرَأَتَانِ مَعَهُمَا صَبِيَّانِ لَهُمَا، فَعَدَا الذِّئْبُ عَلَى إِحْدَاهُمَا، فَأَخَذَ وَلَدَهَا فَأَصْبَحَتَا تَخْتَصِمَانِ فِي الصَّبِيِّ الْبَاقِي إِلَى دَاوُدَ ﵇، فَقَضَى بِهِ لِلْكُبْرَى مِنْهُمَا، فَمَرَّتَا عَلَى سُلَيْمَانَ ﵇، فَقَالَ: كَيْفَ أَمْرُكُمَا؟ فَقَصَّتَا عَلَيْهِ، فَقَالَ: ائْتُونِي بِالسِّكِّينِ أَشُقُّ الْغُلَامَ بَيْنَهُمَا، فَقَالَتِ الصُّغْرَى: أَتَشُقُّهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَتْ: لَا تَفْعَلْ، حَظِّي مِنْهُ لَهَا، قَالَ: هُوَ ابْنُكِ فَقَضَى بِهِ لَهَا».

ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «دوو ئافرەت دەرچوون دوو منداڵیان پێ بوو، گورگ هات و منداڵی یەکێکیانی برد، هەردووکیان لەسەر ئەو منداڵەی کە مابوو کێشەی خۆیان برد بۆ خزمەت پێغەمبەر داود علیه السلام، ئەویش منداڵەکەی دا بە ئافرەتە گەورەکەیان، پاشان تێپەڕین بەلای پێغەمبەر سولەیماندا علیه السلام، فەرمووی: چۆن فەرمانی پێ کردن؟ ئەوانیش بۆیان باس کرد، فەرمووی: چەقۆیەکم بۆ بێنن، منداڵەکە دەکەم بە دوو لەتەوە لە نێوانتاندا، ئافرەتە بچووکەکە گوتی: ئایا دەیکەی بە دوو لەتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتی: کاری وا مەکە، من بەشەکەی خۆم دەدەم بە ئەو، فەرمووی: ئەو منداڵە هی تۆیە، گەڕاندیەوە بۆی».

## نَقْضُ الْحَاكِمِ مَا يَحْكُمُ بِهِ غَيْرُهُ مِمَّنْ هُوَ مِثْلُهُ أَوْ أَجَلُّ مِنْهُ



## دادوەر بڕیاری دادوەرێکی دیکەی وەکوو خۆی یان لە خۆی گەورەتر هەڵدەوەشێنێتەوە

٥٦١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَرَجَتِ امْرَأَتَانِ مَعَهُمَا وَلَدَاهُمَا، فَأَخَذَ الذِّئْبُ أَحَدَهُمَا، فَاخْتَصَمَتَا فِي الْوَلَدِ إِلَى دَاوُدَ النَّبِيِّ عليه السلام، فَقَضَى بِهِ لِلْكُبْرَى مِنْهُمَا، فَمَرَّتَا عَلَى سُلَيْمَانَ عليه السلام، فَقَالَ: كَيْفَ قَضَى بَيْنَكُمَا؟ قَالَتْ: قَضَى بِهِ لِلْكُبْرَى، قَالَ سُلَيْمَانُ: أَقْطَعُهُ بِنِصْفَيْنِ لِهَذِهِ نِصْفٌ، وَلِهَذِهِ نِصْفٌ، قَالَتِ الْكُبْرَى: نَعَمْ، اقْطَعُوهُ، فَقَالَتِ الصُّغْرَى: لَا تَقْطَعْهُ، هُوَ وَلَدُهَا، فَقَضَى بِهِ لِلَّتِي أَبَتْ أَنْ يَقْطَعَهُ».

ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «دوو ئافرەت دەرچوون دوو منداڵیان پێ بوو، گورگ هات و منداڵی یەکێکیانی برد، هەردووکیان لەسەر ئەو منداڵەی کە مابوو کێشەی خۆیان برد بۆ خزمەت پێغەمبەر داود علیه السلام، ئەویش منداڵەکەی دا بە ئافرەتە گەورەکەیان، پاشان تێپەڕین بە لای پێغەمبەر

سولەیماندا ﷺ، فەرمووی: چۆن فەرمانی پێ کردن؟ گوتی: منداڵەکەی دا بە گەورەکە، سولەیمان فەرمووی: دەیکەم بە دوو لەتەوە نیوەی بۆ تۆ و نیوەی بۆ ئەو، ئافرەتە گەورەکە گوتی: باشە لەتی بکەن، بچووکەکە گوتی: لەتی مەکە، چونکە منداڵی ئەوە، سولەیمان منداڵەکەی دا بە ئەو ئافرەتەی کە داوای کرد نەبڕدرێتەوە».

## شَفَاعَةُ الْحَاكِمِ لِلْخُصُومِ قَبْلَ فَصْلِ الْحُكْمِ

## تکای دادوەر بۆ ناکۆکیکاران پێش ئەوەی بڕیارەکە یەکلا ببێتەوە

٥٦٢. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ زَوْجَ بَرِيرَةَ كَانَ عَبْدًا يُقَالُ لَهُ: مُغِيثٌ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ يَطُوفُ خَلْفَهَا يَبْكِي وَدُمُوعُهُ تَسِيلُ عَلَى لِحْيَتِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِلْعَبَّاسِ: «يَا عَبَّاسُ، أَلَا تَعْجَبْ مِنْ حُبِّ مُغِيثٍ بَرِيرَةَ، وَمِنْ بُغْضِ بَرِيرَةَ مُغِيثًا؟»، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ رَاجَعْتِيهِ، فَإِنَّهُ أَبُو وَلَدِكِ»، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَأْمُرُنِي؟ قَالَ: «إِنَّمَا أَنَا شَفِيعٌ»، قَالَتْ: فَلَا حَاجَةَ لِي فِيهِ.



ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوەکەی بەریرە کۆیلەیەک بوو پێی دەگوترا: موغیس، هەر وەکوو ئەوەی ئێستا تەماشای بکەم بینیم (دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر داوای ژنەکە لێکی جیا کردنەوە) بەدوایدا دەگریا و فرمێسک بە ڕیشیدا دەهاتە خوارەوە، پێغەمبەر ﷺ بە عەبباسی فەرموو: «ئەی عەبباس ئایا سەرت سووڕ نامێنێت لە خۆشەویستیی موغیس بۆ بەریرە و لە ڕقی بەریرە بۆ موغیس؟»، پێغەمبەر ﷺ بە بەریرەی فەرموو: «خۆزگە دەگەڕایتەوە بۆ لای، چونکە ئەو باوکی منداڵەکەتە»، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا فەرمانم پێ دەکەیت؟ فەرمووی: «بەڵکوو من تەنها تکاکارم»، ئەویش گوتی: من هیچ پێویستییەکم پێی نییە.

## مَا يَقْطَعُ الْقَضَاءُ

### ئەوەی بڕیار و ناکۆکی پێ یەکلا دەکرێتەوە

٥٦٣. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَلْحَنُ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فَإِنَّمَا أَقْضِي بَيْنَكُمَا عَلَى نَحْوِ مَا أَسْمَعُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ».

ئوم سەلەمە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئێوە ناکۆکییەکانتان دەهێنن بۆ لام، بێگومان منیش مرۆڤم، پێدەچێت هەندێکتان زمانی بۆ بەڵگەهێنانەوە بەهێزتر بێت لەوی دیکە، منیش دادوەری دەکەم لە نێوانتاندا بەپێی ئەوەی دەیبیستم، جا هەر کەس هەق و مافی براکەیم دا بە ئەو، ئەوا با وەرینەگرێت، چونکە بێگومان بەشێک لە ئاگری بۆ دەبڕم».



# كِتَابُ الاسْتِعَاذَةِ

## پەرتووکی پەناگرتن

٥٦٤. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قُلْ»، قُلْتُ: وَمَا أَقُولُ؟ قَالَ: «قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ»، فَقَرَأَهُنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «لَمْ يَتَعَوَّذِ النَّاسُ بِمِثْلِهِنَّ، أَوْ لَا يَتَعَوَّذُ النَّاسُ بِمِثْلِهِنَّ».



عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ پێمی فەرموو: «بڵێ»، گوتم: چی بڵێم؟ فەرمووی: «قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ»، پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندیانیەوە، پاشان فەرمووی: «هیچ کەسێک بە وێنەی ئەمانە پەنای نەگرتووە، یان خەڵکی بە وێنەی ئەمانە پەنا ناگرێت».

### الِاسْتِعَاذَةُ مِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ

### پەناگرتن لە دڵێک ترسی خوای تێدا نەبێت

٥٦٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ مِنْ أَرْبَعٍ: مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَدُعَاءٍ لَا يُسْمَعُ، وَنَفْسٍ لَا تَشْبَعُ.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت بە چوار شت: لە زانستێک سوود نەگەیەنێت، لە دڵێک نەترسێت (ترسی خوای تێدا نەبێت)، لە نزا و پاڕانەوەیەک وەڵام نەدرێتەوە، وە لە نەفسێک هەرگیز تێر نەبێت.

## الِاسْتِعَاذَةُ مِنَ الْبُخْلِ

## پەناگرتن لە ڕەزیلی

٥٦٦. عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ الْأَوْدِيِّ، قَالَ: كَانَ سَعْدٌ يُعَلِّمُ بَنِيهِ هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ، كَمَا يُعَلِّمُ الْمُعَلِّمُ الْغِلْمَانَ، وَيَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ بِهِنَّ دُبُرَ الصَّلَاةِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ».



عەمڕی کوڕی مەیموونی ئەودی دەڵێت: سەعد منداڵەکانی فێری ئەم وشانە دەکرد، هەر وەکوو چۆن مامۆستا منداڵ فێر دەکات، دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای پێ گرتوون لەدوای هەموو نوێژێک (دەیفەرموو): «خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە ڕەزیلی، وە پەنات پێ دەگرم لە ترسنۆکی، وە پەنات پێ دەگرم لەوەی بگەمە تەمەنێکی پیری و پەککەوتەیی کە توانای هیچم نەمێنێت، وە پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی دونیا، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای نێو گۆڕ».

## بَابُ الِاسْتِعَاذَةِ مِنَ الْمَغْرَمِ، وَالْمَأْثَمِ

## باسی پەناگرتن لە قەرزداری و گوناه و تاوان

٥٦٧. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَكْثَرَ مَا يَتَعَوَّذُ مِنَ الْمَغْرَمِ، وَالْمَأْثَمِ،

قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَكْثَرَ مَا تَتَعَوَّذُ مِنَ الْمَغْرَمِ، قَالَ: «إِنَّهُ مَنْ غَرِمَ حَدَّثَ، فَكَذَبَ وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ».

عائیشە ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پەنای دەگرت لە قەرزداری و گوناهـ. گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، زۆر پەنا دەگریت لە قەرزداری، فەرمووی: «بێگومان ئەو کەسەی قەرز دەکات قسە دەکات و درۆ دەکات، پەیمانیش دەدات و نایباتە سەر».

## الِاسْتِعَاذَةُ مِنْ شَرِّ الْبَصَرِ

## پەناگرتن لە شەڕ و خراپەی بینین

٥٦٨. عَنْ شَكَلِ بْنِ حُمَيْدٍ ﵁ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلِّمْنِي دُعَاءً أَنْتَفِعُ بِهِ، قَالَ: «قُلِ: اللَّهُمَّ عَافِنِي مِنْ شَرِّ سَمْعِي وَبَصَرِي، وَلِسَانِي وَقَلْبِي، وَمِنْ شَرِّ مَنِيِّي -يَعْنِي: ذَكَرَهُ-».

شەکەلی کوڕی حومەید ﵁ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، نزایەکم فێر بکە سوودم پێ بگەیەنێت، فەرمووی: «بڵێ: خوایە بمپارێزە لە شەڕ و خراپەی بیستن و بینینم، وە زمان و دڵم، وە لە شەڕی مەنییەکەم -واتە: ئەندامی نێرینەی-».

## الِاسْتِعَاذَةُ مِنَ الْعَجْزِ

## پەناگرتن لە بێتوانایی و دەستەوسانی

٥٦٩. عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﵁ قَالَ: لَا أُعَلِّمُكُمْ إِلَّا مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَالْهَرَمِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، اللَّهُمَّ

آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، وَعِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَدَعْوَةٍ لَا يُسْتَجَابُ لَهَا».

زەیدی کوڕی ئەرقەم ﵁ دەڵێت: فێرتان ناکەم ئەوە نەبێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردووین، دەیفەرموو: «خوایە من پەنات پێ دەگرم لە بێتوانایی و تەمبەڵی و ڕەزیلی و ترسنۆکی و پیری و پەککەوتەیی، وە لە سزای نێو گۆڕ، خوایەگیان تەقوا و خۆپارێزی ببەخشیت بە نەفسم، وە پاک و پاڵفتەی بکەرەوە، چونکە تۆ چاکترینی ئەوانەی کە نەفس و دەروون پاک دەکەنەوە، تۆ خاوەن و دروستکەری ئەو نەفسەی، خوایە من پەنات پێ دەگرم لە دڵێک ترسی تۆی تێدا نەبێت، لە نەفس و دەروونێکیش تێر نەبێت، لە زانستێکیش سوود نەگەیەنێت، هەروەها لە نزایەک وەرنەگیرێت».



## الِاسْتِعَاذَةُ مِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْقَبْرِ

## پەناگرتن لە شەڕ و فیتنەی نێو گۆڕ

٥٧٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَثِيرًا مَا يَدْعُو بِهَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ، وَعَذَابِ النَّارِ، وَفِتْنَةِ الْقَبْرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْفَقْرِ، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْغِنَى، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَأَنْقِ قَلْبِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا أَنْقَيْتَ الثَّوْبَ الْأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَبَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ، وَالْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم نزایانەی زۆر دەکرد: «خوایە من پەنات پێ دەگرم لە ئاژاوەی ئاگر و سزای ئاگر و فیتنەی نێو گۆڕ و سزای نێو گۆڕ و

شەڕ و خراپەی مەسیحی دەججال و خراپەی هەژاری و خراپەی دوڵەمەندی، خوای گەورە گوناهەکانم بشۆرەوە بە ئاو و بەفر و تەرزە و دڵم پاک بکەرەوە لە گوناهـ وەکوو چۆن پۆشاکی سپیت پاک کردۆتەوە لە چڵك و پیسی، نێوانی من و گوناهەکانم دوور بخەرەوە هەر وەکوو چۆن نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوات دوور خستۆتەوە، خوایە من پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی و پیری و پەککەوتەیی و تاوان و قەرزداری».

## الِاسْتِعَاذَةُ مِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ

### پەناگرتن لە نەفسێک تێر نەبێت

٥٧١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْأَرْبَعِ: مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لَا يُسْمَعُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «خوایە من پەنات پێ دەگرم لە چوار شت: لە زانستێک سوودی نەبێت، لە دڵێک نەترسێت، لە نەفسێک هەرگیز تێر نەبێت، لە نزا و پاڕانەوەیەک گوێی لێ نەگیرێت».

## الِاسْتِعَاذَةُ مِنَ الْجُوعِ

### پەناگرتن لە برسێتی

٥٧٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ، فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخِيَانَةِ، فَإِنَّهَا بِئْسَتِ الْبِطَانَةُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «خوایە من پەنات پێ دەگرم

لە برسێتی، چونکە خراپترین هاوەڵە (چونکە ڕێگریت لێ دەکات لە پەرستشەکان)، پەنات پێ دەگرم لە خیانەت و ناپاکی، چونکە خراپترین خەسڵەتی شاراوەیە».

## الِاسْتِعَاذَةُ مِنْ ضَلَعِ الدَّيْنِ

### پەناگرتن لە کەڵەکەبوونی قەرز و توانای نەدانەوەی

٥٧٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: «ئەی خوایە پەنات پێ دەگرم لە خەم و خەفەت و تەمبەڵی، وە لە ڕەزیلی و ترسنۆکی و کەڵەکەبوونی قەرزداری و لە زاڵبوونی دەسەڵاتدارە خراپەکان بەسەرماندا».

تێبینی:

(الْهَمِّ): ئەو ناخۆشییەیە کە گومان دەکرێت ڕوو بدات، بەڵام هێشتا ڕووی نەداوە.

(الْحَزَنِ): ئەو ناخۆشییەیە کە ڕووی داوە و شوێنەواری خەم و پەژارە لە دڵدا جێ دەهێڵێت.

## الِاسْتِعَاذَةُ مِنَ الْهَرَمِ

### پەناگرتن لە پیری

٥٧٤. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَدْعُو بِهَذِهِ الدَّعَوَاتِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ، وَالْهَرَمِ، وَالْجُبْنِ وَالْعَجْزِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ».

عوسمانی کوڕی ئەبولعاص ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نزای دەکرد بەم نزایانە: «خوایە من پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی و پیری و پەککەوتەیی و ترسنۆکی و بێتوانایی، وە لە شەڕ و خراپەی ژیان و مردن».

## الِاسْتِعَاذَةُ مِنْ دَرَكِ الشَّقَاءِ

## پەناگرتن لە عاقیبەتی خراپ بەهۆی گوناه و تاوان

٥٧٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَسْتَعِيذُ مِنْ سُوءِ الْقَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ، وَجَهْدِ الْبَلَاءِ.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت لە خراپیی بەڵا و ناڕەحەتی کە بەسەریدا بێت، وە لە دڵخۆشبوونی دوژمنان بەوەی بەڵا و موسیبەتی تووش بێت، وەلە عاقیبەتی خراپ بەهۆی گوناهەوە، یان هەموو هۆکارێک کە ببێتە مایەی لەناوچوون، وە لەو ناڕەحەتییانەی کە تووشی مرۆڤ دەبن کە لە توانایدا نییە چارەسەری بکات، (بەجۆرێک مردنی پێخۆشترە لەوەی لەسەر ئەو حاڵە بمێنێت، بۆ نموونە زۆری خێزان و نەبوونی بژێوی).



## الِاسْتِعَاذَةُ مِنَ الْجُنُونِ

## پەناگرتن لە شێتی

٥٧٦. عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُنُونِ، وَالْجُذَامِ، وَالْبَرَصِ، وَسَيِّئِ الْأَسْقَامِ».

ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: «خوایە من پەنات پێ دەگرم لە

شێتی و گەڕی و بەڵەکی و نەخۆشییە پیسەکان».

## الِاسْتِعَاذَةُ مِنْ عَيْنِ الْجَانِّ

### پەناگرتن لە چاوی جنۆکەکان

٥٧٧. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَيْنِ الْجَانِّ، وَعَيْنِ الْإِنْسِ، فَلَمَّا نَزَلَتِ الْمُعَوِّذَتَانِ أَخَذَ بِهِمَا، وَتَرَكَ مَا سِوَى ذَلِكَ.

ئەبو سەعید ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت بە خوا لە جنۆکەکان، وە لە چاوی مرۆڤەکان، کاتێك (الْمُعَوِّذَتَان) دابەزی (واتە: سوورەتی ناس و فەلەق)، کاری بەو دوو سوورەتە کرد و وازی هێنا لە غەیری ئەو دووانە.



## الِاسْتِعَاذَةُ مِنْ شَرِّ الْكِبَرِ

### پەناگرتن لە شەڕ و خراپەی پیری و پەککەوتەیی

٥٧٨. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَعَوَّذُ بِهَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ، كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ، وَالْهَرَمِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَسُوءِ الْكِبَرِ، وَفِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ».

ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت بەو وشانە و دەیفەرموو: «خوایە من پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی و پیری و ترسنۆکی و ڕەزیلی و خراپی پیری و پەککەوتەیی و فیتنەی دەججال و سزای نێو گۆڕ».

تێبینی:

ئەگەر (الْكِبَرَ) بە (فتح)ەی (الباء) بخوێندرێتەوە، ئەوە بە مانای پیری دێت، وە ئەگەر (الْكِبْرِ) بە (سكون)ەی (الباء) بخوێندرێتەوە، ئەوە بە مانای لووتبەرزی دێت.

## الِاسْتِعَاذَةُ مِنْ حَرِّ النَّارِ

### پەناگرتن لە گەرمی ئاگر

٥٧٩. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الْجَنَّةَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالَتِ الْجَنَّةُ: اللَّهُمَّ أَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَمَنْ اسْتَجَارَ مِنَ النَّارِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالَتِ النَّارُ: اللَّهُمَّ أَجِرْهُ مِنَ النَّارِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك سێ جار داوای بەهەشت بکات لە خوا، بەهەشت دەڵێت: خوایە بیخەرە بەهەشتەوە، هەر کەسێك سێ جار پەنا بگرێت لە ئاگر، ئاگر دەڵێت: خوایە بیپارێزە لە ئاگر».



# كِتَابُ الْأَشْرِبَةِ

## پەرتووکی خواردنەوەکان



### ذِكْرُ الشَّرَابِ الَّذِي أُهَرِيقَ بِتَحْرِيمِ الْخَمْرِ

### باسی ئەو خواردنەوەیەی کە بەهۆی قەدەغەکردنی مەیەوە ڕژێنرا

٥٨٠. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: بَيْنَا أَنَا قَائِمٌ، عَلَى الْحَيِّ وَأَنَا أَصْغَرُهُمْ سِنًّا عَلَى عُمُومَتِي، إِذْ جَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّهَا قَدْ حُرِّمَتِ الْخَمْرُ، وَأَنَا قَائِمٌ عَلَيْهِمْ أَسْقِيهِمْ مِنْ فَضِيخٍ لَهُمْ، فَقَالُوا: اكْفَأْهَا، فَكَفَأْتُهَا، فَقُلْتُ: لِأَنَسٍ مَا هُوَ؟ قَالَ: الْبُسْرُ، وَالتَّمْرُ.

ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێت: لە کاتێکدا من خزمەتم دەکرد لەنێو خەڵکێکدا، من بچووکترینیان بووم لەنێو مامەکانمدا، لەناکاو پیاوێک هات و گوتی: بەڕاستی مەی قەدەغە کرا، منیش شەڕابم بەسەریاندا دەگێڕا، گوتیان: بیڕێژە، منیش ڕشتم، بە ئەنەسم گوت: ئەو شەڕابە چی بوو؟ گوتی: شەڕابی خورما بوو.

تێبینی:

(الْبُسْر): خورمایەكە تەواو نەگەیوە.

(التَّمْر): خورمای وشكە دوای ئەوەی پێگەیشت وشك دەكرێتەوە، ئەو دوو جۆرە تێكەڵ بكرێت لەگەڵ ئاودا زووتر دەبێتە سەرخۆشكەر.

## إِثْبَاتُ اسْمِ الْخَمْرِ لِكُلِّ مُسْكِرٍ مِنَ الْأَشْرِبَةِ

### چەسپاندنی ناوی مەی بۆ هەر سەرخۆشكەرێك لە خواردنەوەكان

٥٨١. عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەموو سەرخۆشكەرێك قەدەغەیە، وە هەموو سەرخۆشكەرێك مەی و ئارەقە».

## تَحْرِيمُ كُلِّ شَرَابٍ أَسْكَرَ

### قەدەغەكردنی هەر خواردنەوەیەك كە مرۆڤ سەرخۆش بكات

٥٨٢. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ».

عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر شەڕابێك مرۆڤ سەرخۆش بكات ئەوە قەدەغەیە».

## تَحْرِيمُ كُلِّ شَرَابٍ أَسْكَرَ كَثِيرُهُ

### قەدەغەکردنی کەمێک لە هەر خواردنەوەیەک
### کە زۆرییەکەی مرۆڤ سەرخۆش بکات

٥٨٣. عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَنْهَاكُمْ عَنْ قَلِيلِ مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ».

عامری کوڕی سەعد لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ڕێگریتان لێ دەکەم لە کەم خواردنەوە لەو شەڕابەی کە زۆر خواردنەوە لێی سەرخۆشکەرە».

## مَنْزِلَةُ الْخَمْرِ

### پلەی ئارەق



٥٨٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ بِقَدَحَيْنِ مِنْ خَمْرٍ وَلَبَنٍ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمَا، فَأَخَذَ اللَّبَنَ، فَقَالَ لَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَاكَ لِلْفِطْرَةِ لَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی ئیسڕا و میعراجدا دوو قاپیان بۆی هێنا قاپێکیان ئارەقی تێدا بوو، ئەوی دیکەیان شیر، تەماشای هەردووکیانی کرد، شیرەکەی هەڵگرت، جیبریل پێی فەرموو: سوپاس و ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە هیدایەت و ڕێنمایی کردی بۆ پاکێتی و سروشت، ئەگەر ئارەقت هەڵبگرتایە ئەوە ئوممەتەکەت گومڕا دەبوو.

٥٨٥. عَنْ رَجُلٍ مَنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَشْرَبُ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي

الْخَمْرَ يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا».

پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «خەڵکانێک لە ئوممەتەکەم مەی و ئارەق دەخۆنەوە ناوی دیکەی لێ دەنێن».

## تَوْبَةُ شَارِبِ الْخَمْرِ

### تەوبەکردنی ئارەقخۆر

٥٨٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الدَّيْلَمِيِّ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ وَهُوَ فِي حَائِطٍ لَهُ بِالطَّائِفِ يُقَالُ لَهُ الْوَهْطُ، وَهُوَ مُخَاصِرٌ فَتًى مِنْ قُرَيْشٍ يُزَنُّ ذَلِكَ الْفَتَى بِشُرْبِ الْخَمْرِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ شَرْبَةً لَمْ تُقْبَلْ لَهُ تَوْبَةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، فَإِنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ، فَإِنْ عَادَ لَمْ تُقْبَلْ تَوْبَتُهُ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، فَإِنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ، فَإِنْ عَادَ كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ طِينَةِ الْخَبَالِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

عەبدوڵڵای کوڕی دەیلەمی دەڵێت: ڕۆیشتم بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص لەنێو باخچەیەکی خۆیدا بوو لە تائیف پێی دەگوترا (الْوَهْطُ)، دەستی گەنجێکی گرتبوو لە قوڕەیش تۆمەتبار دەکرا بە خواردنەوەی ئارەق، گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەس قومێک ئارەق بخواتەوە ئەوە چل ڕۆژ تەوبەی لێ وەرناگیرێت، ئەگەر تەوبەی کرد خوا تەوبەی لێ وەردەگرێت، ئەگەر دووبارەی کردەوە چل ڕۆژ تەوبەی لێ وەرناگیرێت، ئەگەر تەوبەی کرد خوا تەوبەی لێ وەردەگرێت، ئەگەر دووبارەی کردەوە ئەوە هەقە لەسەر خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا کێم و زوخاوی دۆزەخییەکانی دەرخوارد بدات».

## الرِّوَايَةُ فِي الْمُدْمِنِينَ فِي الْخَمْرِ

### ڕیوایەت لەسەر ئەوانەی بەردەوامن لەسەر خواردنەوەی مەی و ئارەق

٥٨٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنَّانٌ، وَلَا عَاقٌّ، وَلَا مُدْمِنُ خَمْرٍ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەو کەسەی زۆر منەت دەکات ناچێتە بەهەشتەوە، ئەو کەسەیشی دڵی دایک و باوکی دەئێشێنێت، ئەوەیشی بەردەوامە لەسەر خواردنەوەی ئارەق».

٥٨٨. عَنْ أَبِي جَمْرَةَ نَصْرٌ، قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: إِنَّ جَدَّةً لِي تَنْبِذُ نَبِيذًا فِي جَرٍّ أَشْرَبُهُ حُلْوًا، إِنْ أَكْثَرْتُ مِنْهُ، فَجَالَسْتُ الْقَوْمَ خَشِيتُ أَنْ أَفْتَضِحَ، فَقَالَ: قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ الْقَيْسِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مَرْحَبًا بِالْوَفْدِ، لَيْسَ بِالْخَزَايَا وَلَا النَّادِمِينَ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ الْمُشْرِكِينَ، وَإِنَّا لَا نَصِلُ إِلَيْكَ إِلَّا فِي أَشْهُرِ الْحُرُمِ، فَحَدِّثْنَا بِأَمْرٍ إِنْ عَمِلْنَا بِهِ دَخَلْنَا الْجَنَّةَ، وَنَدْعُو بِهِ مَنْ وَرَاءَنَا، قَالَ: «آمُرُكُمْ بِثَلَاثٍ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ، آمُرُكُمْ: بِالْإِيمَانِ بِاللَّهِ، وَهَلْ تَدْرُونَ مَا الْإِيمَانُ بِاللَّهِ؟»، قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَإِقَامُ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَأَنْ تُعْطُوا مِنَ الْمَغَانِمِ الْخُمُسَ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: عَمَّا يُنْبَذُ فِي الدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ».



ئەبو جەمرە (کە ناوی) نەصرە دەڵێت: بە ئیبن عەبباسم ﵄ گوت: داپیرەیەکم هەیە خواردنەوەیەک دەگرێتەوە لەنێو گۆزەدا، دەیخۆمەوە زۆر بەلەزەتە، ئەگەر زۆری لێ بخۆمەوە دەترسم لەنێو کۆڕ و مەجلیسدا تووشی نەنگی و ڕیسوایی ببم، گوتی: وەفدی عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەخێر بێن ئەم وەفدە هەرگیز ڕیسوا و پەشیمان نەبن»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا لە

نێوانی ئێمە و تۆدا هاوبەشدانەران هەیە، ئێمە ناتوانین بێین بۆ خزمەتت مەگەر لە مانگی حەڕامدا نەبێت، شتێکمان پێ بڵێ ئەگەر ئەنجامی بدەین بچینە بەهەشت و بانگەوازی دوای خۆمانیشی پێ بکەین، فەرمووی: «فەرمانتان پێ دەکەم بە سێ شت و ڕێگریتان لێ دەکەم لە چوار شت: فەرمانتان پێ دەکەم بە بڕواهێنان بە خوا، ئایا دەزانن بڕواهێنان بە خوا چییە؟»، گوتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی: «شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، ئەنجامدانی نوێژ و دەرکردنی زەکات، پێنجیەکی غەنیمەت و دەستکەوتەکانتان بدەن بە من، ڕێگریتان لێ دەکەم لە چوار شت: لەو خواردنەوانەی دەگیرێتەوە لەنێو کولەکە و قەدی دارخورمای هەڵکۆڵدراو و گۆزەی حەنتەم و قاپی بۆیەکراو بە زفت (کە چەند قاپێک بوو لەنێو عەرەبدا بەکاریان دەهێنا، لە دار دروست کرابوون، هەڵیاندەکۆڵی و بەکاریان دەهێنا بۆ جۆرەها خواردنەوە، ئەو قاپانە دەبوونە هۆکار و یارمەتیدەر بۆ ئەوەی ئەو خواردنەوانە زووتر ببنە سەرخۆشکەر)».



## ذِكْرُ الْأَخْبَارِ الَّتِي اعْتَلَّ بِهَا مَنْ أَبَاحَ شَرَابَ السُّكْرِ

### باسی ئەو فەرموودانەی کە عیللەتی تێدایە بۆ کەسێک ڕێگەی پێ درابێت بە خواردنەوەی مەی

٥٨٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭫ قَالَ: حُرِّمَتِ الْخَمْرُ قَلِيلُهَا وَكَثِيرُهَا، وَالسُّكْرُ مِنْ كُلِّ شَرَابٍ.

ئیبن عەبباس ﭫ دەڵێت: مەی و ئارەق قەدەغە کراوە زۆر بێت یان کەم، وە هەموو خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەریش.

## الْحَثُّ عَلَى تَرْكِ الشُّبُهَاتِ

### هاندان لەسەر وازهێنان لە شتە گوماناوییەکان

٥٩٠. عَنْ أَبِي الْحَوْرَاءِ السَّعْدِيِّ، قَالَ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ﵄: مَا حَفِظْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: حَفِظْتُ مِنْهُ: «دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لَا يَرِيبُكَ».

ئەبو حەوڕائی سەعدی دەڵێت: بە حەسەنی کوڕی عەلیم ﵄ گوت: چیت لەبەر کردووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ؟ گوتی: لەبەرم کردووە لە پێغەمبەرەوە: «واز بهێنە لەوەی کە گومانت لێیەتی، بڕۆ بۆ لای ئەوەی گومانت لێی نییە».





الحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات

# نێوەڕۆك